شيعر






# تا ماتەمی گوڵ...
# تا خوێنی فریشتە

بەختیار عەلی

کۆی بەرهەمە شیعرییەکان

١٩٨٢-٢٠٠٤



# تا ماتەمی کوڵ...
# تا خوێنی فریشتە





بەختیار عەلی


کۆی بەرهەمە شیعرییەکان

١٩٨٢ - ٢٠٠٤




ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن

بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: تا ماتەمی گوڵ... تا خوێنی فریشتە

ناوی نووسەر: بەختیار عەلی

بابەت: شیعر

نۆبەتی چاپ: سێیەم ٢٠١٤

چاپخانە: رجایی/ تاران

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نرخ: (١١٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (٢٢٢٨)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-955-1





ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم

www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com

http//www.facebook.com/Andeshacenter

07501026400

# پێرست

# نێچیر و تاریکی

سەیرکەن، کە گوڵ ڕەش دادێت، ساتی مردنی هاتووە
کە خونچە شەرمنەکانی دڵ دەوەرن
بەقەد ژمارەی پەڕەکانیان، زمان لە خوێن نزیکبۆتەوە
بازنەیەک بە ئەندازەی دووری نێوان دڵی خۆت و شەو، بەدەوری ئەم نێچیرەدا بکێشە، کە هیچ لە نزیکبوونەوەی کات تێناگات
هیچ بازنەیەک نابینێت چەقەکەی ژیان نەبێت
ئەو نێچیرەی چرکە بە چرکە شەو بە سەوزی لە درەختەکان دەکاتەوە.
لەنێو ملیۆنەها بازنەدا خەوتووە و دەڵێت: ژیان بەردێکە کەوتۆتە ئەم گۆمە تاریکەوە.

تۆ کە بە هێمنی تۆزی سەر گیانی شەو دەتەکێنیت
تەماشای بەرگی کتێبی ئەم بێدەنگییە قووڵە دەکەیت
دەترسیت خوێندنەوەی ئەم ئایەتانەی ناو دڵت دەنگی بێت
دەترسیت تەلای ئەم تێڕامانە لە خوێن گیا خەبەربکاتەوە
گیا کە دەڵێت: ئارام بە، سەوزی من لە ئاسمان بەرینترە
گیا کە نۆبەرەی خەیاڵەکانی خۆی خستۆتە سەر گیانی ئەم پیاوە

تۆ بۆنەوەی گیا خەبەرنەکەیتەوە، دەبێت نەنوویت. دەست بەسەر باڵی تەزیووی ئەم باڵندە بچوکانەدا بێنە (کە گومانت لێدەکەن)

**دەستبخەرە سەر لێوی ئەو ئەستێرانەی کە دەڵێن: تۆ کێیت؟**
**بپرسە نێچیرێکتان نەبینیوە، لە تاریکیدا ژیان فریودەدات؟**
**بپرسە ژیانێکتان نەبینیوە، لە تاریکیدا پەل بۆ غەزەل درێژدەکات؟**
**بڵێ: ئەم نێچیرە نامورادیی منە، دەلیلی ڕێگا کەسنەزانەکانی منە**
**ئەوە دەرگای بەیانییە شوومەکانی باغ دەزانێت**
**ئەوە کلیلی من... بۆ دۆزینەوەی ژیانە خەوتووەکانی ناو کێڵگە**
**ئەوە قوفڵی من... لەسەر پاشەکشێی ئێوارانی پەرەسێلکە**
**من ئێستا لە تاریکیدا، لەبن درەختێکدا خشتە بۆ جەنگەکانم دەکەم.**
**دەترسم خەنجەرەکانم بەم خوێنە ڕازینەبن**
**بڵێن: ئەم برینە، بۆنی نەفرەتی لێنایەت**
**دەستم بڵێت: پیسە داوەتی ئەم قوربانییە، کە تاریکی هێشتا حەلاڵی نەکردووە.**
**حەلاڵمکە ئەی شەو، خۆڵەمێشی ئەو ڕۆحەی، من نەیبەم، با دەیبات**
**حەلاڵمکە ئەی ئاو، هەڵمی ئەو جەستەیەی، من نەیچێژم، ئاسمان دەیچێژێت.**
**حەلاڵمکە لەزەتی تاڵی ئەو گیانەی، من نەینۆشم، لەیاددەچێتەوە**
**با ڕەوابێت قفڵی ئەم ژیانە ئارامە بشکێنم**
**با ڕەوابێت لە ساتی مردندا من و ئەو هەردووکمان بگرین،**
**من هاوار لە دوا نەعرەتەی مەرگ بکەم**
**دەست بە دوا پەرژینی ژیانەوە بگرێت**
**ئەو بڵێ: ئاخ... ئەی زیندەگی جوان**
**من بڵێم: ئاخ... ئەی خوماری مردن**
**ئەو بڵێ: هاوار... ئەی بەیانی هاوار**

**من بڵێم: هاوار... ئەی شەو هاوار**
**ئەو ئامێزم پیابکات و بڵێت: دەخیل، ئەی خوێن**
**من ماچیبکەم و بڵێم: دەخیل ئەی خەنجەر.**

# نومێد و پیاوکوژان

**چ ساردە، ئەم بیرکردنەوەیە لە تۆ، کە من لە دوا دەرگای پوچی هاتمەدەرێ و جگە لە سێوێکی تاڵ، هیچی دیکەم بە ستوونی ئەو درەختە ڕەشانەوە نەدی.**

**چ ئاگرە، ئەم خەیاڵە لە تۆ، کە تۆ لە یەکەم دەرگای خەونەوە هاتیتەدەرێ و جگە لە سەدەفێکی پڕ نومێد هیچی دیکەت لەو خاکانەوە نەهێنا.**
**ڕۆژگارێک پیرێک لەنێوان من و دونیادا دەوەستا و دەیگووت:**
**«باسی نومێدم بۆ مەکە، نومێد میتاڵێکە بەدەگمەن زرینگەی دێت»**

**منیش بە شارەکاندا دەگەڕام... دەمبیست**
**قومری هێندە بەتام باسی مردنی خۆی دەکرد**
**(من باوەڕم بە هیچ نەما).**
**دالیا هێند سەیر باسی خۆسووتانی خۆی دەکرد**
**(گووتم: با دەست لە خەیاڵات هەڵگرم)**

**پاساری بە جۆرێ دەیگووت: نەمکوژێت، نافڕم**
**(گووتم: ئیدی گوناهی من چییە ئەی خودا؟)**

**تۆ ئەی ئومێد، ئاوەکان تووشی دوودڵی دەکەیت**
**ئاخر تیشک خەو بە چ کەماڵێکی دیکەوە ببینێت؟**
**بە ئارەزووی چ سەفەرێک، لە دەرگای باغچە بچین بەودیودا؟**
**بە نیازی چ ئێوارەیەک، باڵەخانەی ئەم ڕۆژانە تێکدەین؟**
**بۆ چ دڵنەواییەک، ئەم هەموو زامە لە خۆمان زویرکەین؟**
**ئەی ئومێد واز لە هێمنی ئەم گەردونە بهێنە**
**واز لە ئەندازەی ئەم بازاڕانە و لە پێوانەی خەیاڵی ئەم گوڵانە بهێنە**
**دەست لە خۆڵەمێشی ئەم باغە مردوانە هەڵگرە**
**دەست لە یەخەی ئەم باغەوانە خەوتووە هەڵگرە**
**بۆ هیچ پشوویەکی کورت و درێژ، پرگاڵی ئەم بازنەیەمان مەشکێنە.**
**تۆ هاتی شەهوەتی ئەم شەوانەمان شێوا و فڕین ئێمەی کوشت**
**گەر تۆ نەبی ئەم پشووە درێژانەی دەریا... بۆ؟**
**پرسیاری ئەم کونەپەپوە پیرانە، لەم سێوە کاڵەی ژیان... بۆ؟**
**ئەی ئومێد... دەست لە خورافەتەکانمان هەڵگرە**
**بە گوڵ تۆڵەی ئەم نائومێدییەمان لێمەکەرەوە**
**بە گیا گوناهی ئەم زەمهەریرەمان لێمەستێنە.**

# پیاوکوژەکان بۆ تەنهان؟

**چونکە کوشتن سێوێکە لەگەڵ کەسدا بەش ناکرێت**
**چونکە پیاوکوژان بەبێ تەنهایی، بێزاری ئەستێرەیان لێ دیار نییە**
**هەموو هاوڕێیەک خوێنی نێچیرەکان حەرامتردەکات**
**هەموو دۆستێک نەورەسێک زیاتر دەتۆرێنێت**

هەموو دەستگیرانێک پشکۆیەک زیاتر دەکوژێنێتەوە
پیاوکوژەکان تەنهان
چونکە تەنیا پیاوانی تەنها دەرەقەتی گوڵەباغ دێن
بە شیری ناو ئەم پیاڵەی خودایە دەوێرن
بە بۆنی ئەم فرۆیەی خەیاڵ نامرن
تەنیا پیاوانی تەنها خۆرهەڵاتی گوڵاڵە دەبینن
تەنیا مەلەوانی تەنها چاویان لە باکووری ئاوە
تەنیا خوێنەوانی تەنها باشووری ڕۆحیان لێدیارە
هەر ئەوان:
گوڵاوی شەوی ئاشتبوونەوەی کوکوختی و مانگ بۆندەکەن
عەتری خاڵیبوونەوەی خەنجەر لە گومان
عەتری پڕبوونی چەقۆ لە ئەفسوس
بۆنی زیادبوونی دڵنیایی نیچیرەکان
دەڵێن:
کوشتن، بەربوونەوەی شوشەیەکە لە دەستی ساقییەک
بەربوونەوەی بەهارە لە دەستی درەختەکان.

# بەر لە کوشتن

بەر لەوەی بمکوژێت پرسی:
تۆ سەر بە چ نەتەوەیەکیت؟
نەتەوەی گوڵ یان میللەتی درەختەکان
تۆ لە قوماشی زەردەخەنەیت یان لە لۆکەی گریان؟

**دەیپرسی:**
**ماڵتان لەنزیک باغچە هەڵواسراوەکانی کاتەوە بووە**
**یان لەنزیک چرکە بێدەنگەکانی خۆکوشتنی گوڵ؟**
**ماڵتان لەسەر سوچی هەناسەی مێخەکدا بوو**
**یان لە کۆڵانی بنبەستی تێرامانی نێرگز؟**

**دەیپرسی:**
**بە چەند هەنگاو لە ئاونگ دەگەیشتیتە شەقامی دڵنیایی؟**
**بە چەند چرکە لە شەونم دەگەیشتیتە بازاڕی پەروانەکان؟**

**سەیریدەکردم و دەیگووت:**
**تۆ لە پۆلە ئەسمەرەکانی گەنم نەبوویت؟**
**لە قوتابخانەی ژمارە خوداییەکانی گێلاس**
**هاوڕێیەکت نەبوو، غەیبی گوڵەباغی دەخوێندەوە؟**
**دۆستێکت نەبوو، بەختی بۆ هەنار دەگرتەوە؟**
**من تۆم لە شەقامی بەختیارییە درۆکاندا بینیوە**
**دەستی تۆم لە دەستی پڕ لە خرخاڵی بەیانیدا بینیوە**
**بە خەونەکانتدا دیارە بەسەر هەموو خاکەکاندا تێپەڕیوویت**
**ئەم هەموو شوشە شکاوەی ژوورەکەت، بەڵگەی ژوانە لەگەڵ شەودا**
**ئەم هەموو شیلانە وەریوەی حەوشەکەت، بەڵگەی پەلکووتانە بە موتڵەقدا.**
**تۆ لەسەر فرمێسکەکانت نوسراوە:**
**بەڕێکەوت، ئێوارێیەک دەگەیتە بەر دەرگای مەحشەرەکان. لەوێ یەکێک بەرلەوەی بتکوژێت، لێتدەپرسێت: تۆ سەر بە چ خێزانێکیت، خێزانی با یان خێزانی لافاوەکان؟ سەر بە چ نەتەوەیەکی، نەتەوەی گوڵ یان نەتەوەی پەروانەکان؟**

# پاڕانەوەی یەکەم

ئەی خودایە
بمدەرێ زنجیری ئاو
بمدەرێ قفڵی هەرمێ
بمدەرێ کلیلی ڕۆحی ئەی
بمدەرێ شفرەی هەتاو

ئەی خودایە.
مەیوەرێنە گومانی من بۆ سەر بەهار
مەیڕوخێنە منارەی من، لە کوچەی یارانی کوژراو
مەیشکێنە ئاوێنەی شەو، ئاوێنەی با، ئاوێنەی ئاو

ئەی خودایە.
بمدەرێ دەستی تیشک
بمدەرێ نەسرینی تار
بمدەرێ ماڵێ لەسەر شەقامی مانگەشەو
بمدەرێ شەوی ناو دەنکێ هەنار

ئەی خودا.
سەوزێکە مانگی دیکە لەسەر ئەم مەحشەری گیایە
سەوزێکە هەوری دیکە لە سەر ئەم زوڵمەتەی ناو ناخ

سەوزێکە ئەستێرەی دیکە لەسەر ئەم مەستییەی بولبول
سەوزێکە خۆری دیکە لەسەر ئەم تەرمەی گوڵەباغ
سەوزێکە... پڕێکە لە دەریا... پڕێکە لە نور ئەم خوێنە
سەوزێکە... پڕێکە لە شەو... پڕێکە لە بەهار ئەم مەرگە
سەوزێکە لۆکەی تر بەدەم ئەم هەموو زامەوە
سەوزێکە زەوی تر بەدەم ئەم هەموو کێڵگەی ترسەوە
سەوزێکە باڵی تر بەدەم فڕینی ئەم کۆترەوە
بیچێنە ئەلفبای دیکە بۆ شیعری ئەودیو دنیای مەرگ
بیچێنە ژمارەی گەورەتر بۆ حیسابی ڕۆژانی ئەودیو مەرگ
بیهێنە دەفتەری بچوکتر بۆ باسی مەراقی جیهانی ئەودیو مەرگ.

# کۆرسی خەنجەر

## ڕۆژی یەکەم:

ڕۆژی یەکەم هەموو قوتابییەکی تازە لە پۆلی خەنجەردا دەگری.
هەموو شاگردێکی نوێ دەڵێت: بەم تەباشیری خوێنە چی بنوسم؟

ڕۆژی یەکەم بەرلەوەی خوو بەم مامۆستا ڕوخۆشەوە بگرین (کە بۆنی جەنگی لێدێت لەگەڵ کۆتردا)، بیرمان لە زیندووکردنەوەی پەیمانەکانی نێوان ئێمە و ژیان دەکردەوە. بیرمان لە ڕێکەوتنی تازە دەکردەوە لەگەڵ ئاگردا. ڕێکەوتنێک پۆلەکانمان پڕبکات لە فێنکی تەبایی، لە گوڵاویی پەیڤین، لە عەنبەری یەکدی دوان.

ڕۆژی یەکەم، هێشتا خەیاڵمان لای مەرهەم بوو، دەمانگووت: نرخی دەرمان لە ئەجزاخانەی سروشتدا هەرزانترە.

بە ڕەچەتەیەک لە ئەرخەوان، شوشەیەک ئەوینی پاک لەم گوڵستانە چاوشینە دەکڕین. بۆ بچوکترین زامی سەر پێستی ڕۆح، پەرداخێک لە سۆز لەم کانییە ڕووپاکە دەخۆینەوە. دەیانگووت: تێکەڵکردنی بۆنی ترێ لەگەڵ هەناسەی نارنجدا، بۆ خەمی خۆشەویستی باشە. دوای نوستن لەگەڵ یاردا، شەماڵی هەر شەقامێک خەمڕەوێنە.

ئەی خودایە، چەند سەیربوو
ڕۆژی یەکەم هێشتا خەیاڵمان لای مەرهەم بوو.
ڕۆژی یەکەم، بیرمان لە تەمەنی وەرز و ساڵ و سەدەکان دەکردەوە
دەمانگووت: ڕۆژێک گەر چرکەکانی وەکو تۆو بچێنین، چەند هەفتەی بێخەروارمان بۆ دەگریت؟ ساڵێک گەر هەموو سەعاتەکانی بکێڵین، تەمەنی پەپوولە چەند زیاددەکات؟

سەدەیەک گەر بە هێمنی ئاویدەین، قاقای منداڵێک چەند درێژدەبێتەوە؟
ئەی خودایە، چەند سەیربوو
ڕۆژی یەکەم هێشتا خەیاڵمان لای تەمەنی گوڵەکان بوو.

ڕۆژی یەکەم
بیرمان لە گەورەیی کۆشک و ماڵ و ژوورەکان دەکردەوە. دەمانگووت: گەر کێڵگەیەک بە هەندێ ئەفسانە سەوزکەین، چەند سەدای ئەم بولبولە

دوورتر دەڕوات؟ گەر کۆشکێک بە هەندێ ژوور لە سەراب گەورەترکەین، ئەم لقە سەوزانە، کڵاوی چەند بەڕووی دیکە دەگرن؟ گەر ئەم پەنجەرانە بە ئەندازەی لەیەکترازانی نازکی دوو عاشق لەکاتی نوستندا، واڵاترکەین، زایەڵەی ئەم پیانۆیە چەند قووڵتر دەچێتە ناو جەستەی باغەوە؟
ئەی خودایە، چەند سەیربوو
ڕۆژی یەکەم هێشتا خەیاڵمان لای بولبول بوو.

## ڕۆژی دووهەم:

قەتییەکی بچکۆلە لەبەر پەنجەرەکانی پۆلدا بە خوێنەوە نیشتەوە و گووتی: ماڵاوا ئەی درۆی تاریکی ژیان. دەمەشێرێکی چکۆلە لە ئینجانەکانی پۆلدا مرد و بە تەوسەوە پرسی: ئەم خەوە کورتە بوو ژیان؟ لای نیوەڕۆ هەورێک بەسەرماندا تێپەڕی و گووتی: ئەها... ئەها... ئەی گەمژەکان، ئێوەن قارەمانەکانی ژیان؟ بایەک ڕاوەستا و گووتی: تف لە تۆ، تف لە تۆ، ئەی بێشەرمترین بێشەرمەف، ئەی ژیان. نزیک شێوان، بەزمگێڕێک گووتی: ئەم بێدەنگییە ڕەشە بوو، ئاوازە جوانەکانی ژیان؟ بەر لە خۆرئاوابوون، نوێژکەرێک وەستا و پرسی: خودایە... خودایە، ئەم سوژدە بێتامە بوو، ژیان؟ کۆترەکان پرسییان: ئەرێ ئەم شەکەتبوونە بێحیکمەتە بوو فڕینی بەرزی ژیان؟ پاسارییەکیش بە دڵنیاییەوە گووتی: بەڵێ، ئەم ئێستگە چەپەک و دوور و لاتەریکە بوو، ماڵی ژیان.

ڕۆژی دووهەم
ناو لە گیرفانەکانیدا، باغێک لە گوڵی مردووی دەرهێنا و گووتی: تا سبەینێ پەڕەپەڕە پەژموردەیی ئەم باغە لەبەرکەن. سەراب بە خوماری

هەموو تلیاکەکانی ناو خوێنییەوە، گووتی: بەیانی بیردۆزی ئەم مەستییە دەخوێنین. شەو بە تەباشیرە سپییەکانی قیامەتەوە، پێیگووتین: سبەینێ تاقیکردنەوەتان لە گیانکێشاندا هەیە. ئاگر بە گومانی بڵێسەکانییەوە گووتی: من پرسیارتان لە مردنی ئاونگدا بۆدەهێنمەوە.
ڕۆژی دووهەم، فێربووین
هەمووی دوودڵی مرۆڤە، پرسەی ئەم لالەزارە
هەمووی پرسیاری پوچە، لاوانەوەی ئەم یەڵدایە
هەمووی خوێنی کۆترە، ماچی ئەم دڵدارییە
هەمووی برینی قومرییە، قاقای ئەم منداڵە.

## ڕۆژی سێهەم:

یەکێ ڕەشنوسی خوێنینی خۆی وونکردبوو
یەکێ لاپەڕەی فرمێسکەکانی بەهار دەفتەری بوو
یەکێ زمانی بڕاوی بولبولی دەرهێنا
یەکێ دڵی خوێنینی عەنقایەک قەڵەمی بوو.
لە شانۆگەرییەکدا، یەکێ لەشی هەموو برینی باغچە بوو، ڕۆڵی گوڵێکی دەبینی لە بەشی نوقمبووی بەهاردا. یەکێ دەنگی هەناسەی، هەوای مردنی کەمانچە بوو، دەیگووت: ئەز مۆسیقارم لە کفنی شکۆفەدا. یەکێ هاواری، هاواری خنکانی پیانۆ بوو، ڕۆڵی دەریاناسێکی دەبینی لە کەشتی حەقیقەتدا. ئەکتەرێک خودای سەربڕی و بە خوێنی ئەو ناوی نەخوێندراوەی تێکستەکانی نوسی. شاعیرێک بە مەرگی عەندەلیب، غەزەلی بۆ غونچە ڕازاندەوە. دەرهێنەرێک، قەلەندەرێکی سووتان و ناڵەی ئەوی بەسەر پشکۆکاندا بەشکرد.

**ئەی خودایە، ڕۆژی سێهەم**
**دارشتنمان لەسەر سۆزی خەنجەر نوسی.**

# هەوڵدانێک بۆ پێناسەکردنی «کوشتن»

**کوشتن، بێدەنگی شەوانەی کۆڵانی ئێمە بوو**
**بێدەنگی پاتۆنیای دراوسێ خەوتووەکانی ئەودیومان**
**کوژانەوەی چرای ئەو پیاوە بوو، کە بەدیار کوژانەوەی چرای پیاوانی دیکەوە وەستابوو**
**ڕاچڵەکانی کونە پەپوی حەوشەکەمان بوو، لە دەنگی کامڵبوونی هەنار**
**ڕاچڵەکانی ملوانکەی خوشکەکانمان بوو، لە ترسی خوێنی سینە**
**ڕابوونی دەستی براکانمان بوو، لە دەنگی پێکەنینی خەنجەر**
**کوشتن، دیواری چکۆلانەی نێوان من و ئەم کێڵگە دوورە بوو**
**هەڵنووتانی منداڵێکی گەڕەک بوو، لە زەنگێکی گەورە. ڕێوێڵکردنی فریشتەی کوچەکەمان بوو، بۆ خراپخانەیەکی دوور.**
**گرێدانەوەی لەدایکبوونی ساوایەکی هاوسێ بوو بە مەحشەرەوە**
**پاککردنەوەی هەندێ ژوور بوو لە کۆشکی پڕ لە تەمی ژیان. کورتکردنەوەی ڕێگای پرسیار بوو هەتا گەیشتن بە دەریا. ئاماژەکردنی کۆڵانی ئێمە بوو، بۆ خوێنی ئینجانەکانی خۆی. هەڵمژینی هێلانەی ئێمە بوو، بۆ هەناسەی کۆترە خنکاوەکانی خۆی.**

# لە دەفتەری چێژەکانی پیاوکوژدا

**لێگەڕێن با تامی ژمارەکان بکەم**
**لێگەڕێن با بە یەک بە یەکی خوێنی ئەم پیاوە جوانانە خۆم ڕەنگبکەم**
**(من ساڵێک هێندە نێچیرم هەبوو، گووتم: حیسابی ژمارەی دەستکەوتەکانی ئەم وەرزە بێمانایە).**

**لێگەڕێن دوو بە دوو لە چیرۆکی ئەم عاشقانە تێبگەم**
**(من لەم باغەدا، هێندە عاشقم بینی**
**گووتم: ئیدی دیارە، عەشق بۆتە منداڵبازاڕ).**

**لێگەڕێن سێ بە سێی ئەم هێلانەیە بپێوم**
**(من ئەوکات هێندە هێلانەم بینی،**
**پرسیم: خودایە، وەرزێکی دی، ئەم هەموو باڵندەیە چی لێبکەین؟).**

**لێگەڕێن چوار بە چواری ئەم چوارگۆشەی یەقینە بپێچمەوە**
**(ئەو هەفتەیە، هێندە ئیماندارم ژمارد،**
**ڕام وابوو: کەمێک لە کوفر بۆ یادگار هەڵگرم).**

**لێگەڕێن پێنج بە پێنجی ئەم وازییە بشکێنم**
**(ئەو وەرزە هێندە گەمەی وەک یەکم دی، پرسیم:**
**دیارە ئەمساڵ، زێڕی ئەم خەڵاتە بۆ کەس نییە؟).**

لێگەڕێن شەش بە شەشی ئەم مۆرەیە هەڵدەم
(ئەو ڕۆژە هێندە دوشەش بۆ باغچە هات، گووتم:
بەم نگینە شکاوەوە، من چیدی یاری لەگەڵ گوڵ ناکەم).

لێگەڕێن بە حەوت بە حەوتی ئەم ئاسمانەدا سەرکەوم
(ئەو مانگە هێندە فریشتە کەوتنەخوار، هاوارمکرد:
خوایە، بۆ ئەم باڵەخانە کۆنە، پلیکانەیەکی نییە)؟

# لێگەڕێن با چێژی ڕەنگەکان بکەم

## من و سوور

تۆ ئەی ڕەنگی سفرەی داوەتی یەکەمین یار، ڕەنگی بیرکردنەوەی هاوڕێ شەرمنەکانی زیندان، ڕاچڵەکانی زام لەگەڵ هەموو ئێوارێیەکدا، کاتێ خوێنی خۆمان لەسەر شۆستەکان جێدەهێشت، چونکە پێویستیمان بە ئەفسانەی زۆر بوو، پێویستیمان بە مەرەکەب بوو، بۆ حیکایەتخوانە نەبینراوەکانی شەوەزەنگ. کاتێ مێژوونووسە ڕیاکارەکان لە زەنگیانەدا و دەیانگووت: سەیرکەن، حەقیقەتمان پێیە، بەڵام پێنووسمان پێ نییە. کاتێ وێنەکێشە چکۆلە درۆزنەکان دەیانگووت: نیگارمان زۆر پێیە و ڕەنگمان لێبڕاوە. بەختەوەریش لە زامە کۆنەکانیدا دەگەڕا، دەیبینی ڕەنگی هیچ برینێکی خۆی ناناسێت. گەردەلوول بە دۆسییەی زستانە کۆنەکانیدا دەگەڕا و دەیبینی، ناوی منداڵەکانی خۆی لای هیچ ئاسمانێک تۆمارنەکردووە. هەنار نامەی دەنارد: ڕەنگی من مەدزن و ناوی داڵ و باز و سیمرغەکانی

پێبنوسن، ڕەنگی من مەدزن و فاڵی ئەم منداڵەی پێبگرنەوە، کە کەس نازانێت وەچەی چ شارێکی شوومە. شاعیرەکان دەهاتن و دەیانگووت: ئەی هەنار، گەر سووری دڵی تۆمان هەبایە، ئێستا دیوانی گەورەمان دەبوو. پیاوێک دەهات (نەناس) دونیای هەموو بە سپی دەبینی، لەسەر گیانی سپی گیاکان، نیگاری دەکێشا، دەیانگووت: گەر من ڕەنگم بناسییایە، تابلۆی گەلێک کەشتی سەیر لەسەرمدایە. ژنێک دەهات (نەناس) ئاوی هەموو لێڵ دەبینی، لەسەر کانییەکانی شەرەفی خۆی بە توڕەییەوە (بەرۆکی خۆی دادەدڕی) و دەیگووت: گەر بمتوانیبایە ڕووبەڕوو سەیری خوێن بکەم، تۆڵەی گەلێک سەیرم پێیە. حوجرەدارێکی پیر کە دونیای وەکو ئایەتەکان تەفسیردەکرد، شەوی بە سورەت دەشوبهاند، شەهوەتی مێخەکی بە چیرۆکی ئەسحابەکان ڕاڤەدەکرد، دەیگووت: گەر دەریایەکی سوورم هەبایە، خەیاڵی دەوڵەتگەلێکی سەیرم هەیە. شاتوو ئەو مێوە بەنازە، کە هەر زۆر کەم قسەدەکات، دەیگووت: سووری من کامڵبوونی هۆشیاری منە بە نهێنییەکانی ئەم گەردونە، سووری من خەمی منە بۆ مردنی ئەم سێوەی دراوسێم. نەفسەرێک دەهات (نەناس)، دونیای بە بێڕەنگ دەبینی، دەیگووت: ئاڵاکانی وڵات بکەن بە سوور. پۆستەچییەک شەو هەموو نامەکانی خوێناوی دەکرد، بەیانی دەیگووت: ئەمشەو لە پۆستەخانە هەرچی حەرفە کوژراوە. نوسەرێک چیرۆکێکی پڕ لە فیشاڵی خۆی سووردەکرد، بەیانی هاواریدەکرد: پاڵەوانەکانیان شەهیدکردم. کچان و دایکان بە هاتوهاواری درۆوە دەکەوتنە سەر شەقامەکان، دەیانگووت: زۆرداران، شەرەفی ئێمەیان ئەتککرد. سەرهەنگێکی پیر (بە کەڵبە سپییە پاکەکانییەوە) لەسەر مێزی قومار دەیپرسی: بە پارەی وا خوێناوی دەتوانم کایەیەک بکەمەوە؟ قومارچییەکان لەبەردەم خراپخانەکاندا دەیانگووت: دوێنێ شەو، لە شەڕەدەنووکی نێوان باڵندەکان، سەرتاپامان بۆتە زام، دەتوانین بە خوێنی ئەم هەموو مەلەوە بێینە ژووری؟ فریشتەیەک بۆ

مۆڵەت دەچوو بۆ لای یەزدان، خودا دەیگووت: عەجەب، کچم تۆ ئاوا حەزت بە خوێنە، من پێموابوو فریشتەکان وەک من حەزیان لە خوێن نییە.

من دەمزانی، شەوە نارنجییەکان... بەیانییە پرتەقاڵییەکان... نیوەڕۆ ئەرخەوانییەکانی سەرسوڕمان، چەندە شەیدای سوورێتی ئێوارانن. دەمبیست سێوە کاڵەکانی حوزەیران دەڵێن: ئەی خودا، ئێمە بۆ وەک سێوەکانی ئەیلول سوور نین؟ شەوان دەمبیست، بەفر دەپرسێت: من بۆ سپیم؟ منداڵە قژزەردەکانی هەتاو دەڵێن: زەردی شادرۆی هەموو پوچییەکانی جوانییە. من ئیدی تۆم حەلاڵدەکرد، من ئیدی بۆ تۆ دەژیام. ئەی ڕەنگی خەوی میوەهات. ئەی ڕەنگی ئومێدی شەفەق. ئەی ڕەنگی شوێن. ئەی ڕەنگی کات.

## سپێتیم چۆن ناسی؟

منداڵ بووم، کۆترەکان گووتیان: با سپێتیت بۆ بێنین، بە بەرتەقای دەریا. دەتوانیت بەشیکەیت بەسەر باڵندەکانی دیکەدا، بەشیکەیت بەسەر سینەی ئەو بولبولانەدا کە دەیانناسیت.
منداڵ بووم هێلانەیەک سووتا پڕبوو لە نهێنی سپی. کەشتییەک هات، بەرلەوەی لەنگەر بگرێت، سپێتی زەمانە دوورەکانی فڕێدایە ئاوەوە. دەریاوانەکان بە گۆچانە سپییەکانیانەوە هاتنە شار. یەکێکیان گووتی: سپێتی سافبوونی یادگارەکانی منە لە جوانی. سپێتی زەمەنی ڕاستەقینەی ئەم سەرەتایەیە کە هیچ سەرەتایەک بە ڕۆژێک لە خۆی نازانێت، زەمەنی سافکردنی گوڵە بۆ قەرزەکانی خۆی لەگەڵ شەودا، ڕۆژی پەشیمانی

یاقووتە لە منەتی هەموو تیشکەکان.
ئەو گووتی: باجی سپێتی هێندە زۆرە بە کەس نادرێتەوە.

هەرزەکار بووم، سپێتیم بۆ شەوێک لە پەمووەکان قەرزکرد کە دەبایە جارێک لە زامم تێبگەن، سپێتیم بۆ خوێنی عەشقێک لە لۆکە خواست، ئەیگووت: بەم مەرهەمە زامی وا چۆن سارێژدەبێت؟

هەرزەکاربووم، کۆترێک کوژرا و سپێتی ڕژا بەسەر بازاڕی میوەکاندا، سپێتی ڕژا بەسەر گومەزی مزگەوتەکاندا، شەپۆلێک کوژرا و لەبەر کفنە سپییەکانی کەس نەیناسییەوە.

ڕۆژێک، پڵنگەوانێکی مەست لە ناوەڕاستی وەرزەکانماندا دەرکەوت، دەیگووت: لەبەر پارچەی خودای شکاو، ئیمانی خۆم نابینم. لەبەر لەتی مەعشوقەکان، دڵی خۆم بۆ نادۆزرێتەوە، لەبەر ئەم هەموو مانگە درۆیەی خۆم، ئاسمانم لێدیار نییە.
وای سپێتی چۆن کوێریکردم.

منداڵ بووم دوکەڵی سووتانی ئیمپراتۆرەکانی کوچەم هەڵمژی، لە تیپی سپی منداڵە ڕۆحسووکەکان دەرکرام، چووم بەرەو هاڵاوی سپی دەریا پێشەرەفە دوورەکان.

ڕۆژێک، کانییەک بەسەر سەرمدا ڕووخا هەمووی تەلیسم بوو، لە دەغڵێکدا وەسێتی باڵندەیەکم دۆزییەوە لەسەر خەزنە سپییەکان، لە مەرەزەیەکدا خەیاڵی پڕ لە ئاوی بەیانییەکم دۆزییەوە، سەر بە هەفتەی مردنی ڕەنگەکان.

ڕۆژێکیش شارەکان مردن و جگە لە سپێتی هیچی دیکەیان جێنەهێشت. هەرکەسێک لە دەریا دوورەکانەوە دەهات، من دەستم دەخستە بەر گیانی، جگە لە خۆڵی دوورگە سپییەکان هیچی دیم دەستنەکەوت. باڵندەکان دەگەڕانەوە و قسەیان لەسەر دیواری سپی، نیشتنەوەی سپی و هێلانەی سپی دەکرد. کۆتر لە شۆڕشی سپی و لە جەنگی سپییەوە ئاڵابوو. من ویستم چنگێک سپێتی لە غولامێکی نەخۆش بکڕم، ئەو دەیگووت: نا، بەبێ ئەم ڕەنگە من ناگەمە سفیدستان.

جەنگەڵێک هەبوو، سپێتی نەدەفرۆشت، من دەرگاکانیم شکاند.
من ساڵەهای ساڵ لە گیانی سپێتیدا گەڕام
لە تورەیی سپیدا دەستی خۆم بڕی
لە ئارەزووی سپیدا لەشی خۆم هەلاهەلاکرد
بەڵام بڕوانە، بڕوانە تەنیا غوباری سپیم هێنایەوە
تەنیا ئەستێرەی سپیم دەستکەوت. تەنیا تۆوی سپیم وەشاند. تەنیا نێرگسی سپیم دەسککرد و تەنیا هێلانەی سپیم دۆزییەوە.

## پاڕانەوەی دووهەم

ئەی خودایە
بە کۆتر بڵێ بمبورێت
با گەردنم ئازاکات ئەو.
عەفوومکەن هەور و ئەستێرە

**عەفوومکەن خۆر و مانگەشەو.**

**ئەی خودایە**
**با دەرچم لە جوانی و لە دەریا**
**با دەرچم لە پەپوولە و خەیاڵ**
**با دەرچم لە غەمی حەقیقەت**
**با بگەم بە شکۆفەی مەحاڵ.**

**ئەی خودایە**
**بمبورن ئەوەی لێیان بووم**
**بمبورن ئەوەی لە من بوون**
**بمبورن ئەوەی لێیان چووم**
**بمبورن ئەوەی لە من چوون.**

## ستایش

**من بەپیر جوانییەکانی خۆمەوە دەچم. گەر هەرکەس بەپیر جوانی خۆیەوە بچووبایە، بەهار ئەم هەموو نازەی بەسەر ئێمەدا نەدەکرد. من بەپیر هەوای پڕ لە سرودی ڕۆژە تەماوییەکانی شکۆفەی خۆمەوە دەچم، کە گەورەیی من، وەکو گەورەیی منداڵێک بەگوڵوانکە و دەسترازە داپۆشرابوو.**

ئاە، گەر هێندە باستان لە ڕاستی نەکردبایە،
درۆکانی ئەم منداڵییە بە چی وا گەورە دەبوون؟

من دەمگووت: بژی ژیانی من لەگەڵ بوکەشوشەکانمدا
بڕوخێ تەمەنی من لەگەڵ ئێوەدا
بژی بێکاری، برسێتی و دیلێتی من لەگەڵ خۆمدا
بڕوخێ نان و کار و ئازادی من لەگەڵ ئێوەدا.
بـژی تـۆ (ئـەی مـن)، ئـەی ئـەوەی لـە دەریـاوان، لـە ماسـیگرەکان، لـە ڕێگـرەکان، لـەو بازرگانانـەی لووتەوانەیـان لـە کەپوودایـە، لـەو عەرەبانچییـە نەخۆشـانەی گوێچکەیـان هەمـووی نقێمـە... ڕوونتـر و سـافتر و گەشـتریت.

بـژی... بـژی، یەکگرتنـەوەی پارچەکانـی تـۆ کـە لـە یەکگرتنـەوەی پارچەکانـی ئـەم خاکـە جوانتـرە. بـژی... بـژی دابەشبوونی تـۆ بەسـەر شـەقتی جەلادەکانـدا، کـە لـە دابەشـبوونی ئـەم خاکـە جوانتـرە بەسـەر زەمانـی توتییەکانـدا.

من ستایشـی بێڕەحمـی خەنجەرەکانـی خـۆم دەکـەم. ستایشـی ژەهـر دەکـەم لەسـەر لێـوی عاشـقان. ستایشـی پشـکۆ دەکـەم لـە جەهەنەمـدا. ستایشـی باڵنـدەی کـوژراوی سـەربانەکان دەکـەم. ستایشـی ماسـی خنـکاو دەکـەم لـە لمـدا. ستایشـی کـۆچ دەکـەم لـەم وڵاتـەوە بـۆ ئـەو وڵات. ستایشـی فڕیـن دەکـەم لـەم درەختـەوە بـۆ ئـەو درەخـت. ستایشـی مـردن دەکـەم لـەم خەنجـەرەوە بـۆ ئـەو خەنجـەر. ستایشـی زسـتان دەکـەم لـەم بەهـارەوە بـۆ ئـەو بەهـار. ستایشـی کوچەی خاڵـی دەکـەم لـە شـەوانی شـەرمدا. ستایشـی پەنـاگای خاڵـی دەکـەم لـە بەیانیانـی ترسـدا

**من نوێژ بۆ ئەو گیانانە دەکەم کە بۆ بەگزادەکان چەمینەوە**
**نوێژ بۆ ئەو بارانانە دەکەم کە ڕۆژی مردنیان بۆ شتین**
**نوێژ بۆ ڕەشێتی موتڵەقی شەو دەکەم.**

**من درۆی خۆم بەسەر لاشەکاندا دەبارێنم**
**دۆعای خۆم بەسەر گۆڕەپانەکانی شەڕدا دەخوێنم**
**دەڵێم: خوات لەگەڵ ئەی فیشەکی تەلایی من، خوات لەگەڵ ئەی گوللەی نازەنینی من، ئەی جبەخانەی ئازیزم کە بەرەو لای دوژمنەکانم سەفەردەکەن... خواتان لەگەڵ**

**من ستایشی لەشی هەلاهەلای ناحەزەکانم دەکەم**

**ستایشی توندوتیژی دەکەم، لەگەڵ بچوکترین ئێسکی باڵندەدا**
**ستایشی شکانی نەریتەکانی شەڕ دەکەم، لەگەڵ لاوازترین پەپوولەدا**
**ستایشی ئاگر دەکەم لەکاتی سووتانی غونچەدا**

**من ستایشی خۆم دەکەم**
**ستایشی خەنجەرە بێستایشەکانی خۆم و مردنە تاریکەکانی خۆم دەکەم.**

# پیاوکوژ و ئەوانەی کە دێن

ڕۆژێک یەکێک دێت لە بێهیوایی مندا ئەڵماسێک دەدۆزێتەوە، کە لە هەموو ئومێدەکان جوانترە
یەکێک دێت لە هەڕاجی دوای مردنی مندا، بەشێک لە من دەبینێت کە من نەمبینیوە
یەکێک دێت لە گیرفانی خوێناوی مندا یاقووتێ دەدۆزێتەوە، کە لەمێژە هەمووتان بۆی دەگەڕێن
بەڵام من کلیلی مەحشەرەکانی خۆم لە شوێنی ئەوتۆدا دەشارمەوە، کە ئەوی ڕۆژ، کەس نایدۆزێتەوە.

ڕۆژێک باڵندەیەک دێت، کە پڕە لە گومانی بێمانا دەرهەق بە دادپەروەری خودا.
لە کوفرەکانی مندا بڕوایەکی قووڵ دەدۆزێتەوە کە من نەمبینیوە
لە دەستە بێتینەکانمدا، فڕین دەدۆزێتەوە... فڕینی زۆر، کە ئاسمان تووڕەدەکەن.
یەکێک دێت لە کانزای من قەفەزێکی چکۆلانە دروستدەکات، هێند چکۆلە، کەنارییەک ناگرێت
یەکێکیش لەم نوتفە شەرمنانەی من منداڵ دروستدەکات، منداڵ کە من نایناسم، منداڵی زۆر، کە باغچەکان تووڕەدەکەن
شەوێک (من) دێت، لە من یەکێکی دی دروستدەکات، منێکی زۆر، کە بێنەوەی مەبەستیان بێت، درەخت، چیمەن و گوڵەکان تووڕەدەکەن.

# پیاوکوژ و یارمەتیدەرێک

بەم دەمامکی فریشتانەوە هاتیتە ناو ژیانی من
بەم فریوی دڵسۆزییە ڕۆژەکانی منت لێوانلێوکرد لە مەراق
بە بۆنی موعجیزەوە هاتی
بە پوچی سووخۆرێکەوە لەم سەودایە چوویتەدەر.
من لەودیو خەڵوەتی خۆمەوە، بە برینی خۆمەوە دەژیام، تۆ لەودیو شەوەوە ویستت لە تاریکی دەرچیت و هاوارتکرد (ئەی دۆست، با ڕزگارتکەم). من لە گەمژەیی خۆمەوە دەرگاکانم کردەوە و گووتم (ئەی دۆست، وەرە و ڕزگارمکە).

بەم دەمامکی مەرهەمانەوە، زامێکی منت سارێژکرد، سەبووری گوڵێکی خۆت لە خوێنی ڕژاوی من هەڵسوو، بەڵام وەرە سەیری شوێنی کینەی ناو نیگاکانی خۆت بکە
بزانە مردن قووڵترە یان منەتی ئەم هەتوانەی تۆ
بزانە خەنجەر تیژترە یان لەخۆبایبوونی چاکەی تۆ.
ئەفسوس کەس نییە، خراپەی من و چاکەی تۆ بەراوردکات
من لە جامی یارمەتییەکانی تۆم نۆشی و بۆ هەتاهەتایە خۆم دۆڕاند
لە پەرداخی دۆستایەتیتم خواردەوە و شەرەفی خۆم هەلاهەلاکرد
جوانتربوو لە خەڵوەتی خۆمدا، تەنها بەدەم برینەکانمەوە بمرم
جوانتربوو دەرگا لە منەتی ئەم چاکەیە داخەم
تۆ لەسەر ئێسکەکانی من بۆ خۆت سەلماند مرۆڤیت؟

تۆ لەسەر غروری من، بۆ خۆتت نیشاندا باڵایت؟
سەلماندت من بچوک و لاوازم و تۆ مەزن
سەلماندت من هیچ و دزێوم و تۆ جوان.

## پیاوکوژ و هاوڕێتی

دۆستایەتی ئاوەژوویوونەوەی پڕگاڵی بچوکی دەستی من بوو، کە هەرگیز نەمتوانی بازنەیەکی لێدروستبکەم
شکانی تەرازوی دەستی من بوو، کە هەرگیز نەمتوانی هاواری باڵندەیەکی پێبکێشم
ئاسمانی من بوو، نەمتوانی هەوری بۆ قەرزبکەم
دەریام بوو، نەمتوانی یاقووتێکی بۆ بکڕم
من بە ڕووی کێڵگە سەوزەکاندا قیژاندم:
ئەی لە عەشق بەدتر، ئەی لە خۆشەویستی دڵپیستر: ئەی هاوڕێتی.

شەوێک کە لە کوشتنی گوڵەکان هاتمەوە، شەوێک کە لە تیربارانی درەختەکان گەڕامەوە، گووتم:
ئەی خوێنی هاوڕێ... ئەی لە خوێنی دوژمن شیرینتر.
ئەی جەستەی هەلاهەلای، هاوڕێ... ئەی لە جەستەی دوژمن ئازیزتر.

شەوێک کە لەنێوان بەلەم و مانگدا خەوتبووم
لەنێوان دارستان و هەوادا پیاسەمدەکرد، گووتم:

ئەی لە یەکەم باغ جوانتر
ئەی لە یەکەم بەهار تازەتر
ئەی کینەی من، ئەی کینەی ئازیزی من... ئەی هاوڕێتی.

## پیاوکوژ و خاتوونێک

من تێکەڵەیەکم لە تامی گێلاس و خوێن و باران
من کۆکتێلێکم لە شەو و ژەهر و ڕەشەبا
بۆ بروسکەیەکم تاقی ناکەیتەوە؟
زنجیر نییە، یەک زنجیر هەبایە، من تۆم پێ دەستەمۆ دەکرد.
درۆیە هەموو حوکمەکانی قامچی
ئەگەر تۆ وا ئازاد نەبوویتایە، من حەزم لە باغی گەورەتر بوو.
ئەمشەو، مردن نییە، ئەگەر مردن هەبایە
دوای خوماری ئەم ژیانە پوچەت نەدەکەوتم

نەمدەگووت: خانم، من بۆنی واوەیلای چیمەنم لێدێت
بۆ لەژێر چەتری ئەم عیرفانە خوێنینەدا نەبینە دۆست؟
ئەمڕۆ، نێچیرم نییە، ئەگەر نێچیرم هەبایە
بیرم لای شەهوەتی وا نزم و نەوی نەبوو

نەمدەگووت:
وەرە ئازیز با خەڵوزی ئەم کولتوورە کوژراوانەی دارستان بگەشێنینەوە.
ئەگەر خوێن هەبایە، من بۆ دەمگووت:
وەرە، با بە شێی چرۆ خەمگینەکان، خۆمان فێنک بکەینەوە.

ئەمڕۆ هەینییە لە باغی پیاوکوژان،

ئەگەر هەینی نەبایە، لە زەنگی خاکی وام نەدەدا، تۆ پێم بڵێیت:
ئەی پیاو، بۆنی ئاگری دزراوی کۆڵانەکانی بەهارت لێدێت
تامی شەرابی دزراوی مێوە وەحشەتناکەکان دەدەیت.
نەتدەگووت:
ئەی پیاو، منی لە شکۆفە شکۆفەتر
بەچی لە زستانی عومری تۆ بپەڕمەوە... بەچی؟
منی لە ماسی ماسیتر
بەچی لەم سەحرایەی دڵی تۆ بەم... بەچی؟
منی لە کۆتر کۆترتر
بەچی لەگەڵ ئەم ئاشوبەی گیانی تۆدا بسازێم... بەچی؟

# پیاوکوژ و شەهیدێک

ئەی گەمژە
من لەپێناوی هەموو جوانییەکاندا مردم، تۆ لەپێناوی هیچدا
من لەوسەری هەموو چێژەکانەوە هاتمەوە، تۆ لەوسەری هەموو پوچییەکانەوە
هەموو وێنەکانت بە دیوارەکانەوە، بەرامبەر بۆنی گوڵێک نین... کە دۆڕاندت

**هەموو ئەم ستایشە، بەرامبەر پەپوولەیەک نییە... کە چیدی نایبینیت**
**هەزار فریشتە، ئەم زامەت بۆ ڕابژێنێت، بەرامبەر نیگای کچێک نییە...**
**کە ئیدی لەدەستتچوو**
**هەزار باغ، برینت بۆ مەرهەمبکەن، بەرتەقای گوناهی ماچێک نییە...**
**کە ئیدی تامی ناکەیت**
**بگەیتە سەد بەهەشت، هێندەی گەیشتن نییە بە چڵی هەنجیرێکی بەرز...**
**کە ئیدی نایگەیتێ**
**بچیتە ناو سەد ڕووبار، وەکو مەلەکردن نییە لە گۆمێکی پڕ ماسیدا...**
**کە ئیدی ناچیتەناوی**
**بەیانی تف لە زامەکانت بکە و وەرەوە**
**تف لەم شوێن خەنجەری دوژمنە بکە و وەرەوە**
**بە پچوکی (وەک مرۆڤێک) لەنێوان خەندەی کالیبتۆسەکاندا بمرە...**
**جوانترە.**

**(کە دواجار بولبولەکان خۆیان دەمرن، تۆ بۆ لەپێناویاندا دەمریت؟) هێندە کاڵفام مەبە، ئەی دۆست، وا بزانیت مردنی تۆ گوڵزار دەڕازێنێتەوە. سەیرکە و ببینە، ئەی دۆست، دوای مردنی تۆ، ژیان هەر وەکو خۆیەتی. سەیرکە و بگری، ئەی دۆست، دوای گەڕانەوەشت، مردن هەر وەکو خۆیەتی.**

# پیاوکوژ و دەستەیەک لە ئازادیخوازان

من بەبێ وتارەکانی ئێوە لەسەر ئازادی... ئازادم
ئەگەر زنجیرێک هەبێت، لە دەست و پێی ئێوەدایە.

ئەی ئەوانەی هەمیشە باسی پاشەڕۆژ دەکەن و دەستتان ناگاتە نزمترین هەرمێی حەوشەکانتان. ئەی ئەوانەی باسی سەدە خۆشەکانی سبەینێ دەکەن و ناوێرن سەیری پیاڵەی پڕ لە ژەهری ئەم بەیانییە بکەن.
ئێوە لە مێژە، قسە لە داد و یەکسانی دەکەن، بەڵام دادپەروەری ئێوە، ناگاتە دادپەروەری گوڵێک کە ئەمڕۆ دەگەشێتەوە
من بەبێ هاوارەکانی ئێوە بۆ یەکسانی
لەگەڵ ئەستێرە و زەوی و زیندەوەرەکاندا یەکسانم.
ئێوە هەمووتان بەئەندازەی جامێ هەنگوین، تام نادەنە ژیێ

مەشخەڵەکانی ئێوە، کوا بەقەد چزووی دووپشکێکی شەرمنی ژێر توترکەکان، تاریکی ئازار دەدات
پەلامارەکانی ئێوە، کوا بەقەد دەنوکی زەرنەقووتەیەک گوڵ وریادەکاتەوە.
من لەبری مارشی ئێوە، لەگەڵ پۆڕ و پشیلەکاندا مارشدەکەم
دەزانم، ئەو ڕۆژەی ئێوە بانگی بۆ هەڵدەدەن بەقەد دەنکێک زەیتوون سەوز نییە
ئەو ڕۆژگارانەش کە جەنگتان بۆ بەرپاکرد
وەک ئەو ڕۆژگارانە وان کە ڕوخانتان
من بەبێ شۆڕشەکانی ئێوە، کۆت و زنجیری خۆم پساندوە

هـاوار لـە مـن، کـە بەبـێ هیـچ دروشـمێک. ئـازادی گـوڵ، مانـگ و ڕوبـار دەژیـم
هـاوار لـە من، کـە بەبـێ هیـچ جەنگێـک، ڕۆژ بـە ڕۆژ وەرزی ئـازادی خـۆم دەژیـم.

# پیاوکوژ و شاعیرێکی نیشتمانپەروەر

بەحرەکانی تۆ بۆ وا ساردن، تەفعیلەکانی تۆ بۆ وا ژاکاو
دەڵێیـت لـە باغچەیەکـەوە هاتوویـت، هەمـووی ئاشـووبی غونچـەی درۆزن بـووە
دەڵێیت لە ژوورێکدا لەدایکبوویت، سەرتاپای شیوەنی گوڵەباغ
چییە؟ قافیەکانی تۆ لە بیمارستانی چ دیوانێکەوە هاتوون؟
چییە؟ عەروزی تۆ لە خەستەخانەی چ کۆڕێکدا گەورەبووە؟
من تێناگەم، خەیاڵی تۆ سەر بە جنسی خەیاڵی چ مەیخانەیەکە؟
قەڵەمی تۆ، سەر بە خێڵی قەڵەمی چ مێگەلێکە، ترساو؟
شیعرەکانت، بۆنی قەوزەی لێدێت، قەوزەی جەماوەر
پەخشانەکانت بۆنی زامی لێدێت، زامی سەر سینەی شۆڕشەکان
شیعرەکانت، بۆنی لێخنی ئەم ڕاپەڕینە ڕزیوانەی سەر تاقەکانی لێدێت
بۆنی زێرابەکانی ئازادی و جۆگە لێخنەکانی خەبات.
تۆ بۆنی میللەتت لێدێت... من بۆنی خۆم
تۆ بۆنی عارەقی گۆڕەپانەکانت لێدێت، دوای سەرکەوتن
من بۆنی دەروێشێکم لێدێت، دوای پرسیار.
سەیرکە نوکی قافییە ئاسنینەکانی تۆ، لە خەنجەرەکانی من تیژترن
خوێنی وشەکانی تۆ، لە خوێنی کوژراوەکانی من تەڕترن.

ئـەوەی ئـەم کێـش و سـەروایەی تـۆ نەیکوژێـت، بـەم تیـر و کەوانـە منداڵانەیـەی من نامرێت. ئـەوەی ئـەم هەمـوو قافیەیـە مەستینەکانت، لـە زنجیرەکانـی منـدا تـا
هەتاهەتایە بە هوشیاری دەژی.

# پیاوکوژ و کۆتاییەکان

گەر ڕەشەبـاش کۆتـاییهات، گەردەلوولەکانی من ئارامنابنەوە
گەر دەریـاش کۆتـاییهات، من هەر لێرەم. دەریـای من کۆتـاییـنایەت
گەر کۆتـاییەکان کۆتـاییـانهات، من لەوێوە دەستپێدەکەمەوە
سەردەمێک دێت، تیایدا، من لە هەموو زیندووەکان زیندووتـر دەبم
سـەردەمێک دێـت، مـن لـە دەرەوەی کۆتـاییەکانـەوە، لەوسـەری ڕەهایـی زمانـەوە، لـە ئابەینـی لاسکە لازۆردییەکانـی هەسـتانەوەدا، لـە دەرەوەی سـزا، لەودیـو هـاژەی بـوون و نەبوونـەوە
تەنیا زیندوویەک دەبم، کە زیندوو دەبمەوە.
ئەوکات دەبینن، ئاسمان کۆتـاییهاتووە و من هەر پڕم لە ئەستێرە
من کە هاتم، بۆ ئەوە بوو، تـا هەتاهەتـایە لێرە بم
من لێرەم... ئەوە زەمانە بەناو مندا تێدەپەڕێت
ئەوە شوێنە لەناو مندا نیشتەجێیە.
من هاتم دەستبخەمە سەر ڕێگایەک و بڵێم: ئەمەیە ئەبەدییەت
پەنجە بخەمە سەر ڕەهاییەکی بێسنوور و بڵێم: ئەمە منم... من
من (ئێستا)ی هەموو ئەو هەنوکە بزرانەم کە هێشتا زۆر دوورن

**سەیرکەن گەر ئاوێنەش نەمێنێت، من خۆم لە هەموو مەخلوقاتەکاندا دەبینم**
**گەر زەمانیش نەمێنێت، جوانتر و سافتر خۆم لە دەرەوەی زەماندا دەبینم.**

**سالی / ١٩٩٨**

جەلادەکان بەشێکن لە من و تۆ
بەشێکن لە موعجیزەکانی خودا... دەچنە بەهەشت
ئەوان پەشیمانی شەوێکن لە دەرگا ڕۆشنەکانی خۆی
پەشیمانی گوڵێکن لە ڕەونەقی بەیانیانی خۆی
... دەچنە بەهەشت

کەسیش نییە پێیان بڵێت:
بەهار بەهاری تۆ نییە
باران بارانی تۆ نییە
گەمەی تۆ لە دەرەوەیماڵی ئینسانە
شەوی خۆت تێکەڵ بە ئێوارەکانی ئێمە مەکە
بەیانی خۆت مەبەستە بە باڵی پەپوولەکانی ئێمەوە
... دەچنە بەهەشت

ئەگەرچی من و ئەو دەبێت پێکەوە، لە لالەزارەکاندا بکوژرێین
ئەگەرچی مەرگی من ترازانی دەستی ئەوە لە شمشێرەکان
بەڵام ئێمە لە چاوەڕوانی قافڵەکاندا لێرەدا دەوەستین و
ئەو دێت و بە بەردەمماندا دەڕوات و دەچێتە بەهەشت

**من و ئەو لە چاوەڕوانی یەکتردا پیر دەبین**

**پیر دەبین بەدیار ئەو گوڵانەوە کە لەسەر لەشمان دەڕوێن**
**پیردەبین بەدیار گەنمی بێحاسلی کێڵگە ئەبەدییەکانمانەوە.**
**بەدیار ئەو ئەستێرانەوە کە لە کانییە تاریکەکانی ڕۆحماندا ونبوون**
**پیردەبین بۆ قەیاغێک ڕۆحی خۆمانی پێدەربازکەین.**
**بۆ شارێک بەرەو سەرابەکانی بڕۆین**
**بۆ سێبەرێک ئەسپەکانی خۆمانی لادانێین.**
**من پێمگووت:**
**سەما بکە لە دەوری ئەم پەشیمانییەی تۆی تابەردەم دواهەمین ئاوێنەی وجودی ئێمە ڕاکێشا، کە کلیلی ئێمە لە گەنجینەی باغەکاندا دەشکێت.**
**سەمابکە کەهێشتا بەرزی فڕینەکانی تۆ بەقەد شانی ئەو نهێنیانە نییە کەدەبێت بیگەیتێ.**
**لە شەوێکدا پیری بەدترین جەلادی هەردووکمانە.**
**ئەی بادەنۆشی مەیخانەی نهێنییەکانی من**
**لەژێر باڵکۆنی ڕۆحی مندا سەمابکە. لەسەر پاشماوەی ئاگری وێرانەکانی وجودم هەڵپەڕە. بەسەر پشکۆی بەجێماوی سووتانی شارە تەڵاییەکانی مندا بفڕە. لەسەر چڵە بەرزەکانی درەختی حەقیقەتی مندا سەمابکە.**
**بەرامبەر لەوحی ڕەمزە هێروگلیفییەکانی من بمرە. بمرە بەدیار ئەو باڵندە**
**ئاوێنەیانەی لەباغی ئەم ڕوخسارەدا ئانیشنەوە**
**من هەڵدێم... ئەی هاوڕێی حەقیقەتەکان... هەڵدێم**
**تۆ پیر دەبیت بەدیار دۆزینەوەی باغەکانی منەوە**
**پیر دەبیت و سێبەری شکۆفەیەکی من ناگریت.**

# هەڵهاتن

هەڵدێم بەرەو باغی پڵنگە برسییەکان
یەکێک لێمدەپرسێت: گوڵ چەند ڕۆحی هەیە؟
هەڵدێم بەرەو باغی ئەو خودایانەی یەکتریان بەدرەختی نورەوە بەستۆتەوە.

یەکێک لێمدەپرسێت: خودا، چەند ڕۆحی هەیە؟
هەڵدێم بەرەو دەواری جوانییە نەخوازراوەکان
یەکێک دەپرسێت: جوانی چەند دەرگای هەیە؟
هەڵدێم بەرەو قوبەی تەکینەوەی گوڵەکان لەیەکتر
یەکێک دەڵێت... لە بۆشایی زێڕینی بەهاردا مەگری.

# تووتییەک لەبەردەرگا

من بەپڕتاو سێوەکان جێدەهێڵم
تووتییەک لە گەڵای وەریوی گەردەلوولەکانی من دەخوات
حەرفی وەریوی کتێبەکانی من هەڵدەگرێتەوە
بەتەنها وەکو بایەکی ماندوو خۆی بەسەر دیوارەکانی خەڵوەتی ئارامیانەی مندا دەدات و دەڵێت: من ئەو تووتییە نیم عومری خۆم لە فڕیندا بەسەر دارستانی ئەم حەرفە پیرانەدا ببەمەسەر. چڵاوچڵ لە مەیخانەکانی زماندا خۆم تووشی بەدمەبەستی بکەم. من قاقایەکی

**بێهودەی جەنگەڵ ناگۆڕمەوە بە کتێبی ئیمپراتۆرەکانی تۆ. هەڵهاتن بەشارێگەکانی حەرفدا دەبێت چی بێت جگە لە خلیسکان بەناو وجوددا.**
**بۆ کوێ هەڵدێیت کە هەمان وشە دەتگێڕێتەوە هەمان شوێن**
**کە ئەم ڕستە بازنەییانە دەتخنکێنن.**
**بۆ کوێ هەڵدێیت، کە ئەم ڕێزمانە مەغۆلییە لەناو حەقیقەتەکاندا خەوتووە.**
**ئەم ڕێسا فاشستییە لە ناو خوێندا پیاسەدەکات.**

## یەکێک دەپرسێت «بۆ کوێ هەڵدێیت؟»

**بۆ کوێ هەڵدێیت؟ ئەی نازکتر لە ئەمیرەیەکی ڕەش لەناو گوڵە سپییەکاندا.**
**بۆ کوێ دەفڕیت؟ کە جەلادەکان لەناو جوانیدا خۆیان شاردۆتەوە**
**لەناو شیعرەکاندا خەوتوون. دەنگیان لە دەنگی بولبولەکان دەچێت؟**
**بەهار دێرینترین گوڵی عەیاری خۆی دەدات لە باغچەیان**
**نور لە ڕۆحی تاریکیان دەڕژێت.**
**کێ بۆ ئاوێنەکانی ئەوان ڕووی خۆی ئاشکراناکات؟**
**میوەکانیان لەسەر سەرینی عەشق و خوێن، چ تامێکی هەیە**
**کێ لە بورجی ئەوانەوە خۆکوشتن بەشاعیرانە نازانێت؟**
**سەیرکە (با) سەما بۆ سنەوبەرەکانیان دەکات، تاوانەکانیان بەبلوور، بەبوغرد ڕازاوەتەوە، تەنهاییان بەبا و بروسکەوە نازدەکات.**
**بۆ کوێ دەچیت جەلادەکان لە پێش تۆوە بەرەو پاشەڕۆژ دەڕۆن**
**ژیان میوەیەکە ئەوان تۆوەکەیان لە باغی خۆیاندا چاندووە.**

بۆ کوێ دەچیت؟
کەتۆ هەیوانێکت نییە کورسییە نیلۆفەرییەکانی خۆتی تیادابنێیت و چلچرا ڕەشەکانی سەر دەریا بژمێرێت. تۆ هەیوانێکت نییە، کتێبەکانی خۆتی تیابخوێنیتەوە و کۆترە
کوژراوەکانی باغچەی لێوە بانگبکەیت. هەیوانێکت نییە، دەستبەری چەپکێک لە مەرگ بکەیتەوە و دوای خۆت لەسەر لێواری زیندەگییەکی دی جێیبهێلیت...
بۆ کوێ هەڵدێیت کە دواجار بەرامبەر ئەم ئاوێنەیە
هەمووومان لە ئامێزی جەلادەکانماندا... تەنهاین.

هەڵدێم بەرەو سەمەرقەندێک دوور لە مەنجەنیقەکان
بەرەو باغێک دوور لە گوڵەکان
بەرەو گیایەک دوور لە بەهار
بەرەو نورێک دوور لە هەر ئەستێرەیەک
من لێرە نیم... من لەوێ نیم
با دەرگاوانەکان بە (با) بە (شەو)، بە (نور) بڵێن، من لێرەنیم
بەو مێوانە بڵێن کە لە جەنگەڵ هاتۆتەدەرێ و سێبەر لە کڵاوەکەی دەتکێت، من لێرە نیم
بەدارستانەکان بڵێن: گوڵێکی پیربوو خۆی فڕێدایە ئاگری پاییزەوە
بەجوانی بڵێن ئەمیرێکی دزێو بوو لە مەنفای باغچەکاندا مرد
بۆ بزانێت... بۆ باران بزانێت من لە قەترەیەکی ئەودا نوستووم؟
بۆ بزانن من نامەوێت لەم کوچەیەدا ببمە دۆستی کەس
نامەوێت هیچ شکۆفەیەک... هیچ غونچەیەک بمناسێت.
من هەڵدێم بەرەو خاکێک جەلادی تیانەبێت
من هەڵدێم مەهێڵن گوڵەکان بەدوامدا هەڵبێن

مەهێڵن ماسییەکان بەخۆیان و ڕووبارەکانیانەوە دوامبکەون
مەهێڵن میللەتەکان بەپاساری و پەپوولەکانیانەوە بمگەنێ...
من هەڵدێم... ئەی ئەستێرەکان... من هەڵدێم
تا ئەو بەدیار دۆزینەوەی باغەکانی منەوە پیر دەبێت
پیر دەبێت و دەستی بەسێبەری شکۆفەیەکی مندا ناگات...
... من هەڵدێم...
بەڵام، بۆ کوێ هەڵدێیت؟
کە دواجار تۆ ئەویت و ئەو تۆیە
بۆ کوێ هەڵدێیت؟
کە دواجار تۆ نورێکی لە سووتانی ئەو و ئەو نورێکە لە مەرگی تۆ
تۆ خەنجەرێکی لە مشتی ئەودا و ئەو خەنجەرێکە لە کینەی تۆ

# من و ئەو

بازدە... بازدە ئەی ئیبلیس بەسەر پەرژینی بەختیاریدا
گوڵەکان نایانەوێت سێبەری تۆ ببینن لە خوێنیاندا
بفڕە... بفڕە ئەی باڵندەیەک لە گەردی ئاوابوون خوڵقاویت
بفڕەو تۆزی خوێناوی خۆت بەسەر بەهاردا بتەکێنە
بڕۆ... بڕۆ با (با)، دیکۆری ئەم شانۆ ئیبلیسییەمان نەڕوخێنێت
بڕۆ ئەی دۆست، من ئێستا ئەکتەری دەریام
عەتری هاوڕێتی من و کەنارەکان لە پرچی خۆتدا خاڵی مەکەرەوە.
بازدە... بازدە بەسەر شورای میرنشینی وەنەوشە عاشقەکاندا
بفڕە... بفڕە و هاڵاوی دەریا لەسەر ئەم فەرشە پاکەی من بتەکێنە
بەس... بەس لە مەیدانی باغچەدا نێرگز بەزینا سزابە

مەیکوژە... ئەو کوکوختیەی کە چیتر لێرەوە نافڕێت
فەنایمەکە... ئەو مەخلوقاتە کوێرانەی پرسیاری شارێکیان لێدەکەیت
(نەیانبینیوە)
ئەم چۆلەکەیە مەکوژە
نازانێت مانگ چۆن لەگەڵ دەریادا زینادەکات
ئەم گاشەبەردە حەکیمانە مەکوژە
کە یادوەرییان پڕێتی لە خوێنی باڵندەکان
لەسەر ئەم پێشبینییە خەیاڵیانەی گوڵ باغچەمان لێوێران مەکە
لەسەر ئەم پێکەنینە دەنک دەنکانەی هەنار، بەهار خاپورمەکە
بازدە بەسەر ئەو بورجانەدا کە مرۆڤ بۆ تەنهایی خۆی دروستیکردوون
بازدە بەسەر سێبەری تەلبەندەکانی ژیاندا
بازدە بەسەر منارەی پەپوولەکاندا.
وەرە زنجیرەی ئەم مەرگانە ڕاکێشە، کە باغەکانی خۆیان بەکرێنادەن
زنجیرەی ئەم میللەتانە ڕاکێشە، دوای سەرابی شکۆفەکان کەوتوون
جڵەوی ئەم ئاگرە ڕاکێشە، سەر بەدیوارەکانی جەهەنەمدا دەدات
ئازاری ئەم گوڵە مەدە لە باغەکانی جوبرائیل ڕوواوە
ئەم کەنارییە مەکوژە، کەخواجای لەخەو هەستان
ئەم سەعاتە مەشکێنە، کە کاتی سزای تیا نییە
ئەم ڕۆژژمێرە مەدڕێنە، کە ڕۆژی حەشری تیا نییە
لەناو هەزاران دەریادا، دڵۆپێ ئاو بۆ بولبولەکان
لەناو هەزارەها ساڵدا، ساڵێک بۆ پەپوولەکان
لەناو هەزارەها خۆردا، خۆرێک بۆ باغچە
ئەم ئومێدە مەکوژە
با بەرەو پیری زەنگەکانی موتڵەق بڕۆین
دیالۆگێکی درێژ لەگەڵ پاسەوانەکانی جوانیدا سازکەین

**دەست بۆ سێوەکانی ئەودیو دەرگای قیامەت بەرین**
**لەژێر شۆڕەبی ئیشراقدا، پارچەیەک (نور) بخوێنینەوە.**

# مردنی من

**ئەی هاوڕێم مردنی منت بۆ چییە؟**
**مردنی من ترازانی ئەڵقەڕێزێکە لەنێوان شکۆفە و باغچەدا**
**ترازانی کێلونێکە لەنێوان ئاسمان و ئەورەسدا**
**پرسیاری قافڵەیەکی بیابانە لە کەشتییەکی دووری دەریا**
**خەوێکە کەنارییەک بۆ هەنارێکی تەفسیردەکات**
**گوڵێکە فریشتەیەک باغێکی خەوتووی پێخەبەردەکاتەوە**
**مردنی من کانییەکە لە نزیک مەعبەدێکی خاڵییەوە**
**ماڵێکە لە نزیک شەفەقێکی تالانکراو**
**ڕێگایەکە بەقەدپاڵی حەقیقەتە ساردەکاندا**

**مردنی من**
**نوێژێکە لەسەر ئێسکی بەجێماوی سنەوبەرەکان**
**دۆعایەکە لەسەر لاشەی دەم ئاوکەوتوی جوانی**
**سوێندێکە بولبول بۆ شەوە ساردەکانی دەخوات**
**نرکەیەکە لە حەقیقەتەوە بەرەو شەقامی خەیاڵ.**

**ئیدی مردنی منت بۆ چییە؟**

# جەلاد و باغەوان

تۆ لەناو ژووره تاریکەکاندا گەورەبوویت،
وەره با سەفەربکەین
سەفەر خەونێکە لەژێر هەنارەکانی شەودا
ئاشنابوونە لەگەڵ هەرمێیەکی ساوادا، لەسەبەتەیەکی پیردا
خواردنەوەی شەربەتێکە لە ئێستگەیەکی پڕ لە لیمۆی خەوتوودا.
وەره با لە فارگۆنی خاڵی چاوەڕوانیدا، ئەختێک لە خەیاری عەشق پاکبکەین
با لەسەر مێزی خەیاڵ تووی بەختەوەری بخۆین
من تەماحی ڕەزێکی ئەفسانەییت دەخەمەبەر. وەعدی هەڵوژەیەکی خوداییت پێدەدەم. وەعدی قۆخێکی ئاودارت دەدەمێ لە خاکی بەخوڕەمی ئەوینەوە.

(من هەرگیز درۆزن نەبووم، ئەو گوڵانەی
لەژێر ئەشکەنجەی تۆدا مردن... دەمناسن)

تەفسیریکە... ئەم هەموو ئەڤینەی پرتەقاڵ لەژێر پەنجاکانتدا... تەفسیرکە
تەفسیریکە بۆ هەناسەی ئەم گوزەری نارنجانە بەسینەی تۆ وا ئاشنان؟
بۆ بۆنی ئەم بەهێیە، لە سفرەی خاڵیت هەڵدەستێت؟
چییە، ئەم زەیتونی وەفایە دەڕژێتە دەستی ساردتەوە؟

**بۆ قاپی خەونەکانت پڕبووە لە کەستانەی ئومێد؟**
**تەفسیریکە... ئەی هاوڕێم... تەفسیریکە**
**ئەم زامەی ڕۆحت هەڵکۆڵە، سەیرکە چ بێستانێ خەوتووە؟**
**وەرە قامچییەکەت فڕێدە، با من گوڵەکانت پێبناسێنم**
**وەرە و سەر لەنوێ ڕێگای شاری یارانت فێرکەمەوە.**

*** ئەم نێرگسە منداڵی باغەکانی سەمەرقەندە، هەڵاڵەی بەتۆزی لەشکرەکانی توغرڵەوە هاتە بەغدا/ ڕۆژگارێک باڵوێزی بەهاربوو لەناو سەوسەنەکاندا/ (با) لەگەڵ خەندەکانی سەندەبادا هێنای/ دەرگاکانی بکەرەوە، مانگ خۆی دەکێشێ بە کلاوەکەتدا / پەنجەرەکانی بکەرەوە، دەستەکانت بۆنی هەنگوینی حەقیقەت دەگرن/ سەیری ئاوێنەکانی بکەیت دەبیت بەسەراب/ سەردەمانێ شالیار بوو لە میرگوزاری ڕاستیدا/ ئەمیر بوو لە چیمەنی ئیمارەتەکانی سەرابدا/ نەیتوانی وەک شایەک بژی، سەفەریکرد بەرەو جوانی/ لە عەشقدا، خۆی وەکو هەرزنی بەردەم کەنارییەکان وردکرد/ جوانی خۆی وەکو ئاوێنەیەک لەنێوان ئەمبەرەو بەری ئاوێکدا دانا/ چۆڵەوانی بێسنوری چواردەوری شەبەنگە سیحراوییەکانی خۆی بینی/ ڕۆحی خۆی دەنک دەنک وەراندە سەر سفرەکان/ جوانی خۆی بەش بەش لەنێوان ئاو و جەنگەڵ. غرور و نازکی، فیتنە و بەخشندەیدا بەشکرد/ ئەو منداڵێک بوو لە باغەکانی سەمەرقەندەوە، هەڵاڵەی بەتۆزی بومەلەرزەکانی زەمانەوە هاتە بەغدا/ منیش لەلای گوڵفرۆشێکی پیر، عەتارێکی شارەزا لە نهێنی گوڵ، بەشی خۆم لە شوشەیەکدا هەڵگرت.**
**تۆش ئەی جەلادی برام، وەرە و بەشی خۆت لە نێرگس و جوانی هەڵگرە.**

*** ئەم لاولاوە... کچی دەرکراوی کۆشکێکە لە مانگ/ لە یاقووت فرۆشێک بەجێما بەڕاگوزەر چاکەتەکەی بەچڵی باغێکدا هەڵواسی/ کچی عەتارێک بوو لەبەر باراندا مرد و خەیاڵەکانی با بردی/ لەسەر ئەو ئاواتانە دەرکرا کە لە هێلانەی پەرسێلکەکاندا دەیشاردنەوە/ ئاواتی سەوزبوون لەنێوان ئاگر و خۆڵەمێشدا/ فڕین و نیشتنەوە لەناو خاکە بەیارەکانی مردندا... دڵساف بوو ئەو لاولاوەی لە بەژنی سۆفییە پیرەکان دەئالا، لە بەژنی ڕاوچییەکان دەئالا/ لە بەژنی ئەو حکایەتخوانە دەئالا کە چیرۆکی لەسەر گێلاسە وردەکانی بازاڕی جوانی دەهۆنییەوە/ دڵساف بوو ئەو لاولاوەی خودای سەردەخست بۆ باڵکۆنەکان/ لە زنجیرەکان دەئالا و جەلادی لەسەر درەختەکانی تەنهایی دادەگرت/ مردنیشی پڕبوو لە پاسەوانی بەهار/ پڕ بوو لە زەنگی سەوزی بەئاگاهاتنەوەی میوەکانی باغ/ خۆرئاوابوونیشی پڕبوو لە مانگی دەم بەخەندە/ دڵساف بوو ئەو لاولاوەی ڕۆژێک لە دەستەکانی من ئالا/ بەرەو کۆڵانی سەنتورەکانی بەهەشتی بردم/ لە نزیک شوشەی پڕ و جامی خاڵی باغەکانی نەیساپورەوە دانام/ بەمنی گووت ئەوە شوراکانی شیراز و ئەوە ڕەزەکانی گوڵستان/ خۆت لە بێستانە ڕازاوەکانی ڕۆح و بێهۆشی مەستکە/ بەشی خۆت شەتڵ و حەقیقەت هەڵگرە/ نەمام و تێفکرین بچێنە**
**تۆش ئەی جەلادی برام**
**وەرە چیت دەوێت بۆ باغە چکۆلانەکەی خۆت، هەڵیگرە)**

*** ئەم پاتۆنیایە بێدەنگترین مەخلوقی قەدپاڵەکانی سەبوورییە/ شەرمنترین کەناری ناو دارستانەکانی سرموتنە/ هەرگیز خودای لە مەینەتی خۆی ئاگادارانەکردەوە کاتێک شەوەکانی پڕبوون لە چلچرای زەمهەریر/ کاتێک پەرداخی ژیانی (لەسەر لێوی باغچە) گەردەلوول دەیشکاند.**

**بەهیچ باغەوانێکی نەگووت: کوا سەعاتەکانی بەختیاریم؟**

**کوا ڕۆژی لەدایکبوونی من، لە تۆمارەکانی باغچەدا؟**
**کوا بازاڕێک چەشنی گوڵەکانی خودا من لەنجەولاری تیا بکەم**
**چ پاتۆنیایەکی ئارام بوو لە جەهەنەمی سرەوتنی خۆیدا؟**
**ڕۆژێک منی برد بۆ کۆلانی پەرەسێلکە سەبوورەکان، باغی میوەی نیشاندام تک... تک هێمنی لە لاسکەکانی دەچۆڕا/ بەسەبری غونچەکانی ئاشناکردم، بەچاوەڕوانی ئەزەلی باڵندەکانی ناساندم/ ووتی: ئارام بە ئەی مرۆڤ، تریفەکان لە منداڵەکانی سبەینێ مەشێوێنە/ هەرتۆ نیت لە ئابەینی ئەستێرە و باغچە و ڕووبارەکاندا سەفەردەکەیت/ هەرتۆ نیت لەم ئاوە دەخۆیتەوە/ تۆ دوێنێ نەبوویت/ سبەینێ سەرخۆشێکی دیکەش لەناو درەختەکانی بێستاندا دەردەکەوێت/ ئەویش دەستدەبات پاتۆنیایەک لە باغی بێدەنگی بکاتەوە/ گوڵێک هاواردەکات: ئارامبە، ئارامبە، هەر تۆ نیت دەتەوێت هەلالەی ئەمری بۆنبکەیت/ سەبووری ئەم بولبولە مەکوژە/ پاڵ بە کەژاوەی ئەم یاسەمینەوە مەنێ بۆ هەواری میرنشینی خۆت/ پاڵ بەکاروانی ئەم چیرۆکانەوە مەنێ بۆ سەر دەفتەرەکانی خۆت/ ئارام بە ئەی مرۆڤ، جیهان مۆزەخانەیەکە، تەماشای ئەفسانەکانی بکەو شوشەی حەقیقەتەکانی مەشکێنە/ من لە پاتۆنیاکانەوە فێربووم گەنجینەکانی ژیان لە سێو و لە گێلاس/ عەمبارەکانی جوانی لە دالیاو هەلالە بۆ من نیین... بۆ تۆ نیین... بۆ ئەو نیین... بۆ ئەمرۆ نیین... بۆ بەیانی نیین... بۆ هیچ زەمانێکیش نیین...**
**ئەی جەلادی برام، فێربە**
**ئەم فەرشە بچوکەی زیندەگی بۆ تۆ لە قەراغ ئەم ئۆقیانووسە ئارامەدا ڕانەخراوە**
**پێ لە حیشمەتی غونچەکان مەنێ**
**دەست بۆ فڕینی باڵندەکان درێژمەکە.**

# گەڕانی گورگ

**تۆ لە کوێیت؟ ئەی ئەوەی تێپەڕیت و گووتت...**
**من ڕەوانەکراوی خودام بۆ جەنگەڵەکان**
**من پێغەمبەری گورگە تەنهاکانی شەوم**
**کوایت؟ ئەی ئاسنگەری دەرگای شارە تاریکەکانی ناو ڕۆحم؟**
**کوا مەشخەڵە دڕندەکانی غوبارستانی ڕۆحی تۆ؟ کوا نامەی ترسناکی تۆ لەم پۆستەیەدا بۆ بەیان؟ کوا حەرفە ئەستێرەییەکانی تۆ لە گژوگیای بەهاردا؟ کوا خەراباتی ڕۆح لە دوای شمشاڵی تۆ؟ کوا وێرانەی جەستە لە دوای شەماڵی تۆ؟**
**من ئەمشەو کوچە خاڵییەکانی خەیاڵت بەدوادا گەڕام**
**گوڵی گۆڕستانەکانم بۆنکرد**
**ڕێگام بەخودا گرت لەناو هەڵاڵەکاندا**
**گووتم: بائەوەی جوانی بەشکرد، نێچیرەکانیش بەشکات.**
**ئەوەی مەحەبەتی بەشکرد، ژەهریش بەشکات**
**وەرە با ژووری بۆ ئاگر دروستکەین، لەنێوان ئەم (ئاو و ڕەشەبا و بەردە) دا**
**لە زیخەڵانەکان بێینە دەرێ... لەناو لاشەکانەوە سەیری مانگ بکەین...**
**لە لمی شەو بێینەدەرێ، تریفەی درەختەکان بتەکێنین، شوراکانی ئەم بەهارە لە هەتاوی دوێنێ بسڕین، کوختێک بۆ پاسەوانەکان دروستبکەین لەناو ئەم (گوڵ و مانگ و ئاوە)دا، کەپرێ بۆ مردن دروستبکەین لە ڕێگای ئەم (عەشق و زیندەگی و خەوە)دا**
**با پەیمانی جوانی و شەیتان تەماشاکەین**

**سروشت و شەریعەت بخەینە سەر میزان**
**هاوڕێم**
**من زنجیرەکانی جەنگەڵم شکاند، تۆ زنجیرەکانی باغچە بشکێنە. من دەرگای دارستانەکان کلیلدەکەم، تۆ شوراکانی ئینسان قفڵدە**
**کەی ڕاوکەرەکان تێدەگەن، ترس بەشێکە لە جوانی زستان؟**
**کەی مێخەکەکان تێدەگەن، قامچی بەشێکە لە هەیبەتی باغچە؟**
**کەی بەفر تێدەگات، جێ چنگەکانی من بەشێکە لە زەخرەفەی جەنگەڵ؟**
**چی دەبێت ئەمڕۆ خۆر بۆ من و تۆ بێت؟**
**بۆ زستانێک مانگ لە نزارێکدا کفنکەین؟**
**چی دەبێت بەهارێک پەلکەزێڕینەکان داگیرکەین؟**
**هاوینێک ئاونگەکان... گزنگەکان... پڕشنگەکان... تالانکەین؟**
**چیدەبێت ئێوارەیەکی هەینی... شەقامەکان بۆ من و تۆ چۆڵبن؟**

**شەممەیەکی شەرمن... باغەکان من و تۆ ئاشتکەنەوە؟**
**یەکشەممەیەکی عاشق... بازاڕەکان گوڵاوی من و تۆ بفرۆشن؟**
**دوشەممەیەکی نازەنین... نازی پیرێتی من و تۆ بکێشێت؟**
**سێشەممەیەکی باران... هەوری من و تۆ لێرەدا ببارێت؟**
**چوارشەممەیەکی بێمار... بەئەسرینی من و تۆ بگری؟**
**پێنجشەممەیەکی پیر... بۆ من و تۆ بچەمێتەوە؟**
**چیدەبێت ئەی هاوڕێم... چیدەبێت؟**
**باپرسین:**
**تۆ ئەی ئەوەی بەهارت دروستکرد، کوا فەسڵێ بۆ ئارەزووەکانی ئێمە؟**
**کوا هاوینێ پاوانەکانی خاڵیبێت، بۆ ڕاوشکاری ئێمە؟**
**کوا هەورێ خەزێنەی بروسکەکانی بخاتە بەردەستمان؟**

هاوڕێم نرخی خۆت لەم بازاڕەدا مەشکێنە
کە بەبێ تۆ شارەکان دەکەونە بەر ڕەحمی ئاشوبی ئەستێرەناسەکان.
بەبێ تۆ، ئەی جەلاد... جەنگەڵ خاڵییە... دەریا خاڵییە... ڕێگاکان خاڵین... شەو خاڵییە... باران خاڵییە... دەستەکان خاڵین... کوختەکان خاڵین... گەنم خاڵییە... سینەکان خاڵین... فرمێسکەکان چۆڵن... هاوارەکان چۆڵ... ڕۆحەکان چۆڵن... پێغەمبەران چۆڵن و خوداش چۆڵەوانییە.

# ساتێک لە تێڕامانی جەلاد

کۆترەکان سبەینێ بەسەر مردنمدا دەفڕن،
وای لەدەست کۆترەکانی سبەینێ.
ئەستێرەکان سبەینێ بەسەر چل و چێوی مندا دەفڕن،
وای لەدەست ئەستێرەکانی سبەینێ.
یاقووتێک زەمانێک دەدرەوشێتەوە من لێرەنیم
تووتییەک ڕۆژێک دێتە زمان، من سەفەرمکردووە
سمۆرەیەک شەوێک دەچێتە سەر دارێک، من لەمێژە خەوتووم

دەڕۆم و گوڵەکان دانیان بەگوناهی خۆیاندا نەناوە
دەڕۆم و هیچم لە ئەشکەنجەی ئەم ئاوە دەستنەکەوت،
هیچم لە شکاندنی سەدەفەکانی ئەم بایە دەستنەکەوت؟
دەڕۆم و نەمزانی حەقیقەت لەناو ئەم بازاڕەدا بەکوێدا غەیببوو
نەمزانی ئەم مۆمە لەگەڵ چ کتێبێکی تاریکدا هەڵگیرا

نەمزانی پاکانەی بەهارم لەگەڵ دۆسییەی چ شەیتانێکدا لێونبوو.
ئاە تریفەکانی سبەینێ بەسەر کۆدیتایەکی تردا هەڵدێن،
وای لە تریفەکان سبەینێ
بنوون... ئەی زەرنەقووتەکان بنوون
ئێوە ڕۆژێک لە هێلکەکان دێنەدەرێ، من لێرە نیم

سەیری سێبەری هەنگاوەکانی من مەکەن، لەنێوان جۆگەکاندا
بەناو بۆشایی مندا مەفڕن، لەنێوان درەختەکاندا
غونچەکانی بەیانیش لە گەرمەی شۆڕشێکی تردا دەگەشێنەوە
ئاونگەکانی شەویش لەسەر لێوی بەیانییەکی تردا دەنیشن
من لەو بەیانییەدا لێرەنیم...
من لەو شەوانەدا جێگام لە خەڵوەتەکاندا خاڵییە... خاڵی
(وای لەخونچەکانی بەیانی... وای لە ئاونگەکانی شەو) .

# جەلاد و گۆڕهەڵکەن

لە گۆڕەکان نزیکبەرەوە، لەبەر ڕۆشنایی مردندا من جوانتر تێدەگەم
جوانتر پەپووسلێمانکە ترساوەکانی سەر شانت دەبینم
جوانتر پەپوولە بێکەسەکانی سینەتم لێدیارە
دەمێکە ئەم شەرابەم داناوە پێکەوە بینۆشین
من پەراوێزی کتێبێک بووم، ڕستە بەڕستە باسی ئاوابوونی تۆی دەکرد
پەراوێزی شەیتانێک بووم، وەک سەوزی لەناو گیاکانی ڕوحتدا خەوتبوو
بەشێک بووم لە تاعوونی درەختە پەژموردەکانی باغی تۆ
(بەڵام دوور بەدوور دەمناسیت... دوور بەدوور دەتناسیم)

نزیک لە مۆمەکان بوەستە... بافریشتەکان لە چاوتدا ببینم
(ئاە... هەر ئەوبوو... ئەو... ئەو پیاوەی
شەوێک هات و سەبەتەیەکی خاڵی دامێ،
فێریکردم چۆن بەرچنەکان پڕکەم،
گووتی: ئەم میوەیە بۆ تۆ... ئەم ڕەزە تۆ شەرابەکەی بگرە...
ئەم دارە با لە حەوشی تۆدا بەربگرێت
ئیتر هیچی دەربارەی باڵندەکان پێنەگووتم
بەیانییەک هات و کیسەیەکی دامێ، فێریکردم چۆن زەیتونەکانی رۆح بچنم،
تووی وەریوی ڕەشەباکانی ئەو هەڵگرم
گووتی: (ئەوەی لە من جێدەمێنێت بۆ تۆ)
ئیتر هیچی دەربارەی ڕۆحی برینداری گوڵەکان نەدرکاند
نیوەڕۆیەک لەسەر ئەسپێکی سپی خۆی کرد بەناو بازاڕەکاندا... چی جوان بوو، لە قافڵەکانی «ئەسفەهان»... چی جوان بوو لە تەمە سپییەکانی «کەشمیر»، لەئاوریشمی پاکی حەرمسەراکانی «کەلکەتا»، لەگەڵ هالاوی دەستە خوێناوییەکانی خۆیدا کردییە دیاری.
هیچیشی سەبارەت بەزامی سەر رۆحی من نەگووت

سەعاتێک بەر لە خۆرئاوابوون، لە قەراغ دوورگەیەکی تاریکدا دابەزی، توتییە زمانزانەکانی حکایەتی هەموو دەریاکانیان لەبەربوو، خوودە دێرینەکانی ئاوی کردەسەرم، کڵاوی پڕ گەوهەری شەوی هێنا، سەعاتێکی دامێ بۆنی ئەستێرەی لێدەهات.
گومانم لە دەستە پڕ لە پشکۆکانی نەکرد
گومانم لە دەستە پڕ لە خۆڵەمێشەکانی نەکرد

درەنگانێ، گووتی:
من و تۆ چەندە تەنهاین، مردن چ ماشێنێکی سپییە، مردن چ درومانێکی وردە.
من کفنەکانم حیسابێ نەکرد
نەمگووت:
کوا ڕوخسەتی خودا
کوا ڕوخسەتی زەمین
کوا ڕوخسەتی دەریا
شەوێک هاتە بەرپەنجەرەکانم گووتی: کاروانێک بەرەو بەهەشت دەبەم.
وەرە گوارەکانی ئەم حەقیقەتە داکەنین،
وەرە مستیلەی ئەم ئایەتانە دەربهێنین،
وەرە و بازنی ئەم شاهنامەیە کفنبکەین
باوەڕمپێکرد
دەرگاکانی منی بۆ قەڵەڕەشکەیەک کردەوە لە باروتی قیامەتدا هەڵکشاو
بۆ قوربانییەک منی لە خەو هەستان، لە فەیزی شەیتاندا نوقمبوو
گووتی: کوا هالاوی سەرکەوتنی ئەو بۆ ئاسمان؟... کوا نرکەی دابەزینی ئەو بۆ ژێر خاک؟
من بۆی گەڕام
گووتی: وەرەو بامەرگ بکەین بەشارێک، بیکەین بەشەقام، بیکەین بەژوورێ پڕبێت لە وەفا
من مەرگم لە گەڵدا دابەشکرد... ژوور بە ژوور... شەو بە شەو... دەرگا بە دەرگا.
(من کوێرانە میوەکانم کۆکردەوە... کوێرانە)
ئەو گووتی: گۆڕەکان هەڵکەنە، ژیان بەکێلەکانت برازێنەوە
ئەم هەموو دوودڵییە لەپای چی؟ ئەم هەموو ترسە چ تامێکی هەیە؟

**گۆڕێک، بۆ مانگرێکی سەرشەقامی مانگ**
**گۆڕێک بۆ جەنگاوەرێکی سەر سەنگەری بەهار**
**گۆڕێک بۆ ئەو پیاوەی لەپاڵ پەرژینەکانی وەهمدا دەگری**
**یەکێکیش بۆ ئەوەی لە دەستەچەپی هەتاودا نوستووە**
**یەکێک بۆ ئەوەی لە کوچە مەرەکەباوییەکانی خەیاڵدا دەمرێت**

**لەوبەریش**
**گۆڕێک بۆ پیاوێک کە بەجادە سپییەکانی یەقیندا تێدەپەڕێت**
**گۆڕێک بۆ ئەو منداڵەی لە سێوەکانی دوێنی پەشیمانە**
**گۆڕێک بۆ ئەو مەستەی لە شەرابی ئێوارێ حاڵی نابێت**
**گۆڕێکیش بۆ ئەو باغەوانەی هەمیشە لە ترێکانی بەیانی بە گومانە.**

**ئیدی ڕۆیشت و هیچی دەربارەی ئەم جەنگەڵە نەدرکاند**
**نەیگووت، خەم مەخۆ گەر هاتوو خاڵی بوو لە مردن**
**خەم مەخۆ گەر هاتوو خاڵی بوو لە کفن.**

## جەلاد لەگەڵ نیگای کونەپەپوویەکدا دەدوێت

**تۆ ئەی ئەوەی توانەوەی پارچەیەک غەمی لە پەرداخێکی زوڵمەتدا**
**نیگات کلۆیەک شەکر بوو لە دەعوەتە تاڵەکانی مندا**
**مەفرە بابرینەکانم نەبێتە گەرد، فڕینی تۆ شەکەتبوونی دەستەکانی منە**
**پێم بڵێ: بۆ مرۆڤ بۆ ساتێکیش چییە لە چێژی تاریکی تێر نابێت؟**

ئاخر تاکەی بتوانم ببینم... هەیهات تاکەی بتوانم ببینم
کە لەزەتی بینین وەکو لەزەتی تەماشای سووتانی کێڵگەیەک پەموو وایە
وەکو لەزەتی کەوتنەخوارەوەی مراوییەک وایە بۆ بەردەم چەقۆیەکی خەوتوو
کە بینین ناهێڵێت بەنۆتەی عەزابی کۆترەکان بگەم
گوێم لە هەنسکی گێژەڵوکەیەکی نەخۆشبێت لە هەناسەی گورگێکدا
تۆ ئەی ئەوەی نیگات کلۆیەک هێمنی بوو لە سووتانی مندا
بۆ ئەم تاریکییە پردەکەیت لە حیکمەت
تاریکی کوا بەرگەی حیکمەت دەگرێت؟

گەر شەوێک دیوارەکانی زوڵمەت درزیانبرد گوناهی نیگاکانی تۆیە
گەر شەوێک من هەموو نهێنییەکانم بینی گوناهی چاوەکانی تۆیە
ئەو چاوانەی لەمێژە حەزدەکەم قەرزیانکەم

بەڵام بەبێ ئەو دەنووکە خەمگینە، بەبێ ئەو باڵە هێمنانە، بەبێ ئەو ئارامییەی پڕە لە سێبەری رۆحی سۆفییەکان... لێیاندەترسێم
ئەی ئەوەی نیگات کلۆیەک بەفرە لە دۆزەخی مندا
من لە چاوەکانت دەترسێم.

## جەلاد و پەپوولە

بچوکی ڕوحی تۆ، بچوکی هەموو جوانییەکانی وجودە
ئەی مرواری کۆنتر لە سەدەف
من نەشتەرێکم لەپێش ژیانەوە دەڕۆم.
تۆ پێکەنینێکیت پێش بەختیاری کەوتوویت

هێندە باڵەکانت مەدە بەیەکدا، ژیان کوا بەرگەی تۆفانی وادەگرێت
ئەم هەموو نازە بەسەر پایزدا چ مانایەکی هەیە؟ کە مەوداکان لێرەوە
تاکو قیامەت ماڵی تۆن.
ئەی ئەوەی کەرنەڤالە دڕندەکانی بەهار پڕدەکەیت لە نەسیمێکی دوور
(نهێنی من وەربگێڕە سەر زمانێک گوڵەکان نەتوانن بیخوێننەوە)
تۆ پشوویەکی خودایت لەنێوان دروستکردنی دوو دڕکی باغچەدا
منیش بێزارییەکی خودام لەنێوان خوڵقانی دوو کۆتردا
هەر من و تۆ دەگەینەوە نەوسەری دونیا
هەرمن و تۆ لەوسەری خەلیقەتەوە، کورتکراوەی هەموو تەفسیرەکان
دەهێنینەوە بۆ باغچە
یەکی کتێبێکی کورتکراوەی تۆفانەکانمان پێیە
لەوێدا سەر لەنوێ بەسەر بازنەکانی وجوددا دابەشدەبین
تۆ بۆ جوانییەکی کورت لەنێوان مەنجەنیق و تەرزەدا
من بۆ وەستانێکی بچوک لەنێوان سڵاوی دوو غونچەدا.

## جەلاد و بوکەشوشە

لە بێدەنگی خۆتا گەلێ بەختەوەریت بڕی
لە یەک نیگادا هەموو دنیات کورتکردەوە
ئەی ئەوەی ڕۆژەکانت لە جەنجاڵی سروشتەوە هێنایە سەر یەک بزەی
نایلۆنی
ڕەحمێ بەخرۆشانی خوێنی من بکە کە هێشتا شتێ لە قریشکەی
پلنگەکانی جەنگەڵی تیاماوە.
نیگا شینەکانی تۆ وایکرد، بەقووڵی بیر لە وەستانی سەر دەریا بکەمەوە

**کە ئاو ئەمڕۆ توحفەیەکی کۆنە و هەتاو پاشەکەوتی ناو دەغیلەی غونچەکانە.**
**ئەو دەستە بچوکەی تۆ وایکرد، دەستبخەمە ناو دەستی قەڕنە پلاستیکییەکان**
**ئەو لێوە چکۆلەیەی تۆ وایکرد، ئەم بەیانییە باغەیە ماچبکەم.**
**تۆ بەتەنیا بەرچایی نایلۆنت لەگەڵ خواردم**
**تۆ بەتەنیا ئەم شەوی خەزەفەت لەگەڵدا بەشکردم**
**بمسپێرە بەئاوریشمی ئەو پێڵوانەی لە هیچی وردەبنەوە**
**بمسپێرە بەو دڵەی لە هیچی تێدەفکرێ**
**لە وەستانی خۆتدا هەموو جووڵە گەورەکانی وجود کورتکەرەوە.**
**ئەی ئەوەی هەموو ژیانت یەک زەردەخەنەیە،**
**هەموو مێژووت سوڕانەوەی دوو دەستی چکۆلانەیە**
**هەڵهاتنت لە عەدەم ترازانی قاچێکە لە جومگەیەکی نایلۆنی**
**هەموو مانات دزینی زەردەخەنەیەکە لە منداڵێک (هێشتا بڕۆ گرژەکانی ئاسمانی نەبینیوە)**
**بەبێ چەتر بەژێر ئەم بارانەدا بڕۆ کە هیچ تۆفانێ تۆ تەڕناکات**
**چیەیەک چییە دەربارەی مەحشەر مەیبیستە**
**کە تۆ درۆی مردن و زیندووبوونەوە نازانیت**
**(تۆ بەچ فێڵێک هاتیت و بەلای ژیاندا ڕابوردیت و سڵاوت لە ئێمە کرد و نەشهاتیتە ماڵمان)**
**فێرمکە منیش وەک تۆ بەدەوری ژیاندا پێچبکەمەوە**
**فێرمکە بەدەوری ڕۆژ و هەفتەکاندا پێچبکەمەوە**
**بەدەوری لەدایکبوون و فەنابووندا پێچبکەمەوە**
**کە ژیان هەمووی ژوورێکە وەهمی پەنجەرەکانی دەگۆڕێت**
**وجود هەمووی وێنەیەکە وەهمی شێوەکانی دەگۆڕێت.**

# جەلاد و تاریکی

هەموو ڕوناکییەک بریتییە لە ئەتککردنی حەقیقەتێک
هەموو چرایەک خەنجەرێکە لە ڕۆشنایی
هیچ مۆمێکیش نییە پڕ نەبێت لە لاوانەوەی بەختیارییەکی کوژراو
(من لەمێژە ئەمەم گووتووە... بەڵام کەسانێک هەن تێناگەن)
چ جوانە سوراحییەکانی مەرگ لەدەستی ئەو باغەوانەدا کە من ئاودەدات
چ جوانە برین بەسەر یەخەی ئەو دۆستەوەی سڵاوم لێدەکات
کەسانێک هەن تێناگەن، مردن پەنجەرەیەکی چکۆلەیە بەسەر تاریکییە جوانەکاندا
ژان ڕوانینێکی ئێوارانەیە بەسەر گۆمێکی غەمگیندا
گریان دەفتەرێکە وەکی دەفتەرەکانی دیکە
دەیکەینەوە، تیادەنوسین... تیا پێدەکەنین و دەگرین
فرمێسک مەلەکردنێکی شەرمنانەیە لەگەڵ مراوییە ساواکانی بەرماڵدا
دەستدانە لە قەراغە زمرودییەکانی ژیان
بەڵام کەسانێک هەن تێناگەن
تێناگەن بۆ گەیشتن بەڕاستی
قەترەیەک عەزاب بەسە بیکەینە گوڵدانەکانەوە
تێناگەن بەیەک فڕین، لە حەقیقەتی هەموو باڵەکان تێدەگەین
بەیەک لێو ، درۆی هەموو گووفتەکان
درۆی هەموو ماچەکان دەناسینەوە.

من ئەو ڕۆشناییەم لادا کە ئابڕوی حەقیقەت دەبات

لەوێ لە تاریکیدا
من و حەقیقەت وازیدەکەین
من و ئەو جۆلانێدەکەین
(لەو جێگایەدا کە هیچ شتێ دیارنییە... بگەڕێ، بێگومان حەقیقەت دیارە)

تاریکی ئەوماڵەیە خوداکان بۆ خۆیانیان دروستکردوە
من لەو ماڵەدا لەتەنیشت خوداکانەوە دەژیام
خەلیقەت لەوێدایە
لەناو تۆڕێکی چکۆلەی تاریکی کە لە دەریایەکی مەزنی تاریکیدا گوڵدەکات
لەوێ لە بەهەشت، لە باوەشی جوانترین تاریکیدا، کە گوڵ وەک پۆلا دەزرنگێتەوە... بەیەکدەگەین.

باتێبگەین حەقیقەت مێزێکە لەدەوری دادەنیشین و یەکتر نابینین، حەقیقەت بۆنکردنی خوێنی یەکدییە لە تاریکی ماڵێکدا کە ماڵی کەسمان نییە

لەوێ لە تاریکیدا دەرگاکان هەموو کراوەن
دەتوانیت لە شوێنی خۆتدا ڕاوەستیت، دڵنیابە من دەبێت لەدوت بگەڕێم
تۆ دەستەکانی من نابینی.
چونکە ئازار شکاندنی دەرگای جیهانێکە بەرەو جیهانێکی تر
دەشێت بۆنی شکۆفەی خنکاوی ناو دیدەم بکەیت
هەست بەئاوازی خوێنم بکەیت کە لە خوڕەی باران دەچێت
بەڵام نامناسیتەوە.

من بەشیعرێکدا ڕانەبوردووم
لەژێر باڵەخانەیەکی ترساوی ژێر خۆردا نەخەوتووم
شەو لەبەر پەنجەرەیەکی فێنکەوە سەیری سەوزاییە دوورەکانم نەکردوە
بەڵام لێرە لە تاریکیدا
کە گوڵ و گیاو باڵندەکان وەکو زەنگ دەزرنگێنەوە... دەژیم
گەلێ دوورم لە ڕۆشنایی... گەلێ دوورم... گەلێ دوور.

# جەلاد و فڕین

منیش ڕۆژانێک بوو دەفڕیم
بەڵام یادم نییە کەی دواهەمین جار نیشتمەوە
ئەی شاهەنشاهی حیساباتی فڕین
لیستی قەرزەکانی خۆمم بۆ بنێرە
پێدەچێت من جارێکی تر نەفڕم
بەڵام یادت نەچێت منیش ڕۆژانێک بوو دەفڕیم
دەنووکم لەو قەترە خوێنانەدا وەکو گێلاس لەچاوی درەختەکان دەهاتنەخوار
باڵم بۆنی ئەو پرتەقاڵانەی لێدەهات کە کاتی چەخماخە لەسەبەتەکاندا دەوەرین
بۆنی ئەو هێلکە غەمگینەی لێدەهات کە لە هێلانەیەکی دووری شەوا فەرامۆشە
بەڵام نازانم بۆ نیشتمەوە؟
زۆرجار ئەستێرەکان ناچارتدەکەن نەفڕیت. زۆر جار ئاسمان تۆی ناوێت.
زۆر جاریش عەرد بانگتدەکات. بەڵام لەبیرمە باڵەکانم وەکو ئەسفەنج

بارانیان دەمژی و وەکو پشکۆ لە بروسکەکاندا دەگەشانەوە.

تۆ ئەی ئەوەی من لەسەر فڕین سزادەدەیت
پێم بڵێ من باڵەکانی خۆم چۆن ونکرد؟
لەیادمە خوشکە چکۆلەکانم دەفڕین
داپیرەم کە قاچی نەبوو دەفڕی
لەیادمە هاوڕێکانم دەفڕین

تۆ ئەی ئەوەی من لەسەر فڕین سزا دەدەیت
هەموو یەکێ ڕۆژێک لە ڕۆژان فڕیوە
من خوشکەکانم هەریەکەی بەرەو ئاسمانێ فڕین
داپیرەم لەگۆڕستانێکی دووردا نیشتەوە
باوکم ڕۆژێک فڕی و نەگەڕایەوە.
هەریەکەی لە شوێنێک باڵەکانی خۆی وندەکات/ هەیە لەناو پەپوولەکاندا دەخەوێت و باڵەکانی لێدەدزن/ هەیە دەیخاتە نێوان کتێبێک و لەیادیدەچێتەوە/ هەیە لە جەنگدا دەیخاتە ژێر سەری خۆی و ئیدی هەڵناسێتەوە/ هەیە قومار لەسەر باڵی تر دەکات و دەیدۆڕێنێت/ هەیە دەڵێت: بۆچی بفڕم؟/ هەیە دەیدات بەدەسگیرانێک و ئەویش دەیکاتە دیاری بۆ دەستگیرانێکی تر.

تۆ ئەی ئەوەی من لەسەر فڕین سزا دەدەیت
پێم بڵێ باڵەکانی خۆت کوا؟
مەڵێ تۆ دەربەستی فڕین نیت... مەڵێ
من پێتدەڵێم، حەزدەکەم لە نێوان وانەی فڕین و نیشتنەوەدا بمرم، حەزدەکەم کاتی نغرۆبوون پەنجەیەکم بەئاسمانەوە بێت، خۆرئاوابوون

هەر پەڕێکم بەدەم مەلێکەوە بێت، بەبال غوباری سەر هێلانەکان بڕەوێنمەوە، بەدەنووک مرواری بەجێماو لە خەونی فڕیوی قوڵنگەکان دەربهێنم.
تۆ... تۆ ئەی ئەوەی دەربەستی نیشتنەوەی من نیت لەم دۆزەخەدا، پێمبڵێ:
گەر ئاسمان بەقەد بۆنی عەترێ بڕنەکات
چۆن بگەمە ئەو ئەورەسانەی کە نامناسن؟
تۆ کە دەربەستی دەستە خوێناوییەکانی من نیت
بۆ بۆ شوێنەواری باڵەکانم ناگەڕێیت؟
بۆ لە شوشەی شکاوی فڕینم تێناگەیت، لەسەر ئەم شۆستەی سەفەرە؟
بۆ ناڕوانیتە پەرداخی خاڵی نیشتنەوەم لەم تەمتومانەدا؟
تۆ ئەی ئەوەی حیسابی ساتەکانی فڕینم لەگەڵ دەکەیت
دەفتەری قەرزەکانی خۆمم بۆ بهێنە
بێنەوەی سەیری چارەنوسم بکەم
هەموو ئاسمانە خەیاڵییەکانی خۆمت بۆ ئیمزادەکەم
شکۆفەی هەموو باڵەکانی منیش بۆ تۆ
ئەگەرچی ڕۆژێک لە ڕۆژان منیش وەکو تۆ دەفڕیم
وەکو تۆ ئاسمان ئاشنابوو لەلام
ئاشناتر لە خوێن، ئاشناتر لە برین، ئاشناتر لە نەشتەر
بەلام من کە باڵەکانی خۆم لە غروری نیشتنەوەیەکدا ونکرد
پێناچێت جارێکی دی بفڕم... پێناچێت... نا... پێناچێت.

# یەکێک لە جەلاد دەپرسێت:
# «ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، ئێستا چ سەعاتێکە؟»

ئەی کوڕی ئەو ڕۆژانەی بەپاڵتۆی چەرمەوە لەبەردەم غوبـاری دەریـادا دەوەسـتان

ئەی کوڕی ئەو بەیانیانەی بەچەپکێ یەقینەوە لەبەردەم ئاوێنەکاندا ڕادەبـوردن

سەریان لە پەنجەرەی بەهارەوە دەردەهێنا و دەیانگووت:

بەجێمانمەهێڵە، ئەی زەمەن...

لە من مەپرسە ڕۆژەکان بۆ وەها بێباکن... بۆ؟

ئەی کوڕی ئەو ئێوارە ناسکانەی لە بەلەمەکان دادەبەزین و ماچیان بۆ پاسارییە ترساوەکانی کەنار هەڵدەدا/ چەمکی ئاوریشمی کراسەکەیان لە بادا دەشنایەوە/ بۆ لە من دەپرسی... بۆ؟ ئەمڕۆ بۆ لە ڕۆژانی دیکە ناچێت؟ مەپرسە، بۆ ئێستا ڕۆژەکان وەها سەرەڕۆن؟

من دەمەوێت لەیادیکەم...

دەمەوێت تووی بەجێماوی ناو قاپەکانی داپیرەم لەیادکەم/ لەیادیانکەم... بۆنی خەیاری برینداری ژێر سەرینەکانی منداڵیم/ تامی ئاوی مەرکانەکانی نیوەڕۆی هاوین/ زەردەخەنەی ئەو شەتڵە مێخەکە بچوکانەی بیریان لە سێبەری ئێواران دەکردەوە/ لەیادیانکەم... ئەو شەوانەی کاتژمێرەکانیان بۆنی تونکلی ئەو سێوانەی لێدێت، کچێک لە پەنجەرەوە فڕێیدەدانە سەر شۆستەکان/ شەوی ئەو کاروانانەی هەرمێکانیان دەڕژایە بەردەرگا/ نا... هەرگیز لە زەمەنی من مەپرسە کە سەعاتەکانی تێکەڵاوبوونی

خورپەی ئاو و ئاسمان بوو لەگەڵ یەکدا/ تێکەڵاوبوونی خورپەی ئینسان و کوچەبوو/ بڕۆ بەرەو ئەو بەیانییەی هێشتا لەبەردەم ئاوێنەکاندا خۆی جواندەکات/ من هێشتا سەرم لە وەرزەکانی خۆم دەرناچێت/ سەرم لە بەیانییە وەنەوشەییەکانی خۆم دەرناچێت؟ سەرم لە لێدانی ئەم کاتژمێرە گەورانە دەرناچێت (کە هەمووشت لە پێشدەمیاندا دەگەڕێتەوە)/ سەعاتی ئەم نیوەڕۆیەم بۆ ناخوێندرێتەوە کە هەتاو ئارەزووەکانمان بەئاگادێنێتەوە/ من لەپێش سەعاتەکانەوە دەستدەبەم بۆ ڕۆژەکان/ من بەر لە شەو دەستدەبەم بۆ ئەستێرەکان/ ئەوەی هەنگاوێکیش لە پێش خۆرەوە هەڵبێت ئەستەمە میقاتی مەحشەرەکانی دوای خۆی بزانێت/ ئەوەی هەنگاوێک بەر لە مانگ هەڵبێت ئەستەمە هەموو کۆتاییەکانی شەو ببینێت/ من پیاوێکم نیوەڕۆیەک پێش لە زەمەن لەخەو هەستام/ ئیدی سەعاتەکانم بۆنی فەنابوونێکی زووتریان لێهەڵدەستێت/ هاوڕێم... گەر لێرەدا هەتاو هەبایە من بەر لە تۆ دەمدۆزیەوە/ درەختەکان میوەیان بگرتایە من بەر لە تۆ تامدەکرد/ ئەگەر کۆڕی فریادرەسی نەورەسەکان هەبایە من لەوێ بووم/ ئەگەر ڕەزمی ئەو پیاوانە هەبایە کە لە شکاندنی بەستەڵەکی بەردەرگاکانی خەیاڵ هاتوونەوە... من لەوێ بووم/ من لەگەڵ ئاوێکدا هاتم بۆنی سەدەفە ساغەکانی زەمەنی لێدەهات/ تەرزەی گەردانەیەک بووم ساتە بلورینەکانی نەپچرابوو/ کوڕی بەلەمێکم، زەمەن بەکەنارەکانیدا دەڕوات/ نا دابەشنابم/ گوڵەکان هەموو بەسەر سەعاتەکانی باغچەدا دابەشنابن/ نەورەسەکان هەموو بەسەر چرکەکانی ئاودا دابەشنابن/ هەموو ماسییەکان بەسەر دەریادا دابەشنابن/ ئەی ئەوەی لە من دەپرسیت: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە... من بەسەر ڕۆژەکاندا دابەشنابم.

# جەلاد لەمەرگی ئەستێرەناسێک ڕادەمێنێت

تــۆ ئــەی ئــەوەی هەمیشــە سەرزەنشتی تەفســیرە ســادەکانی مــن دەکەیــت بــۆ ژیــان، وەکــو مــن مرۆڤــت بینیــووە کاتــێ چارەنوســی خــۆی بەگومــان زەخرەفــەدەکات؟
بینیووتە کە دیکۆر بۆ دۆزەخەکانی پاشەڕۆژ دادەنێت؟
کە مێخەک بۆ قیامەت دەچێنێت؟
مــن لــەو ســاتانەدا مرۆڤــم بینیکــە خەریکــی کۆکردنــەوەی گــوڵ بــوو بــۆ خوێنجمانــی عــەدەم. ئــەو گــوارە ئاگرینــەم بینــی لەگــەڵ ئەگریجەکانیــدا هاتبوونەخــوار. شــوعلەی نێــو نیگاکانیــم بینــی ئامادەبــوو بــۆ تۆفــان
ئەی ئەوەی لۆمەی من دەکەیت... من لە دەلاقەکانەوە سەیرمکرد
هەموو ژیانم لـە ڕاچڵەکانـی لمێکدا بینـی، ئێوارەیـەک ئەورەسێکیان لەسـەر دەسووتـان
هەموو ژیانم لە قۆزاخەیەکدا دۆزییەوە پەپوولەیەکیان تیا خنکاندبوو.
هەمـوو ژیانـم لەژێـر باڵـی پاسـارییەکدا بینـی لەبـەردەم ئینجانەیەکـدا کوژرابــوو...
تۆ ئەی ئەوەی لۆمەی من دەکەیت
ئەوەی ئاوەها بینیت، چۆن دەتوانێت لە ئاسمان گومانئەکات؟
چۆن دەتوانێت لەسەر ئەم میزانی وەفایە، سەنگی بەیانییەکان نەکێشێت؟
ئەم بەیانییە کە وجود زارێکی ئەرخەوانییە لە پەرداخێکی چاوەڕوانیدا
کڵاوێکە لەسەری ڕێبوارێکدا هەموو فەنتازیاکانی دەریای خواردۆتەوە
بۆنێکە لە پەرداخی مەیفرۆشێکدا هەموو دەلاقەکانـی بێستانی لەسەرخۆی

داخستووە
ئەوم بینی خۆی گوڵێک بوو لە وەهمی پەپوولەیەکدا
ویستم لە حوزنی ئەستێرەکانەوە بەرەو ماتەمی ئاونگێک ڕایکێشم
بەڵام ئەو هەمیشە ئاسمان بۆ نزیکترین خونچەی بەردەمی خۆی دەگەڕا
من و ئەو بۆ ڕەگی یەک موعجیزە دەگەڕاین
بەڵام لەبەیانی وەهادا کێ ڕەگی درەختێک دەبینێت کە لە ڕۆحی خۆیدا لێدەدات.
من بینیم ژیانی وەک سێوێک دەخستە خوار و تەماشای بنی ئەو گۆمەی دەکرد کە لە دەستەکانی خۆی خاڵیتر بوو/ ژیانی وەک سێوێک فڕێدەدا و سەیری سێبەرەکەی خۆی دەکرد لە مەرگدا/ سەیری باغی دەکرد لە کاتی شکۆفەی هیچیدا/ سەیری نوری دەکرد لەسەر لێوی خونچەکانی تاریکی/ بینیم کە بە باڵندەکانی گووت با لەسەر ئاوەژووکردنەوەی دەستەکانی ئەم ڕەشەبایە یاریبکەین/ مەچەکی ئەم سامالە ئاسنینە بگرین کە ڕۆحمانی هەراسانکردووە/ ئەو گووتی: کەس بۆی نییە تاسەر لە دەرگای ئەم بەیانییە بدات کە بەیانیان شوێنی ترسەکانی منە لەتەک سێوە ئاسمانییەکانی بەرماڵدا/ بەیانیان شوێنی نەشتەری منە لە سینەی ئەم باڵندەیەدا کە هەرگیز لە کەشکەشانی ئەفسوون نایەتەخوار.
(ئەو هات و کۆتر بەکۆتر سیحری فڕینی خستەسەر کتێبەکان)
ئەو دەیگووت: ژیان، کەمۆڵەیەکە پڕێتی لە غوباری دەریا... ژیان، شینە وەکو چاوی ئەو ئەورەسانەی بەدەنووک غەزەل لەسەر لم دەنوسن... ژیان، دێڕێکە نیشتنەوەی ڕیشۆڵەیەک لە ناوەڕاستی باغچەدا پچڕاندوێتی.
من ویستم لە حیکمەتی ئەو ئاوە بپرسم کە لە زمهەریرەکانی ڕۆحیدا نایبەستێت
هاتم جیهانم نوختە بەنوختە، وێرگوڵ بەوێرگوڵ لەگەڵدا ڕاڤەکرد.
بەڵام ئەو دەیگووت: ژیان، کتێبێکە فریشتەیەک لەسەر سینەی منداڵێکی

لە پایزدا خەوتوو چاپیدەکات، لەسەر لێوی گوڵێکی خەمگیندا دەینووسێت، جگە لە تۆفانیش هیچ بەرگێکی دیکە ناگیرێتە ئەم حەرفانە، جگە لە خوێنسار خۆشنوسێک نییە بینوسێت، جگە لە شەو چاپخانەیەک نییە ئەم هەموو گوڵ و پەشیمانییە چاپبکات.

(ئەو هێندەی ڕوانییە دووری، ڕۆحی بوو بە بۆشاییەکی لازۆردی)

ئیدی هات و گووتی: وەرە لە خوێن و عەزاب ڕزگارمکە، وەرە بەم ئەشکەنجەیە ڕۆحلەبەرە لازۆردییەکانی سینەم دوورخەرەوە.

تۆ ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە، پێمبڵێ:

جگە لە ئازار چ شتێک خەمی ئەستێرەناسێک دەڕەوێنێتەوە کە هەمیشە سەیری بورجە مۆرەکانی ژیان دەکات و دەڵێت: ژیان هەنگاوی پاسارییەکە، دەنکە تەرزەیەک پچڕاندوێتی.

ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە، بۆ لۆمەی من دەکەیت کاتێ لە مەرگی ئەستێرەناسێک ڕادەمێنم خۆی دەپارێتەوە دیوارە سپییەکانی ژیانی بۆ برازێنمەوە... خۆی دەپارێتەوە کێشیبکەمە سەر ئەم خاچانە... خۆی دەڵێت: ژیان ماڵی چکۆلانەی جاڵجاڵۆکەیەکە، پریشکی کورەیەک سووتاندوێتی.

بۆ لۆمەی من دەکەیت کە لەزەتە نهێنییەکانی ئەم بەدبەختییە تەفسیردەکەم

من گووتم:

سەلامت لێبێت ئەی ئەوەی بەدەست سوڕانەوەی ئەستێرەکانەوە داماویت...

بۆ لە فەلەکی ڕۆحی خۆت ناپرسیت کاتێ بەدەوری عەدەمدا دەسوڕێتەوە؟

سەلامت لێبێت ئەی ئەوەی دوورو نزیکی هەسارەکان لەیەکتر دەپێویت

بۆ ئەمبەرەو بەری پەنجەرەکانی ژیان ناپێویت؟

**بۆ دوورو نزیکی لەدایکبوونی گوڵێک و سووتانی شەونمێک ناپێویت؟**
**سەلامت لێبێت، سەلام...**
**ئەی ئەوەی ڕەنگی شەبەنگە دوورەکانی ئەوپەڕی دونیا دەخوێنیتەوە.**
**بۆ ڕەنگی ئەو فرمێسکانە نابینیت، لە چاوی کەسێکدا گەنجینە خاڵییەکانی ژیان دەگەڕێت؟**
**تۆ ئەی ئەوەی وێرگوڵ بە وێرگوڵ مانای ئەستێرەکانم لەگەڵدا تەفسیرکردیت... تا ناو ئەم باغچەیە وەرە**
**کە باغی حیکمەتی جەلادێکە... ئامۆژگارێکی شەرمنی دەریا و مامۆستایەکی سەبووری ئازارە...**
**چونکە جگە لەم دەرگایە، دەرگایەکی دیکە نییە**
**بمانبەخشێتەوە بە مانا... بمانبەخشێتەوە بە حەقیقەت... بمانبەخشێتەوە بەباغەکان.**

# یەکێ لە (جەلاد) دەپرسێت: منداڵی چییە؟

**منداڵیم ڕاوەستان بوو لە ناوەڕاستی کۆڵانێکی پڕ لە عەتری سادییانەدا، زەنگێکی سپی لەوسەری کوچەی تەنهایی منەوە بەهەموو عیشوەی خۆیەوە لەپێش چاوی مندا لایلایەی بۆ سنەوبەرەکان دەکرد. من لەژێر دارگوێزە وەنەوشەییەکاندا نوستبووم، خەوبینێک بووم لە نزیک درەختێکەوە، لە نزیک سێدارەی ئەستێرەیەکەوە. بەڵام چی دەکەیت؟ کاتێک عاشقانە دەتەوێت ڕووی فانۆسەکان بەرەو ڕووی کتێبەکەت وەرگێڕیت، دەتەوێت ڕەشەبا بۆنی ئەم دەفتەرەی تۆ بەرەو شەقامی ڕیایی نەبات، دەتەوێت بەتەباشیرێکی سپی دیوارەکانی بەهار ئاشتبکەیتەوە، بەشەماڵێک خەرمانێک لە وەرزێکی دووردا بکەیتە دۆست، نە سێبەرێ، نە**

پێپلکانەیەک، نە هەیوانێ... یارمەتیت نادات... یەکێکیش بەتەکتدا ڕادەبورێت و دەڵێت: تۆ بۆ بۆنی خوات لێنایەت، ئەی منداڵ؟.
کە دەتەوێت لە کورەی بەجێماوی نیوەڕۆ حەقیقەتێ گەرمبکەیتەوە، لە کانییەکانی ئێوارەی گێلاسی پرسیارەکانت بشۆیتەوە، قووڵایی ڕاڕاییەکانت لەنێوان ئەمبەرە و بەری دوو پشوودا بپێویت، دەمامکەکانی خۆت لەبەردەم ئاوێکدا فڕێبدەیت، خۆت بشۆیت... نە پەیژەیەک، نەکتێبێک، نەدەستەسڕێکی خاوێن نادۆزیتەوە... یەکێکیش لەوپەڕی باغچەوە هاواردەکات: تۆ ئەی منداڵ، بۆ سورەتێکی خودات لەبەر نییە، بۆ ئایەتێک نازانیت؟
لە خەونێکدا دەچیتە شارێکەوە ڕازاوە بەبەخشندەیی؟ دەڵێیت، خوایە ئیمپراتورێک تەڵی شقارتەم لێقەرزبکات بۆ مۆمی، کچێک قەلەمێکم لێوەرگرێت بۆ ئاشنایی، خاتوونێ چاوێلکەیەکم لێبستێنێ بۆ نیگایەک... دەڵێیت خوایە، زێڕپۆشێک عەیارێک لە نوری لێجێبمێنێت، گوڵەکان قیراتێ جوانیان بیربچێت، کە ڕادەبیت نەمۆمێک دیارە، نەئاشناییەک، نەمەرهەمێک، یەکێکیش بەڕاگوزەر پێتدەڵێت: بۆ شەرم لە هەنگوینی باغ ناکەیت، بەڕووتی لەناو ئەم گیایەدا سەیری مەمکی ئەو نارنجە شەرمنانە دەکەیت... تۆ ئەی منداڵ بۆنی جەهەنەمت لێدێت؟.
من لە منداڵییەوە دەمزانی لەنێوان ئەم دۆسیانەدا قومارێک هەیە، دەمزانی لەسەر تەقویمەکانی شەیتان مانگەکان پاش و پێش خراون، دەمگووت بۆ بەهار ساڵ گەلێ درەنگە. دەمزانی لە فەهرەستی باغچەدا دالیایەک ونبووە... دەمزانی... لەم پاوانە زیاترمان نییە بۆ ئەوەی ئاور لە ستوونە زێڕینەکانی بدەینەوە، لەم دەشتە زیاترمان نییە هەناسەی بۆ هەڵکێشین، لەم هەرزاڵە بەرزترمان نییە ئاسمانی بۆ دروستبکەین، ئەمە ئەو درۆ بازەڵتییەبوو کە خانووی ژیانمان لێسازکرد، ئەمە ئەو جوانییە کۆباڵتییەبوو بۆ شکۆیەکی بەباچوومان دروستکرد.

منداڵی لاکردنەوەی من بوو لە لەنگەرێکی خورافی، هاواری من بوو لە بەندەرێک وەک مۆم بەسەر کەنارەکاندا دەتوایەوە... رۆژێک لە ڕێگای گەنجیدا گۆشەی ئەم ئومێدە بەلای دەهلیزێکی تردا شکایەوە، ئینجانەکان چیتر بەرگەی پەپوولە بازنەییەکانی بەیانییان نەدەگرت، ئێوارەکانیان تەحەمولی ئەسپە ترساوەکانیان نەدەگرت، هەتاو ئەندازەی ئەم پرگالی شەختەیەی بۆ نەدەگیرا، منیش ئەستەرلابی خۆم لە میهرا نەشکاند... دەرچووم لە دەلتای پەرستنی ڕەمزە سادەکانی ئینسان. دەپرسم لێت ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە، ئەوەی تا ئاسمان بەتەنها سەرکەوتبێت، ئەوەی رۆژێک ویستبێتی هەسانێکی هەبێت ڕۆحی بەختیاری پێتێژبکاتەوە، ئەوەی ویستبێتی شەو بسڕێتەوە... شەقام شەقام، گەڕەک گەڕەک بۆ بەهەشت گەڕابێت و نەیدۆزیبێتەوە، ئیدی بۆ بیر لە سپێتییەکی بابردوو بکاتەوە کە خۆی (هەر تەنها خۆی) دەزانێت چ درۆیەکی ڕەنگاو ڕەنگە. منداڵی بەجێمانێکی بچوکە لە قافڵەیەکی پیر، ژوورێکی تازەیە لە وێرانەیەکی کۆن... بەچی ئاشنامانده‌کاتەوە، بەسەوزاییەکی بێ قەیدوشەرت، یان بەسەردابێک قولاپەکانی بۆنی خوێنیان لێدێت؟

کاتێک منداڵی خۆی ئەلبومێکی تەماوی بێت، پڕ لە گوڵی ژاکاو، پڕ لە ئاوابوونی شێداری سێبەری خێزان، پڕ لە تەنافی جیاجیای جلە چڵکنەکانی باوک و کراسە دڕاوەکانی دەستگیرانی تۆراو، پڕ لە جلگرەی کەوتوو بەسەر فۆبیا تەڕبووەکانی دایکدا لە ئاو و تەنهایی، بەجۆرێک ئینجانەکان چیتر بەرگەی ئەم سێبەرە سەنگینەی منداڵە ترساوەکانیان نەدەگرت کە وەک شێت لە پشت کتێبەکانەوە باسی منداڵە زیناکەرەکانی کۆڵانیان دەگێڕایەوە، تارمایی باپیرەکانیش لە جۆلانێیەکی قرچۆکدا بەرەو هەڵهاتن لە سێبەرەکانی ژیان گوژمیاندەدا، بەلای ڕەمزەکانی

پیریدا تێدەپەڕین، بەلای پڵپڵە هەڵوەریوەکانی ئەمبەر و بەری ژیاندا رادەبوردن... وێنەکانیش ئاماژەیان بۆ هەناسە قورسەکانی خێزان دەکرد، کاتێک شەوان بەهەورازی مۆتەکەکاندا سەردەکەوت، بەیانیان نوێنەکان پڕدەبوون لە قەوزەی تێکەڵاوبوونی یەکتر، کورسییەکانیش شاهیدی تەگبیرێک بوون لە زەهرخواردکردنی مانگە کووڕەکانی ئاسمانی ماڵ، وێنەی قوماری دایک و باوک لەسەر کفنە بەجێماوەکانی وەچەیەک لە سەراب... (بەڵێ وەچەیەک لە سەراب، کە گۆڕە خاڵییەکانیان لە پەنجەرەکانەوە دیاربوو). ڕاڕاوەکانیش تادەهات زیاتر بۆنی شێی دەریاچەیەکی تاریکیان لێدەهات، کەس نەبوو زیاتر لە ماسی نەچێت، ڕۆژ نەبوو زیاترو زیاتر خۆری خێزان وەک گوارەیەک بەسەقفەکاندا نەتوێتەوە، وەک عادەتێکی دێرین دڵ دەخرایە قوتوویەکی تۆزاوییەوە (لەگەڵ ئەو کرمە پیرانەدا کە لە درزەکانەوە دزەیاندەکردە ناو نەفەقەکانی ژیانەوە)

منداڵی لەو قاپە شکاوەدا دەخرایە بەردەمی باڵندەکان، لەو سێبەرە نسرمەدا گریانەکان هەڵدەخران تا دایک بەهەناسە سەنگینەکانی خۆی وشکیانبکاتەوە... تۆ ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە لەم سەرمایەدا چۆن نوێنت پڕنابێت لە خۆیسار و کانزا؟

تۆ ئەی دادپەروە، لە ژەنگی ئەو دایەلۆگە درێژانەدا کە کچەکان و سوندەکانی باغ کۆدەکاتەوە، کچەکان و تەپوتۆزی بەردەرگا کۆدەکاتەوە. کچەکان و گسکی مردن کۆدەکاتەوە (لەژێر داپیرەدا)... ئالەوێدا لە حیشمەتی نێوان ئاو و دەرگادا، منداڵی جوانی خۆی دەسووتاند. یەکێکیش کە لە بەر هەیوانێکی دووردا وەهمی نەتەمیندەکرد، هاواریدەکرد و دەیگووت: ئەی منداڵ... بەبەردەمی ماڵی مندا ڕامەبوورە.

تۆ ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە، دەزانیت من ئازار و مەرگم دروستنەکردووە، تۆ شاهیدی... من نیم کە بەختیاریم لە باغچە دەرکرد، ئەوان بوون

بەم قامچییە باغیان پێخەبەرکردمەوە... ئەوان بوون کاتێک بەدوای لەنگەرێکی خورافیدا دەگەڕام، کاتێک نەدەگەیشتمە ئەو بەندەرانەی وەک (مۆم) بەسەر کەنارەکاندا تواوبوونەوە، بەگوڕ هەڵکەنەکانیان ناساندم، بەتاریکەکانیان ناساندم، فڕینیان لەبیربردمەوە و کەوتمە ژێر چنارێکی خەمگین و لەوێدا بیرم لە کۆتاییە ڕەشەکان کردەوە... کۆتاییە تاریک و سادەکان، ئەو کۆتاییە سادانەی لە پەڕینەوەی شەقامێک ئاسانترن کاتێک تەنها دوای عیشوەی باڵندەیەک دەکەویت لە شارێکی چۆڵتردا لە شەو... لە شارێکی چۆڵتردا لە ئاوێکی دوور لەنابەینی دوو کێڵگەی خەوتوودا، ئاوێک لێوەکانی پڕن لە زەردەخەنەی ماسی کوژراو... بەڵێ من تەنها لەوێدا بیرم لە کۆتاییەکان کردەوە... ئەو کۆتایانەی تۆ شاهیدی نیازی من نەبوو بیانگەمێ... بەلام ئەوان... ئەوان فەهرەستی هەموو ئاوابوونەکانیان دامێ... فەهرەستی هەموو نغرۆبوونەکان... فەهرەستی خنکانەکان... فەهرەستی دەرد... فەهرەستی برینەکان....

تۆ شاهیدیت

ئەی ئەوەی ئینسافت هەیە... تۆ شاهیدیت

١٩٩٦

هەندێک دەیانەوێت دەرگاکان بکەنەوە
هەندێک دەیانەوێت نیوەشەو... بەرەبەیان... ئێواران
دەرگاکان بکەنەوە
هەندێک دەیانەوێت دەرگاکانی بەهەشت بکەنەوە
هەندێک دەیانەوێت دەرگاکانی دۆزەخ بشکێنن
هەندێک دەرگاکانی زستان دەخەنە سەرپشت
کەسانێک لە دەروازەکانی پایز دەدەن
کەسانێکیش لە دەرگاکانی گومان نزیکدەبنەوە.

کەس بە پەنجەرەکان ڕازی نییە
گوڵ ڕازی نییە، پەپوولە لە پەنجەرەکانەوە ببینێ
دڵ ڕازی نییە لە پەنجەرەوە بێتە ماڵی عەشقەوە
خەون ڕازی نییە لە پەنجەرەوە بێتە ناو گەمارۆی حەقیقەتەوە
کە ژیان هێندە گەورە بێت، کێ بە پەنجەرە ڕازییە؟
هەندێک دەیانەوێت دەرگا گەورەکان بشکێنن
تا پیربوونی پەپوولەکانی پیا تێپەڕێت
تا مەرگی کۆترەکانی پیاتێپەڕێت، کە هێند گەورەن، دەستە بچوکەکانی ئێمە ناتوانن هەڵیانگرن

هەندێک دەیانەوێت مژدەی دۆزینەوەی دەریای پاک و پاکتر و پاکترین
بۆ ماسی ناو قەفەزە شوشەکان لە دەرگاکانەوە بەرنە ژوورێ.
هەندێک نیازیانە لە دەرگاوە بەهار ڕاکێشن بۆ باغچە
لە دەرگاوە خەیاڵ تلکەنەوە بۆ بێستانی ئەم کتێبانە
نا... کەس بەوە ڕازی نییە، بە تەنها خۆی بە دیوارەکانەوە خەریک بکات، نیگاری هەور، نیگاری کۆچی مراوییەکان... قوڵینگەکان، لەم مەعبەدە ئارامییەدا بکێشێت و ئیدی دانیشێت و تەواو... ناوی خۆی لەسەر بەردەکان هەڵکۆڵێت و بە گەرداوەکان بڵێت، هەڵیگرن و بیدەن بە ئاوێنە دوورەکان، هەڵیگرن و بیدەن بە هاواری ئەو نەورەسانەی لە دەوری بورجەکان دەمرن.
کەس ڕازی نییە... تا مردن ژیانی خۆی لە زەخرەفەکردنی ئەم دیوارانەدا بباتە سەر. بیر لە فڕین نەکاتەوە... بیر لەو کەشتیانە نەکاتەوە کە لە مەترسی دەریا تێدەگەن و ناشترسن. کەس ڕازی نییە، لە پشت ئەم بەردانەوە لە مەرگ تێفکرێت... دانیشێت زیکری موعجیزەکان بکات... موعجیزەی ئەستێرەکان... نەهەنگ... باغەکانی زەیتون. لە سێبەری ئەم دیوارانەدا، گۆڕ بۆ جادووەکانی خۆی هەڵکەنێ، باڵ بۆ تاووسە عاشقەکانی خۆی دروستبکات و بڵێت: بیر لە دەرگاکان ناکەمەوە... من ڕازیم بە تەنهایی، دوور لە ئەفسونی ژیان و دوور لە واهیمەکانی جەنگەڵ و زیندەگییە خەیاڵییەکانی باغچە.

**هەندێک لە گەمارۆی بەندەرەکانی خەیاڵدا، هەموو ڕۆژە ڕاستەقینەکانی خۆیان دۆڕاند**
**هەندێک، هاتن دەرگاکانی خەیاڵ بشکێنن**
**سێبەری مردووی خۆیان لەژێر درەختەکاندا لەخەو هەستێنن**
**ئافرەتی خەیاڵی بەرەو سەر پێخەفی خەیاڵ ڕاکێشن**

**لە باڵکۆنی خەیاڵەوە، ببنە ڕاوچی ئەو ئەورەسانەی لە دەرگا خەیاڵییەکانی دەریاوە دێنەدەرێ**
**هەناری پەشیمان دەنکبکەنە سەر ئەم سفرەی خەیاڵە**
**لەم بەیانییە ساردەدا**
**هەندێک مردووەکانی خۆیان دەهێنن لە باغەکانی خەیاڵدا بینێژن**
**هەندێکیش زیندووەکانی خۆیان لە باغی حەقیقەتدا نابینن**
**باڵندەکان وادەزانن ئەم قەفەزانە خەیاڵن و دێنە ژووری**
**پڵنگەکان وادەزانن ئەم مردنانە جەنگەڵەکانی خەیاڵن و بازدەدەنە ناو ڕیواقە ساردەکانیانەوە**
**مردووەکان وا دەزانن ئەم زیندەگییە خەیاڵە و دەگەڕێنەوە**
**هەندێک بۆ بەهەشتی لەدەستچووی خۆیان لە دەرگاکان دەدەن**
**هەندێکیش لە لەدایکبوونەوە بۆ دەرگاکان دەگەڕێن، بەڵام نایدۆزنەوە**
**ئەورەس دەناسم پشتاوپشت بۆ دەرگاکانی ئاسمان دەگەڕێت**

**گوڵ دەناسم لە باغچەکاندا پشتاوپشت لە دەرگای باغچە دەپرسێت.**
**گوللە هەیە، گوللەیەک دۆست، گوللەیەک گەلێ لە هاوڕێ ئازیزتر**
**تەنها لە دەرگاوە دێتەژورێ بۆ ناو دڵ.**
**ماچ هەیە شەوانە بەئاگامدەهێنێتەوە و بە تووڕەییەوە لێمدەپرسێت:**

**«کامەیە دەرگاکانی ڕۆح؟»**
**ئەوانەی گێلاسەکانی هەتاو لەم سەبەتەی تەنهاییەدا دەتەکێنن... بۆ دەرگای ڕۆشنایی دەگەڕێن**

**ئەوانەی دەیانەوێت، مانگ وەکو میوانێکی دەستەمۆ بێتەژووری و قەڵغانەکەی بە باغچە بسپێرێت... بۆ دەرگایەک دەگەڕێن بچێتە سەر سەکۆی ڕۆمانسییە خەمگینەکان.**
**ئەوانەی مردنیان خستە سەر بەدیهییەکان**
**ئەوانەی دەیانگووت (ژیان + قەفەز) یەکسانە بە (باغچە - بەهار)**
**بۆ دەرگای ئاسودەیی دەگەڕان**
**لەم ئێوارە ساردەدا، دوای ئاوابوونی خۆر**
**هەندێک دەیانەوێت دەرگاکانی ئاسمان بکەنەوە**
**سەبەتەی گومان پڕبکەن لە میوەی درەختی دڵنیایی**
**دەیانەوێت دەرگای هەتاو بخەنە سەرپشت**
**ئاگر کورەی بەدبەختییە بچوکەکان پڕبکات**
**پشکۆی تەنهاییە پیرەکان بگەشێنێتەوە**
**خەوی پیرێژنەکان پڕبێتەوە لە چیمەنی بەهار**
**هەندێک گوێیان دەنا بە دەرگاکانەوە... گوێیان لە هاواری ئەو نەورەسانە دەگرت، کە دەریا دەیانخاتە قوتوی شینی یادگارەکانییەوە. لەبەر دەرگاکان دەوەستان... تا گوێیان لە دواهەمین چرکەی ئەو نارنجۆکی مردنە بێت، کە کرابووە ملی کامەرانی. لە «تیک ـ تاکی» ئەو کاتژمێرەی وادەی منداڵان بوو بکەونە سەر دەستی دایەنە بەربەرییەکانیان.**
**بەیانی بوو... دەرگا بچوکەکانیان کردەوە، کە تەنها ئازادییە بچوکەکان لێوەی گوزەردەکەن**
**دەرگا بچوکەکان، بەرەو دەریا بچوکەکان**

بۆ ئەو کەشتییە بچوکانەی مەودای هەڵهاتنیان لە مەودای ئاوابوونی لاولاوێکدایە لە هەیوانێکی بچوکی ئێوارەیەکی لە شەونم بچوکتردا.
بەیانی بوو... دادگا بابلییەکان... ژووری سێدارەکان... دەرگا بچوکەکانیان کردەوە، تینوێتی مردنی ئەمڕۆیان پڕکردەوە لە ئاو. گوڵی مردنی ئەمڕۆیان تەکاند و خستیانەوە ناو گوڵدانەکان. تاوانە بچوکەکان لە دەرگای لە ڕۆحی کەناریی بچوکترەوە، هاتنەژووری، بەدەنگی بەرز، بە جەلادەکانیان گووت: «ژوورێکمان دەوێت، کەمێک لە مردنی پەپوولە گەورەتر بێت».

بەیانی بوو... گەمارۆیەک لە ئاڵتون تەلاییتر... ئابلۆقەیەک لە خۆشەویستی شوشەییتر... گەمارۆی دەرگاکانی باغچەیاندا. وەسێتی باغەوانەکان دەیگووت: «ئەم مێوانە لە برین نازکترن، ئەم سێوانە لە خوێن زووتر خەیاڵیان دەپژێت».
ئەی شەڕکەر بەو ماچانەی لە شەریعەتی جەنگدا نییە
تۆ پەلاماری دەرگایەکت داوە، جگە لەو خوێنەی لەسەر دەستت جێدەمێنێت... مایەی نییە.

بەیانی بوو... ئەوی تەنها لە دەرگاکان دەهات بەمدیودا
میوەیەک بوو لە ترسی جیابوونەوەی لە باغچە دەگریا.
دەرگاکان هەموو داخرابوون، دەرگاکانی خۆر/ بنەماڵەکانی شەو بەدەوری شورا برۆنزییەکاندا دەسوڕانەوە/ جگە لەو زەنگانەی بۆنی مەعبەدەکانیان لێدەهات/ لە پاشماوەی مرۆڤ لەسەر ئاوێنەکانی فەنابوون... هیچ دیارنەبوو.

دەرگاکان داخراون... دەرگاکان ناکرێنەوە

# نامەی کلیلساز (بەر لە مردن)

بۆ ئەوە هاتووم بەیەکجار دڵنیاتانکەمەوە، کە گەنجینەکانی وجود داخراوەن. بیسەلمێنم داخستنی ئەم دەرگایانە، لە ئیشی یەکێکە لە کلیلسازەکان مەزنتر
لە داخستنی حەکیمێکە، ئەندێشەی لە ئەندێشەی کلیلسازەکان گەورەتر.
بەڵام من یەکەیەکە هەموو دەرگاکان تاقیدەکەمەوە، دەرگاکانی تۆ ئەی ئەو پیاوەی کە زۆر بیر لە دەرگاکان دەکەیتەوە... دەرگاکانی تۆ ئەی ئەو کچەی ژوورەکەت بۆ مردن دەڕازێنیتەوە و بیرناکەیتەوە... تۆ ئەی ئەو ڕێبوارەی هەندێک جار ئاوڕ لە دارستانەکان دەدەیتەوە و دەپرسیت: دەشێت من دەرگاکانم جێهێشتبێت؟... دەشێت منی غافڵ لە شەوێکی تاریکدا بەلای دەروازەکانی ژیاندا ڕابوردبێتم و نەمتوانیبێت ڕەنگی دەرگاکانی زیندەگی لە ڕەنگی شەو جیابکەمەوە؟.
تۆ ئەی ئەو پیاوەی خەریکە خۆت گوناهباردەکەیت...
بەرۆکی گوڵە تەنهاکان بەرنادەیت، پێتوایە عەیامێکە بەهار دەرگاکانی زیندەگی تۆی بە فریوی شاعیرانەی خۆی داخستووە... ڕۆژگارێک تۆ بەلای ڕزگاری خۆتدا تێپەڕیویت و گوڵەکان نەیانهێشتووە ببینیت، ئاه... من دەرگاکانت بۆ تاقیدەکەمەوە... من چرات پێدەبەخشم... من کانزای خەیاڵت لە ڕشتەی پۆلایینی دەرگا جەهەنەمییەکان بۆ جیادەکەمەوە... ئەی ئەوانەی پێتانوایە کە «سەبر» دەرگاکانتان لێدەکاتەوە... ئەی ئەوانەی لەبەردەم ڕۆژە ناخۆشەکاندا دان بەخۆتاندا دەگرن... ئێوەش ئەی سەرەڕۆکان، وەک تاوێرێک با بۆ خەرەندەکانی هەڵگرێت... ئومێد سەرتان پێهەڵدەگرێت. ئەی ئەوانەی ترسی تاڵانکەران، ڕێگای کیشوەرە

یاقووتییەکانتـان پێدەگۆڕێت... بـاوەڕ بـە سـەرنگوونی ناکـەن لـە شـەوێکدا کەنـارەکان بەلەمەکانتـان پارچەپارچەدەکـەن.
من دەرگاکانی سەبرو کلیلەکانی دۆعا تـاقیدەکەمەوە.
هەوڵـدەدەم بـۆ ئێـوە ئەبەدییـەت لـە پەنجـەرەکان... لـە ڕۆژەکان... لـە دەرگاکان نزیکبکەمـەوە.
تـۆش ئـەی ئـەو خاتوونـەی لەبـەر دەرگاکان فـاڵ بـۆ گەڕانـەوەی نەوجەوانـی دەگریتـەوە... فـاڵ بـۆ هاتنـەوەی باڵنـدە ڕەشـەکانی نگیـن دەگریتـەوە.
ئێـوەش ئـەی ئەوانـەی پێتـان وایـە کارکردن دەرگاکانـی سـەرفرازی لـە ئێـوە ونکـرد، وادەزانـن حوجـرەکان... زانسـتەکان... شـەڕ و شـوڕەکان نەبوونایـە ئێسـتا ئێـوە ئـازاد بـوون.

مـن دوای نائومێدیـم لـە دەرگاکانـی سـەبر، دەرگاکانـی (زەحمـەت) تـاقیدەکەمـەوە... دەرگاکانـی (ڕەنـج)... مـردن لەژێـر بـاری ماندووبوونـدا.

ئێـوەش ئـەی ئەوانـەی سـەفەرکردن... پەڕینـەوە لـەم کیشـوەرەوە بـۆ ئـەو کیشـوەر... لـەم باغـەوە بـۆ ئـەو بـاغ، شـەهوەتی ژیانتانـە... من کلیلەکانـی سـەفەر تـاقیدەکەمـەوە، تـۆ ئـەی ئـەو پیـاوەی کڕینـی ئـەم جەنگەڵانـە بـە دەرگای خـۆت دەزانیت، کڕینـی ئـەم بێسـتانانە بـە سـەرفرازی خـۆت دەزانیت، ئـەی ئەوانـەی موڵکـداری... هەکتارەکانـی خـاک... فەدانەکانـی نـور، بـە دەرگای خـۆتـان دەزانـن، مـن خاکـی مردنتـان لـە خاکـی بەیانییەکانـی خۆشەویسـتی بـۆ جیادەکەمـەوە
من بەروبومی مردنتان لە بەروبومی شەو بۆ جیادەکەمەوە
من دەغڵی تاریکیتان لە دەغڵی بەرەبەیان بۆ جیادەکەمەوە
خەرمانی دوای جەنگتان لە خەرمانی دوای عەشق بۆ جیادەکەمەوە...
سێوەکانی فیتنەتان لە سێوەکانی ئارامی بۆ دەردەهێنم.

تۆش ئەی ئەوەی پێتوایە، ئەوەی یارییەکی بردەوە، ژیانی بردۆتەوە. ئەی ئەوەی پێتوایە، ئەوەی کلیلێکی بردەوە، دەرگاکانی بردۆتەوە.من مژدەی چاوەڕوانییەکی درێژترت دەدەمێ، لە پشت گەردەلوولەکانەوە... لەناو بورجەکاندا... لە قوللە ئەرخەوانییەکانی ڕوانینی تەنهایانەدا، من ڕقم لە دڵنیاییە کاتێک دەزانین دڵنیایی تەنیا گۆرانییەکە بۆئەوەی لە ناوەڕاستی نائومێدیدا خەومان لێنەکەوێت... ئێوەش ئەی جەنگاوەران، کە عومرێ خەریکی دابەشکردنی ژیان بوون لە نێوان باوەشی خێزان و گۆڕەپانی مەشق و کڕنوشبردنی بەیانیانەدا بۆ ئالا... ئەی ئەوانەی ژیانی خۆتان لە نێوان کوشتنی باغچە و بەخێوکردنی منداڵدا دابەشکرد، ئەی ئەوانەی ژیانی خۆتان لە نێوان کوشتنی مانگ و لایلایەدا بۆ کۆرپەکان بردەسەر، ئەی ئەوانەی باغچەتان بە پاداشتی فرۆشتنی ڕۆح کڕی، ئەی ئەوانەی منداڵەکانتان فێردەکرد بە زیندوویی کوکوختییەکانی باغچە بخۆن. من دەمێ ساڵە دەرگای دڵڕەقیم تاقیکردۆتەوە، دەمێ ساڵە لە خوێنی براکانی خۆم خواردۆتەوە، عەیامێکە فێربووم هاوخوێنەکانی خۆم... هاوخەندەکانی خۆم، لەبیرکەم.

بەڵام ئەگەر هیوایەکمان هەبێت لە دەرگای مردنەوە نییە... من کلیلی جەنگم تاقیکردۆتەوە... کلیلی کڕنووشم تاقیکردۆتەوە... کلیلی فەرامۆشکردنی میهری و دۆستی... لەیادکردنی هاوڕێیەتی و برایەتی ئەزمونی دێرینەی منە... تۆش ئەی ئەو کچەی پێتوایە ڕەوشت ژیانی کردۆتە دۆزەخ... دەزانیت کاتێک ئێمە دەخەوین، ڕەوشت پاسەوانی باغچەمان بۆ دەکات... شەرەف لە بەر دەروازەکانی شاردا، لە دەرگای کوچەکان و ماڵەکان و ژوورەکاندا، ژیانمان دەپشکنێ. من کلیلی هەڵهاتنم

**لە شەرەف بۆ هێناویت، کلیلێک کچێتی خۆتی پێبکەیتەوە و لەگەڵ گیانداره برۆنزییەکانی ژێر تریفەدا بنوویت.**
**ئەی ئەو پیاوەی دەڵێیت: ئەگەر یەکێک خەونەکانی ڕاست بۆ تەفسیرکردبامایە، ئێستا لە بەهەشت بووم. من خەونامە زێڕینەکانم بۆ هێناویت تا کلیلەکانی خۆت تاقیبکەیتەوە... ئەی ئەوەی یەخەی جەنگەڵەکانت گرتووە و دەڵێیت: بمتوانیایە خێراتر بەناو ئەم زۆنگاوە کوشندەیەدا هەڵبێیم، دەمێ ساڵ بوو لەودیو دەرگاکانەوە لەناو پەرییەکان و ئاسکەکاندا دەژیام، من لەم دارستانەدا چاوساغی تۆم، ئەی ئەو منداڵە ئیفلیجەی هاوار لە چیاکان دەکەیت: ئەگەر قاچم هەبایە ئێستا لەگەڵ گورگە بێخەیاڵەکاندا، لەسەر لوتکەکانتەوە سەیری جۆبارەکانی جاویدانەگیم دەکرد... ئەی ئەو کەڕ و هیچنەبیستانەی بەتەمان بەدەف و سەنتورەکانتانەوە پەلاماری «ئیساکا» بدەن... «عەدەن» داگیربکەن.**

**ئەی ئەو لاڵانەی بە ئومێدی ئەوەن لایلایە بۆ باغچە بکەن.**
**ئەی ئەو کوێرە شپرزەیەی بەرێوەی ڕوومو دەرگاکانی شەوەزەنگ، خۆت بە سەبەتەی مێخەکەکاندا دەکێشێت، بەرچنەی ڕوناکی و سندوقی میوەکانی هەتاو دەخەیت بەسەریەکدا... من دەرگاکانی ڕوانین و دەنگ و بیستن، بە پوچترین... تاریکترین... ئەستورترین دەرگا دەزانم.**
**(عەدەن) لە دەرگاکانی ئێوە دوورە.**

**ئێوەش ئەی ئەوانەی کردنەوەی دەرگاکانی خۆتان هەڵدەگرن بۆ قیامەت، کلیلەکانتان دەکەنە ملتان و بە هەموو دەرگا ڕاستەقینەکانی وجود دەڵێن: دەرگاکانی گومڕایی... ئێوە گومڕان.**
**ئەی ئەوەی پێتوایە ئەگەر زمانی باڵندەکان بزانیت، باغچە دەرگاکانی خۆیت بۆ دەکاتەوە... تۆ گومڕایت.**

ئەی ئەوەی دەڵێیت دەرگایەک دادەخرێت و هەزار دەکرێتەوە... تۆ نەفامیت.
ئەی ئەوەی جیاوازیناکەیت لەنێوان دەنگی میحرابەکان و دەنگی ئاوەکانی ئێرەمدا، (عەدەن) وَ (دۆزەخ) لەیەکتر جیاناکەیتەوە... تۆ نەفامیت.

ئەی ئەو پیاوەی دەڵێیت، من خاوەنی هەزار ڕێگا بووم، کە دەرگای هەزاران باغچەی دیان تیادەکرایەوە.خاوەنی کۆشک بووم... تەبار... شکۆ کە دەرگاکانی ئارەزوو تەنیا بە خواستێکی بچوک دەکرانەوە... تۆ گەمژەیت.
ئەمێستا لە سۆراغی دەروازەکاندا دامێنی خوێناوی تۆ دەگرم، ئەی ئەو کلیلسازەی دەرگاکانی شەو تاقیدەکەیتەوە. تۆش گوێبگرە ئەی ئەوەی دەڵێیت هیچ شتێک ئەستەم نییە، فڕین ئەستەم نییە، سەرکەوتن ئەستەم نییە، شکاندنی دەرگای مێرگوزارەکان ئەستەم نییە، گەیشتن بە یەقین ئاسانە، کردنەوەی دەرگای خەزنەکانی وجود ئاسانە. من هاتووم یەکجار پێتان بڵێم... دەرگای گەنجینەی باغچە... دەرگای ئومێدەکان... دەرگای ڕۆح بەم کلیلانە ناکرێنەوە.
ئێوەش ئەی ئەو سەربازانەی دەڕۆن و ناگەنە ئەو کیشوەرانەی دەتانەوێت داگیریانبکەن.
ئەی ئەو سوپایانەی گەمارۆی شارێک دەدەن، بازنەی خورافی شوراکانی دواییینایەت. تۆش ئەی ئەو فرۆشیارەی جاڕ بۆ هەراجی باغەکانی(دانیال) دەدەیت... ئەی ئەو نەژادپەرستەی بەنەفرەتکردنی (زایۆن)، ژاکاندنی (زایۆن)، ئاگربەردان لە باغەکانی (زایۆن) هاواری تۆیە. چەقۆکێشی ئەم خێڵە بیابانشینانەی تۆ، جگە لە دەرگاکانی تاعوون دەرگایەکی دی ناکەنەوە. ئەی پێغەمبەری کوللەکانی ناو لم، هاواری تۆ تەنیا دەرگای

یادگارە بابلییەکان... گێڕانەوەی سەربوردەکانی کەربەلا لە ئۆرشەلیم... سوورکردنی دیوارەکانی قودس بەخوێن... دەرگای دیکە ناکەنەوە.
تۆ ئەی ئەو پیاوەی هاواردەکەیت، با زەندیقەکان بسوتێنین، باغچە بکەینە گۆڕستانی ئەو پیاوانەی بەبێ دەستنوێژ یادی گوڵەکان دەکەن، ئەو کچانە تیربارانکەین، کە دەوێرن لەدیار باغچە باسی کوژانەوەی مێردایەتی بکەن لە لەوحەکانی ژیاندا.
دەرگای زەندیقەکان لە دەرگای شافیعییەکان ئاسانتر نییە بۆ ڕۆحێک لە مانای ئارامی نەزانێت.
تۆ ئەی ئەوەی پێتوایە ئانارشیستەکان، کلیل بەدەستەکانی ناو بێستانی وجودیان گومڕاکردووە. من پێت دەڵێم ئەو دەرگایەی باغەوانەکان دایخەن، بە کەسی دی ناکرێتەوە. من بۆ یەکجار هاتووم دڵنیاتانبکەمەوە کە دەرگای گەنجینەکانی وجود داخراوە... یەکجار بە گوڵەکان بڵێم ئەو دەرگایانەی لەگەڵ لەدایکبوونی باغچەوە داخراون، بە کلیلەکانی من ناکرێنەوە. بەڵام من بەیانی... نیوەڕۆ... نیوەشەو... کلیلەکان تاقیدەکەمەوە، لەم باغەوە سەفەردەکەم بۆ ئەو باغ و کلیلەکانم تاقیدەکەمەوە... لەم ئەستێرەیەوە سەفەردەکەم بۆ ئەو ئەستێرە و کلیلەکانم تاقیدەکەمەوە... دەرگای گەنم... دەرگای هەتاو... دەرگای گیا. دەرگای یەک لەدوای یەکی دەهلیزە یەک لەدوای یەکەکان، کە بەرەو باغە یەک لەدوای یەکەکانی مردنمان دەبەن.

* * *

دەرگاکان داخراون... دەرگاکان ناکرێنەوە.
کە دەرگاکان نەکرێنەوە... جەنگ یاری نێوان زیندەگی و سێبەرەکانێتی شۆڕش هاتوچۆکردنی مردنە، لەنێوان دیوارەکانی یەک ژووردا

**عەشق کۆتایی هێنانێکی نائومێدانەیە بە نائومێدی**
**بەهار کۆتایی هێنانێکی پایزانەیە بە پایز**
**کە دەرگاکان نەکرێنەوە... دەبێت مردووەکانمان لە دیوارەکاندا بنێژین، خوا لە دیوارەکان داتاشین، مانگ لە شوشەی شکاوی پەنجەرەکان بەر لە هەڵچنینیان بەلاشەی کوکوختییەکان.**
**دەرگاکان ناکرێنەوە، ئەگەر هەموو زەنگەکانیش بشکێنین، دەرگاکان ناکرێنەوە**
**تەنها بە مردنی خۆمان دەتوانین دیوارەکان بڕوشێنین**
**ڕۆشنایی ئەم ژوورە لەبەر یەککەوتنی فڕینی ئێمەوەیە لەگەڵ بەردەکاندا، کە نورێکە لە ڕوناکی بەهەشتە ونەکان... ڕوناکی تەقینەوەی عەمارە سەوزەکانی جەنگەڵ... ڕوناکی زیندەگییە بەباچووەکان.**
**ئەمیرەکان، کاردینالە مەخمەلییەکان، حاخامەکانی پایز، ئاخوندەکانی سەر سنەوبەری مەرگ، خواجا درۆزنەکانی باغچە، لەبەر دەرگان... ئیدی چۆن ئیزگیلەکان، پەڕەسێلکە خومارەکان، بارۆنە عاشقەکان، مەولاناکانی بەختیاری، فیکۆنتە سەوزەکان... لەم زەنگە بدەن.**
**مەسیح بە جبە ئەرخەوانییەکانی نائومێدییەوە، بە ماچەکانی یەهوداوە لە بەردەرگایە**
**ئیدی ئەم پاپا ڕەنگ شەرابییە... ئەم قەشانەی لە پشت پۆلی تەیرەن ئەبابیلەوە دەردەکەون... قەدیسی وێرانە کەرنەڤالییەکانی دوای جەژن... ئومێدیان بە دەرگا چییە؟**

**دەرگاکان داخراون... دەرگاکان هەبوون... دەرگاکان نەبوون... دەرگاکان نین**

**تێبگە... ئەی ئەو گۆرانیبێژەی عومرت لە سەمای دەوری ئاگرە کوژاوەکاندا**

بردۆتەوە سەر
ئەی ئەو ڕەوندییەی فوو لە خۆڵەمێشی مێگەلە بەباچووەکان دەکەیت
تێبگە... ئەی ئەو ئاگرکوژێنەوە شۆخەی لە قوتابخانەکانی جەهەنەمەوە
هاتوویت و بەدوای سووتانی گوڵێکدا دەگەڕێیت خامۆشیبکەیت

گەر دەرگاکان نەکرێنەوە
بەهار خورافەتی باڵندەکانە
دین ئەو گۆڕەیە بۆ خۆشەویستی یەکتری هەڵدەکەنین
چرا پاشگەزبوونەوەیە لە شەو
یەزدان زەردەخەنەی تەنهایی ئێمەیە، بەرامبەر بە تارمایی... بەرامبەر بە هەتاو... بەرامبەر بە شەراب.
زەنگیش سوودی نییە/ مردن لە تێفکریندا لە زەنگ، بەڕاستی سوودی نییە/ زەنگێک لە کانزاکانی مەحشەر/ لە فرمێسکی ئەو واشە پیرەی بۆ مردن نەبێت دانایەتەوە سەر خاک/ زەنگێک لە قریشکەی هەور بەسەر مێخەکێکی ترساوی ناو پەنجەرەیەکی تاریکی، بەهارێکی تەنیای، باغێکی پەژموردەدا/ زەنگ لە شوشەی ئەو هەڵۆ پیرانەی فڕینیان دەشکێت/ زەنگ لە ئاوێنەی ئاخربوونی پەیمان و ئاوابوونی لە یەکدی تێگەیشتن، شکانی سوێندی بەهار کە بە باڵی کوکوختییەکان دەیکێشا بە قورئانەکانی باغچەدا و دەیگووت: من زەنگێک لە ئاسنگەرە خەوتووەکانی ناو ئەلبومەکانی باغ دەهێنم و ئەم دەرگایە دەکەمەوە/ زەنگێک لە سارێژبوونەوەی مەودای نێوان حەقیقەت و درۆ... سەوزیی و تەلایی مانگ... شەونم و لمی ئەستێرە شازادەکان.
بەڵام دەرگاکان نین
یەکێک ناونیشانێکی لەسەر مێزی ئائومێدییەکان دانا:

کە لە خوێنی کەنارییەکانەوە دەڕۆیت، بەرەو بەهارێک هەمیشە لە نزیک تابووتەکانەوە خەوتووە، بە شەقامێکدا سەردەکەویت بە نزیک باڵەخانەی مردنی خۆتدا تێدەپەڕێت، بە فیغانی باڵندەکاندا وەرە ناو سەقەری باغچەوە و بەسەر پەرژینی کپی یاسەمینەکاندا شۆڕبەرەوە... لەویادا دەرگایەک دەبینی بە مردندا دەتهێنێتەوە بەردەم منداڵی خۆت.
بەڵام من کوچەی هەموو کەنارییە کوژراوەکان شارەزام،
گەلێک ئاشنای ئەو بەهارانەم لە نزیک تابووتەکانەوە خەوتوون
دەمێ ساڵە لە دۆزەخی باغچەدا بەسەر پەرژینی کپی یاسەمینەکاندا شۆڕبوومەوە و دەرگام نەبینی.
یەکێک وەک هەر ئامۆژگارێکی پیر، ناونیشانێکی لەسەر کتێبی پەشیمانییەکان دانا و ڕۆیشت:
لە بەیانییەکدا کە خەون لە ئیمپراتۆرەکان زیاتر خەراج دەخاتە سەر درەختەکان، کیمیاگەرێکی توڕدراو لە هەیوانی زانستە شوومەکاندا هەستێنە و بڵێ: کوا دەرگاکان؟
بەڵام نە گوڵەکان، نە ئیمپراتۆرەکان، نە کیمیاگەرەکان نامدوێنن و لە مێژە خەون خەراجی خستۆتە سەر باغچەم.
لە بەیانییەکدا کەشتییەکی نوستوو لە نزیک خەندەی ئەدمیرالێکی بێهۆشەوە ناونیشانی دەرگایەکت دەداتێ. بەڵام خۆر (کە هەرگیز لە هەڵهاتن و ئاوابووندا درۆینەکردووە) لە بەیانییەکدا کە هەرگیز شایەنی درۆ نەبوو، سەبارەت بە ڕۆشنایی و ئومێد درۆیکرد.
شێوەن لەسەر ڕەفە فرمێسکاوییەکانی خۆی... لە دۆلابی پرسە سەوزەکانی بەهاردا، دەفتەرێکی تەڕی بە خوێنی خۆکوشتنە یەک لەدوای یەکەکانی باغچە دەرهێنا. (وەک سەمای ڕەشپۆشێک لە بازنەکانی مردندا)
گووتی: دەرگا نییە، ئەگەر هەشبێت لە پشتییەوە قەرەنتینەی منداڵییە، قەرەنتینەی لیمۆکانی ڕۆحە کە بە بەژنی جەنگە جۆراوجۆرەکانی درەختدا

هاتۆتەخوار... قەرەنتینەی ژەنراڵە باڵدارەکانی باغچەیە... زیندانە... زیندانی ئەو مەهراجا خەمگینەی گەڵای وەهم لە پاڵتۆکانی جەنگەڵ دەکاتەوە.

دەرگا نییە، دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژان دەرگا هەبووبێت
دەشێت بەیانییەکی دوور کۆترێک (کە مەرگی لە شوشەیە)
دەرگایەکی دیبێت...
کۆلۆنیۆلیکی سەنگەرەکانی پیری، خودەی پڕ لە عەتری، دوژمنە شۆخەکانی لێبوویێتە زەنگ...
بەڵام لێرەدا دەرگا نییە
دەرگاکان نین... نین... نین
کەچی من هەر باس لە وەهمی قاپییە سیحرییەکان دەکەم
باس لە زرینگەی پۆلاینی باڵەکان دەکەم، لەسەر نقێمی دەروازەکان/ لە گووتنەوەی نەفەقە ئەرخەوانییەکان بۆ نەوازشی ئەو/ لە ستایشی بولبول بۆ سەدای بەهار لەودیو دەرگاکانەوە/ دەڵێم وەسفی ڕۆحی ئاسکەکان بکە کە خۆیان دەکێشن بە دەرگاکانی پیرێتی باغچەدا/ ستایشی گەماڕۆی مێگەلە زیوینەکان بکە بۆ تەنهایم/ بەم ئەسپە بریقەدارە بڵێ کە خواجایەکی ژەنگاوی هەڵگرتووە: با لەگەڵ شیوەنی خۆیدا سمکۆڵبکات... سمکۆڵی یەکێک کە ڕەشەباکان دەڵێتەوە.
من بە غروری مانگێکەوە سەری لە جەژنگیرەکان تێکدابێت بە غروری یەکێکەوە سنەوبەرەکان نامەیەکیان پیاناردبێت بۆ بەهار، بە فیزی پیاوێکەوە بڵێت: من پۆستەچی گوڵەکانم، باس لە قاپییە سیحراوییەکان دەکەم. وەک درۆزنێک لەوەوبەر نەیگووتبێت: «دەرگا نییە... دەرگاکان نین».

ستایشی ئەم دەرگایانەتان بۆ دەکەم
ستایشی دەرگای ئیمپراتۆرەکان... ستایشی دەرگاکانی هاوسەری و هاوڕێتی... ستایشی قاپییە نیلۆفەرییەکانی غرور. من بەسەر جوانی قادرمە بیرۆکراتییەکاندا سەردەکەوم... بەسەر قفڵی جاویدانەی دەرگاکاندا هەڵدەدەم... تۆزێکیش چییە لە مەدحی خۆم بۆ ئەو بورجسازانە کەمناکەمەوە، کە نەخشەکانیان سەرتاپای دەرگایە... من بە دەستڕەنگینی ئاسنگەرەکانەوە دەنازم کە دەرگای دیکە لە پشت دەرگا داخراوەکانەوە دروستدەکەن
(بەنەفرەتکردنی دەرگاکان، فێڵێکە بولبولەکان فێریانکردین)
مەرجیش نییە
ئەوانەی لە پشت دەرگاکانەوەن، ناشادبن.
ئەوانەی لەبەر دەرگاکاندان و تا مردن لە زەنگەکان دەدەن، ناشادبن.
ئەوانەی لە دوورەوە بەڕێوەن بەرەو دەرگاکان، ناشادبن.
هەر وەکو چۆن، مەرج نییە...
ئەوانەی دوور لە خەیاڵی دەرگاکان، گوڵەباغەکان ئاودەدەن... ناشادبن.
(ناشادیش فێڵێکە لە سەیرانگاکانەوە، بۆمان ماوەتەوە).

## ئەو دەرگایانەی ئەمیرەیەک داوایدەکات

دەرگاکان نین... دەرگاکان نین
ئەگەر دەرگا هەبوو
من دەرگایەکم دەوێت، لە هەیوانی زەردەخەنەکانەوە دابەزم.
دەرگایەک لە باڵکۆنی ئینجانە خەمگینەکانەوە بڕوات بەرەو قەراغی دەریاچەکان، لەوێوە کاتێک سەیری ماسییە پیرەکان دەکەیت دەتوانیت

ژیـان تیوریزەبکەیـت، پیـری بخەیتـە بـەر ڕۆشنایی غونچەکان، لـە نزیـک ئەفسـانەکانەوە پرگاڵەکانت بخەیتە کار، دووری تەنهایـی خۆت و گوڵەکان بپێویت، دووری پیـری و شە پۆلەکان بپێویـت، بزانیـت خـوا چەنـدە بەسەر سنەوبەرەکاندا چەماوەتـەوە؟ تێبگەیـت، گۆشـەی نێـوان شـەیتان و فریشـتە لـە باغـدا چەنـدە؟

من کلیلێکم دەوێت لـە نێوان پایـز و درەختـدا، کە نە ژیـان نـە بەژموردەیی، دەستیان نەیگاتێت.

مـن لـەم باغـی تێفکرینـەدا سەردەسـتە فسـفۆرییەکانم هەڵدەکـەم و بـە پەشۆکانی ئاسمان دەڵێـم: هەسـتە لـە خـەو.

جەوهـەری خـۆم لەقوتـوی مرواریيەکانـدا دەشـارمەوە. گوڵێکم لـە مـردن دەکەمـەوە و بـە دەریـا دەڵێـم: ژوورەکانتـان بۆنـی دەنگـی نەهەنگـە خەوتووەکانـی لێدێـت.

کـە جوانـی هەمـوو ئەسـتێرەکان لەبـەردەم جوانـی منـدا هەرەسـبهێنێت... کاتێـک فریشـتەکان ئامادەبـن کراسـی پیرێتـی من لەبەرکـەن... ئـەی مانـگ پێویسـتە

چەکبیـت لـە بەردەممـدا، پێویسـتە ئەگـەر ئاسـمان دەرگای نەبێـت بـۆم دروسـتبکەیت.

مـن دەرگایەکـم دەوێـت، لەوێـوە هـاوار لـە جەنگەڵـەکان بکـەم «هەسـتن لـە خـەو»... تێفکـرم، تیوریزەبکـەم، بـەو زسـتانە ترسـاوانە بڵێـم، کـە لـە پشت پەچەکانـی بارانـەوە سەیرمدەکەن «پەچەکانتـان لادەن»... مـن ناتـانبیم... من لـە پشت تـەمی سـەر ڕۆحـی شاهەنشـاکانەوە سـەیرتاندەکەم و دەرگا نییـە.

من دەرگام نییە

ناتوانم لە داگیرکەران بێمە پێشێ، با داگیرکەران لە من بێنە پێشێ

**ناتوانم لەباغچە بێمە پێشێ، با پەلکەزێڕینەکان لە من بێنە پێشێ**
**من دەرگام نییە، لە خەیاڵ نزیکببمەوە**
**قەفەزم نییە، لە کەنارییەکان تێبگەم**

**من دەرگام نییە**
**ئەگینا گوڵە حەرامزادەکانم بەخێودەکرد/ باغچە حەرامزادەکانم پڕدەکرد لە پەپوولەی حەرامزادە/ هەموو ڕۆژێک پشکۆیەکم لە تەنووری مردنم هەڵدەگرت و چراکانی باغچەم پێدادەگیرسان/ دەمگووت: هەستن لە خەو، ئەم برینپێچە ببینن لە ڕەحمی شەوە تاریکەکان هاتۆتەدەرێ و جێگوڵلەی سەر دڵی سنەوبەرەکان تیماردەکات.**

**من دەرگام نییە، ئەگەر دەرگاتان پێبەخشیم**
**تاجەکەم بۆ ئەو باڵندانەی بە دەنووک، دارستانەکان لەمبەری دەریاوە هەڵدەگرن بەرەو ئەوبەر.**
**ئەگەر دەرگاتان پێبەخشیم و**
**من کۆترە بارمتەکانی ناو دڵی خۆمم بەرنەدا، هەفتانە**
**ستایشی مۆزەخانە خوێناویەکانم نەکردن، هەفتانە**
**خۆڵەمێشی مردووەکانی نێوەم نەکرد بە چیمەنەکانی باغچەوە، هەفتانە.**

**بەڵام ئەگەر دەرگاتان پێبەخشیم**
**با دەروازەیەک بێت بتوانم هەموو ڕۆژێ لە ئومێدەوە بچم بەرەو گریان و بگەڕێمەوە**
**دەروازەیەک بتوانم هەموو ڕۆژێ لە خۆشەویستییەوە تێپەڕم بۆ پەشیمانی و بگەڕێمەوە. هەنگاوێک بێت بتوانم لە نەوازشەوە سەفەربکەم ڕووەو چەقۆ، لە پۆزشەوە پاشەکشێبکەم بەرەو نەفرەت و بگەڕێمەوە.**

# باغە ماسۆشییەکان

ئەی ئەوانەی هاتوون، تۆڵە لە شاهیدەکانی بەربەیان بکەنەوە
(بەربەیانی کووشتنی فریشتەکان... بەربەیانی لەیەکترازانی دڵ لە
خوێنبەرەکانی هەتاو)
لەودیو دەرگاکانەوە جەژنی تۆڵەکەرانە
جەخار من دەستم ناچێتە ئەو خانەخوێیەی لەسەر مێزی بادەوە
پێمدەڵێت: تۆڵەمان لێبکەرەوە
جەخار لەناو ئەم هەموو دڕندەیەدا، ناحەزێک شکنابەم
نێرگسێک نییە پیلانم لێبکات
(ئاه... چەندە مایەی پیربوونە هاوڕێیەتی)
جەخار لە حەزی ئەم کالیپتۆسە مازۆشییانە بۆ ئازار...
جەخار لە نزای ئەو پرتەقاڵانەی لە باکان دەپاڕێنەوە «بمانخنکێنن»
من تەنهام
وجودم درێژکراوەی وجودی باغەوانە بەرگوزیدەکانی عەدەنە.
گێلاس لەسەر تایەک و دڵم لەسەر تاکەی دی ئەم تەرازووی دادەیە
ئەم ساقییە مازۆشییەی لە خوێنی خۆی مەزەی مازۆشیمان بۆدەهێنێ.
نازانێت... وجودی من کورتکراوەی وجودی گوڵفرۆشە تاراوگەکراوەکانە.
بەڵام کەس لەم لالەزارە ماسۆشییە دەربازنابێت
جەغار من لەیلایەک دوژمنم نییە
ئەوەی کە دوژمنی نییە، دەبێت لەم لالەزارە دەرچێت
وەلی هەیهات کە ئەم باغەش دەرگای نییە.

# باغی شاعیرە باستانییەکان

من دەموویست لە فریادەرەسەکان یاخیببم
بەڵام درەنگ زانیم، کە بۆ تۆیە... بۆ تۆ
ئەی دەستورباز... یاریکەر بە یاسا مەخمەلییەکانی دڵرەقی... بۆ تۆیە
(ئەی مایسترۆی ئەو خونچانەی لەژێر شەوقی مانگەشەودا لەسەر دەنگی سوپاکانی قیامەت هێرشدەبەیت)
بۆ تۆیە ئەی باستانی... پێغەمبەری مۆزەخانەکان.
بۆ تۆیە، کەس بەئومێدی خیانەت نییە لەم کۆراڵە
بۆ تۆیە، ئەم دەفبەدەستە مەستانە، بێپەروا دەرگای لالەزارەکان دادەخەن.
بۆ تۆیە، کەس بەهیوای دەرچوون نییە... لە باغێکدا خەنجەری کۆن تۆڵە کۆنەکانی خۆی زیندوودەکاتەوە... کتێبی کۆن نوسەرە مردووەکانی خۆی زیندوودەکاتەوە... مردووەکان میراتییەکانی خۆیان دەخەنە سەر حیسابی باغەکانی خۆیان.
لە ڕۆژێکدا، میانەی نێوان ئێمە و شمشێرەکان... غەزەلی دەریایەکە.
میانەی نێوان ئەمیرە کوژراوەکان و تاجەکانیان... هەناسەی مێخەکێکە.
دووری نێوان ئێمە و پیری... بازدانی دولفینێکە.
دووری نێوان مردووەکان و منداڵی... جاڕدانی گوڵفرۆشێکە.
بۆ تۆیە... دەبێت بەهانە سازکەین... پلار لە نەوجەوانی با بدەین، خەونی کەشتییەکان ئاوەژووبکەینەوە و بڵێین:
مردووەکان زۆر دوورناکەونەوە لە زیندەگی
تەنها ژیانە میانەیەکی گەورە لە ڕۆژگارەکانی خۆی وەردەگرێت
ژیانە کە لە بەیانییەکانی خۆی پاشگەزدەبێتەوە

ژیانە کە ڕوو لە باغچەکانی خۆی وەردەگێڕێت
لـە باغێکـدا باڵنـدەی کـۆن، کتێبـی فڕینـی کـۆن، ئاموزشـی نیشـتنەوەی کـۆن، لەسـەر ڕەفـەکان دانـراون. باغێکـە کاتژمێـرە دێرینـەکان هەمیشـە زەمانـی دێرینەمـان نیشـاندەدەنەوە. مـردووە کۆنـەکان، لەسـەر کتێبخانـە کۆنەکان، ڕۆژگارە تازەکانیـان مەزانتکرد. شـاعیری کـۆن، لـە شـەمەندەفەرە دێرینەکانـەوە هاتـن، تـا فێـرە فڕینمانبکـەن...
فێرمانبکـەن چـۆن ماشـێنەکانی عیرفـان بخەینـەوە گـەڕ... زەنگـەکان هەڵواسـینەوە... ڕسـتەکان بخەینـەوە ڕێـزی یـەک.
شاعیری کۆن بە مەکیاجی سۆزانییە تازەکانەوە
بە چاویلکەی کوێرەکانەوە لە شەقامی حەقیقەتە ئاشکراکاندا
بە شەهیەتی مردووەکانەوە لەسەر خوانی زیندەگی.
شاعیری کۆن، لە شەقامە تازەکاندا
کەوتنە وانەگووتنەوە سەبارەت بە ڕاکێشانی «یار» بۆ قەسابخانەکان
کەوتنە سەربڕینی «مانا» لە بەردەم مەعبەدی ڕۆحە پوچەکاندا
لە باغێکدا تێگەیشتن لە «مانا» تەنیا نهێنی جیابوونەوەیە.
کـە لەژێـر هـەر درەختێکـدا دەلالـەکان لێتدەپرسـن: مانـای کۆنـت دەوێـت، یـان مانـای کـوژراو.
(سـەیرکە، قەڵەمـە دێرینـەکان... سـۆزە دێرینـەکان... چەنـدە پـاک لـەم پەنجەرانـەوە دیـارن)
وەرن شیعری کۆنـی شـاعیرە تـازەکان بـە دەنگی بـەرز بـۆ مردن بخوێنینـەوە، ڕۆژنامـە زبڵـەکان سـەفتەکەین... شـاعیرە زبڵەکان... پرۆفیسـۆرە زبڵەکان... دانیشگا زبڵـەکان ڕیزکەیـن و سوژدەیان بـۆ بەریـن.

ئەوانـەی لـە ڕۆژگارە کۆنەکانـەوە دێن، شـەیدای ئـەوەن یەکێـک سـوژدەیان بۆبەرێت.

وەرن گوێڕایەڵبین بۆ حیکمەتی ڕەخنەگرە کۆنەکان
(کە زۆر زیرەکن، بەحرەکانی عەروز دەناسن!!)
شەڕکەرانە سوار ئامێری بەلاغەت بین...
دەمامکی شاعیرە فیتنەبازەکان بکەینە سەر...
پەندی خواجاکان بگرینە گوێ...
چوارخشتەکی لەسەر ئاهەنگی ماتەمینی پیرە ئەیساپوریەکان بهۆنینەوە... مەسنەوی نوێ بنوسین... زەندیقانە بسوتێین و بابەکیانە بکوژرێین.
لە باغێکدا بوغردی بەهەشتە بۆنی مەرگ لە سینەی باغەوانەکاندا ڕۆحمان لەگەڵ غەزەلبێژە گەمژەکانی گوڵستاندا یەکخەین. کۆن بین... تالەبەرکردنی خیرقە بڕۆین... لە غەزەلدا بکوژێینەوە و جار لە دوای جار لە بەردەم گوڵدا وەسف بمانشکێنێ، لەبەردەم باغچەدا جیناس شەرمەزارمانبکات.

بۆ تۆیە... بۆ تۆ... ئەی باستانی.
دەڵێم... بەیانی دەرگای نییە
ئەمە سازی گۆرانی بێژەکانی حەجاجە لەم قاوەخانە تاریکەدا . ئەمە پێکەنینی یەزیدە لە مەحشەری گوڵەکاندا
بەیانی دەڕوات و «نوێ» ئاگاتە دیوانەکان
دەلالەکانی مانا... کارمەندەکانی عەقڵ... ئایدۆلۆژیستە پایزییەکانی باغچە، مایەی ئەم نووشستییەن . یۆتۆپیستەکان لە ڕێگای پشووی مێژوویی خۆیانەوە/ نوسەری بایۆگرافیای بەهارە تاریکەکان/ نوسەری ساڵنامەی جەنگە ساردەکانی عەشق/ ئەوانەی لە هەڵبژاردنی جەنگەڵدا بوون بە سەرۆک/ سیاسییە ڕازاوەکان بە سەنگەر و تابووت/ وەزیری دەوڵەتی گوڵە پەژمووردەکان/ ئەوانەی لەگەڵ مانگە برۆنزییەکاندا پەیمانی ئاوابوونی

ئەبەدییان مۆرکرد/ ئەندازیاری گومەزی خواجا ورشەدارەکان.
هەموو ئەمامە تازەکانیان پۆستکرد بۆ دۆزەخ
گوڵە تازەکانیان وەکو کتێبە تازەکان نارد بۆ جەهەنەم
ڕۆحە تازەکانیان وەکو خەیاڵە تازەکان ڕەوانەی زەمهەریر کرد
کلیلی دەرگاکانی زەمەنیان پۆستکرد بۆ وێرانەکان
کلیلی دەرگای ڕۆژە تازەکانیان خستەوە گیرفانی عارفە کۆنەکان
ئێوە ئەی ئەوانەی سەر بە دیوارە کۆنەکاندا دەدەن
بەپرتاو بلیتی ئەو قافڵانە ببڕن، کە بەرەو ڕۆژگارە کۆنەکان، پاشەوپاش دەگەڕێنەوە
ئەی ئەوانەی سەر بە دیواری باغی شاعیرە باستانییەکاندا دەکێشن
دڵنیابن... نوێ ناگاتە سەر دیوارەکان.
تا مردن مانای کوژراو لە بازاڕی حەقیقەتە کوژراوەکاندا بکڕن، خەیاڵی کوژراو... عەقڵی کوژراو... ڕۆحی کوژراو لە ماسیفرۆشە پەنجە ڕزیوەکانی شیعر بکڕن و بەوەهم بەختیاربن، کە لە باغی نۆژەنە وەهمییەکاندا، گوێتان لە تاری جاویدانەی شیعر گرتووە.
دەرگاکان نین،
ئەگەر دەرگاش هەبێت ئێمە پێویستیمان پێ نییە

ئێمە ئەوەیەکین ڕێکەوتی هەینی دەکەین
ڕێکەوتی پشووی باغچەکان
لەو ساڵانەدا لەدایکبووین کە دەریا سەرخەوێکی تیادەشکێنێ.
سەفەرمان ڕێکەوتی ئەو شەمەندەفەرانەیە
لە گۆڕستانی باغچەوە سەفەردەکەن بۆ گۆڕستانی پەلکەزێڕینەکان
جەژنەکانمان ڕێکەوتی ئەو ڕۆژانەیە، کە زیندەگی بەدیار گومانێکەوە دەخەوێت

ئیتر دەرگامان بۆچییە؟
بڕیاربوو بۆ ڕزگارکردنی پەپوولەیەک، لەم دیوارانە بێینەدەرێ
بۆ دەرکردنی ئەو ئومێدانەی باغچەیان بە هیوا تاڵانکرد
بەڵام ڕێکەوتی قەدیسی گوڵەکانمان کرد، بە درەختەکانی باغچەوە خنکابوو.
نائومێدیش بەلای کەنیسەکاندا تێدەپەڕی و هاواریدەکرد: شەوشاد... شەوشاد، ئەی بەختەوەری.
دوای ئەم هەموو پەشیمانییە ئیدی دەرگامان بۆچییە؟
لەدایکبوونمان ڕێکەوتی نیگای ئەو پیاوانەیە بە دەمامکە زیوییەکانی شەپۆلەوە سەیرماندەکەن.
ڕێکەوتی ئەو چەکمانەیە، لەسەر کاشییەکانی باغچە مەشقیان بەسنەوبەرە یاخییەکان دەکرد
دەمانگووت: سەیرکەن ئێمە دەڕۆین و باغ لەگەڵماندا دەڕوات ئاسمان ڕیشۆڵەکانی دەخاتە سەر زەخرەفەی مردنمان
پاسەوان بروسکەی قەڵغانەکانی دەخاتە سەر زەردەخەنەمان
جەنگاوەرانی هەتاو تفەنگەکانیان دەبەخشن بە کۆمەکی ئەم جەنگە
بەهەر لایەکدا بڕۆیت، باربۆی ئەم گۆشەگیرییەیە
کە کەس لەم گەمارۆیە دەرباز نەبێت... ئیدی دەرگامان بۆچییە؟
بەم پلەکە ژەنگاوییەدا سەردەکەوین بۆ مانگ...
تەمەنمان بەشی تا نیوەی ڕێگا ناکات
بەم پەیژە لەرزۆکە دادەبەزین بۆ دۆزەخ...
تەمەنمان نیوەی پەیژەکان تەواو ناکات
لە پەنجەرەکانەوە هاوار لە باڵندەکان دەکەین...
ژیانمان هێندەنییە، دەنگمان بگاتە باڵندەکان
ڕۆژێک لە ڕۆژان

کتێبێکمان لە باغچەدا ونکرد... کاتمان نەبوو بیدۆزینەوە
لەگەڵ گوڵەکاندا بەشەڕهاتین... ژیان بەشی پەشیمانی نەکرد
لەگەڵ پەپوولەیەکدا سەفەرمانکرد... مۆڵەتی گەڕانەوەمان نەبوو
ئیدی دەرگامان بۆچییە؟
لەم دادگا سپییەدا، وەک هەزارەها پیاوی سپی، دۆسیە سپییەکانمان سەرخست بۆ نهۆمە سپییەکان، سوێندی سپیمان خستە ناو پەیمانە سپییەکانەوە، دواجار قارەمانە سپییەکان ئێمەیان لەم ریواقە سپییەدا کوشت، ئێستا چی هەیە بیبینین، جگە لە شەمەندەفەرێکی سپی کە بەرەو ئەستانە سپییەکانی مردن سەفەردەکات؟
کە تەنها پەلەی ڕەش لەودیو دەرگاکانەوە هەر رۆح بێت
ئیدی دەرگامان بۆچییە؟
ئەو پۆستەچییانەی لەوبەری ژیانەوە گەڕانەوە
جگە لە هەنسکی پەشیمانی ناو کوچەکانی کوفە، چییان بۆ هێناین؟
چییان بۆ هێناین؟
جگە لە ڕاسپاردەی کچێکی جەهەنەمی بۆ فوارەکان؟
لە نامەی قەشەیەکی تینوو بۆ مۆمەکانی کەنیسە؟
لە سڵاوی ژەهراوی قەیسەر لە گوڵەباغەکانی باغچە؟
چییان بۆ هێناین؟
تووتییەک ناوی پادشاکانی دەگووتەوە
قەلەڕەشکەیەکی نەگریس، شوێنی جەنگەکانی پاشەڕۆژی دەخوێندەوە،
پیرێژنێک لەسەر سینییەکانی باغچە، تێشووی مەرگی لە تێشووی زیندەگی دەبژارد
پێمبڵێ پۆستەچییەکان چییان بۆ هێناین؟
کە پۆستەچییەکان لەوسەری ژیانەوە دەستبەتاڵ بگەڕێنەوە
ئیدی دەرگامان بۆ چییە؟

ئێمە ئەو پیاوانەی دەمانەوێت، مانیفێستی گۆشەگیری بنوسین
ڕێکەوتی کەمانجەژەنێکمان کرد، بەبێدەنگی بەلای پەنجەرەکاندا ڕادەبورد
و دەیگووت: بژی تەنهایی
پیرەمێردێک لەسەر دیوارەکانەوە هاواریدەکرد:
پایەداربیت شەوە بێدەنگەکانی دارستان، پایەداربیت شەوی گوڵە پەژموردەکان، پایەداربیت بێدەنگی کوکوختییەکان لە هێلانە دوورەکاندا.
دەروێشێک بە ئەستێرە خنکاوەکانی ناو دەریاچەی دەگووت:
سوپاس کە خۆڵەمێشی باڵە ئاوریشمییەکانی من و ئاوریشمی مردنە ئاوییەکانی ئێوە، ئەم شەپۆلانە تێکەڵ بە یەکدیان دەکەن. سوپاس کە ئەم دۆعایە زیاتر لە فڕینی نەورەسێک بەرزنابێتەوە بۆ ئاسمان. سوپاس بۆ ئەو ئەستێرانەی لەسەر خۆڵەمێشەکانیان دەسوتێم و ئاسمان مردنم بە مردنی ماسییەکی پیر تێدەگات
سوپاس کە ئەم تەنهاییە دەرگای نییە.

جەنراڵێک لە سەرەمەرگی خۆیدا دەیگووت:
سەرفرازی بۆ گوردانە زێڕینەکان، سەرفرازی بۆ ئەو موشەکە برۆنزییانەی بەهار بۆردوماندەکەن، نەمری بۆ ئەستێرەکانی سەر شانم، کە ئەفسوس دوای مردنم بۆ کۆترەکانی باغچە جێدەمێنن، نەمری بۆ ئەو نۆتە بچوکانەی بەمیرات بۆ سنەوبەرەکانیان جێدەهێڵم. درود بۆ جەنگە خەیاڵییەکان، درود بۆ وڕینەکانی سەرەمەرگ... کە دەروازەیان نییە؟ نەمری بۆ دوژمنە وەهمییەکانم کە ناتوانم لە بازنەیان دەرچم.

کچێک لە پشت پەنجەرەکانەوە دەیگووت:
سوپاس بۆ دەرگا داخراوەکان
سوپاس بۆ کەلەپچەی ئەزەلی سەر دەستی عاشقان، بۆ پەردەی

هەتاهەتایی کچێنی. بژی ئەو جێشەرمە ڕەشانەی، شەوزەنگ پاسەوانییان دەکات، سوپاس بۆ ئەو دەرگایانەی لە سەر پاکیزی ئێمە داخراون... سوپاس بۆ کلیلە ونبووەکان... سوپاس بۆ قفڵە ئەبەدییەکانی کچێتی. ئیدی ئێمە دەرگامان بۆ چییە؟

ئێمە نوسەرانی مانیفێستی مردن
لەو پیاوانەین کە پێویستییان بە دەرگا نییە.
لەسەر قەدی درەختەکانی باغچە «مردن»مان خوێندەوە
گوێمان لێبوو، ڕێبوارەکان لە دەرگاکانیان دەدا و بە خانەخوێکانیان دەگووت: مردن / ئەستێرەکان بەیەکدی دەگەیشتن و دەیانگووت: بەیانی مردنتان باش/ ئەوەی لەوسەری ژیانەوە تەلەفونەکانی هەڵدەگرت، دەیگووت: بەڵێ مردن قسەدەکات/ ئەوەی لە خوا دەپاڕایەوە دەیگووت: ئەی مەرگ... ئەی مەزنترین مەرگ / برسییە ددانزێڕینەکان گازیان لە میوەکانی مردن دەگرت/ فریشتەکانی باران بە دەمامکەکانیانەوە لە تابووری «مردن»دا دەوەستان/ لە دەرگای ئەکادیمییەکان نووسرابوو «لێرەوە بەرەو مەرگ»/ لەسەر چێشتخانەکان نووسرابوو «داوەتی مەرگ» / لە مێوانخانە تاریکەکان نووسرابووە «نوستنی مەرگ» / کۆیلەکان بەباڵی فریشتەوە لە کانە ئاسنینەکانی مردن هەڵهاتن
لەنێوان دەربەندەکانی مردندا سەدای سڵاوەکانی مردن بوو
لە نامەکانی ماڵاوییدا مردن قسەیدەکرد
لەنێوان درەختەکانی باغچەدا... مردن گۆرانی دەگووت
باغ ماڵی پەپوولەکانی مردن بوو
هەنگوین ژەهری مردن بوو، بەلێوی هەڵاڵەکانەوە

ئیدی دەرگای چی، ئیدی دەرگامان بۆ چییە؟

دەبێت بتوانین، بە ئەندازەی وێرانبوونی لەش، ڕۆح ئاوەدانبکەینەوە / بە ئەندازەی خاپووری جەنگەل، باغچە ئاوەدانبکەینەوە/ بەئەندازەی ڕەشهەڵهاتنی پەلکەزێڕینەکان، ڕۆح لە ڕەنگەکان نزیکبکەینەوە/ ڕێگامانبدەن بەقەد ژمارەی ڕاوکەرە خەوتووەکان، ماسی خەبەربکەینەوە/ بە ژیان بڵێین پاسەوان بخاتە سەر بورجە دوورەکان... چرای فەنارە کۆنەکان داگیرسێنێتەوە...

با ژیان، کەلێنی شوراکانی خۆی هەڵچنێت... هەر لە کەلێنی دیوارەکانی زیندەگییەوە مار دەئاڵێتە لاولاوەکان. پڵنگ پەلاماری سۆفییە خەوتووەکانی باغچە دەدات.

دەبێت زیندەگی گوڵەکانی خۆی زیاتر ئاگاداربکاتەوە
دەبێت پاسەوانەکانی ئەو زیاتر بە تارماییەکان بڵێن:
ئێرە زیندەگییە، باغچە پایتەختی زیندەگییە، سنەوبەرەکان ئەمیری زیندەگیین.

ئەگەر پێویستیکرد، با شورای ئاسنین دروستبکەین بۆ ژیان
پەپوولەی شەڕکەر لە باغەکاندا بەردەین
مافی گومان بدەینە هەموو ڕۆحلەبەرێک
دەبێت چاومان لە برین بێت وەکو مێردمنداڵێکی شۆخ بەخۆیی و عەتری کوشندەی نەوجوانییەوە، لە چراکانی وەفا و مۆمە جاویدانەکانی بەزەیی نزیکببێتەوە... برین، کە جاهێڵە نمەکحەرامەکانی خۆی خستە سەر حورمەتی ئەو خوێنەی لە ڕۆحی برینداری باغچە دەتکێت.

ئەی زیندەگی
من دەرگای خەزێنە ماچە سروشتییەکان دەدەم بە تۆ
کلیلی گەنجینەی پاشەکەوتی سنەوبەر لە هەتاو... لە فەرووی سمۆرە
پیرەکان... لە خەوی مێلاخە نەشکوفتەکان
دەدەم بەتۆ

وریایی ئەی ژیان، وریایی
بەرامبەر ئەو کرمە ئاوریشمییانەی، پیلانی ئاوریشمی دەچنن
بەرامبەر ئەو بولبولانەی پەلاماری درەختی ئاوازەکانی باغچە دەدەن

با دەرگاکانی زیندەگی
لە ئێشکگرە خەندانەکانی شەوی پێغەمبەران
لە شۆڕشی ئەو باغەوانەی لەبەر فوارەکاندا بتەکانی خۆی دەشوات بە
کێلونی گەورە داخەین
بە ژیان بڵێین
دەرگا لەو زیندانیانەش مەکەرەوە، کە مردنی خۆیان تەواوکردووە و
دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ باغچە
وریایی ئەی زیندەگی
لە مەکری ئەو کچانەی خۆیان لەبەر ئاگردانەکانی تۆدا گەرمدەکەنەوە
دەبێت بەقەد ژمارەی (مردن) لەودیو دەرگاکانەوە
لەسەر دیوارەکان... جلەکان... چراکان... بنوسین «ژیان»
لەسەر هەناسەی یاسەمینەکان، لەسەر تۆوی وەنەوشەکان، بەخەتی
گەورە، بنوسین: «بژی زیندەگی»
بەم سەمەرقەندە بڵێن کە بە مانگ موتوربەکراوە

بەم جەلادئابادەی لە پزیسکێکی ئۆرشەلیم بۆتەوە.
ئێرە زیندەگییە... مانگ دوورکەوتنەوەی زیندەگییە لە خۆی
شەهادەت شوێنی ئەو خەنجەرەیە کە ژیان دەیدا لە جەستەی خۆی
گوڵە کوژراوەکان، ناکامی زیندەگین لە قارەمانە وەچاغکوێرەکانی خۆی
پێویستە بڵێین: ئەی ژیان، کلیلی ژووری مێوانە مردووەکان بە ئەمانەت لای تۆ دادەنێین. ئەخشەی ئەو شەقامانەی، بەرەو شاری هێلانەکان دەچن، کلیلی ئەو منداڵە زەرنەقووتانەی لە درەختەکانەوە دەفڕن بۆ گرتنەوەی سێوەکانی پیرێتی
ئەی ژیان، کلیلی زەردەخەنەی جەلادەکان لای تۆ دادەنێین، کە ئێمە ناگەینە ناو نهۆمی خەندەیان/ ئاه... شورای گەورەمان دەوێت بۆ ژیان، تا تکەی شەونم دزەنەکاتە ئەودیو دەرگاکانەوە/ پاسەوانی گەورەمان دەوێت، بەیانیان ئاورەنگەکانی سەر دەستی بتەکێنێ و ئینجا سەر بۆ خاکە بەیارەکانی مردن بەرزبکاتەوە.

ئەی زیندەگی
دواجار هەموو کلیلەکان بۆ تۆ
کلیلەکانی دەریا کە لە هەمان کاتدا، دەرگای سروە و دەرگای حۆریە غەمگینەکان و دەرگای بەهەشتە ونەکانیش دەکاتەوە
بۆ تۆ... بۆ تۆ... ئەو کلیلەی دەروونی گوڵەکان دەکاتەوە
بۆ تۆ... بۆ تۆ... ئەو کلیلەی خەونی ئاورنگەکان دەکاتەوە
هەموو جوانییەکان بۆ تۆ
کە بەناوی ئێمەوە لە مەحفەلی خۆرئاوابوونەکاندا قسەدەکەیت بەناوی ئێمەوە لە بەردەم دەریادا، لە کەشتییە سەرەڕۆکانی زیندەگی تورەدەبیت
بەناوی ئێمەوە لقی درەختە بەردارەکان ڕادەوەشێنیت
کلیلەکانی مردن فڕێدەدەیتە گەرداوەکانەوە

**ئەی زیندەگی... هەموو جوانییەکان بۆ تۆ**
**کە تۆ هەموو جوانییەکانت بۆ ئێمە دەوێت**
**بەم قفڵە تاریکانە... دەرگا تاریکەکانت دابخە**
**کە تۆ دەرگاکانت داخست**
**ئیدی ئێمە دەرگامان بۆ چییە؟**
**ئەو پیاوانەی مانیفێستی خۆمان لە دەوری پشکۆکان دەنوسین دەرگامان بۆ چییە؟**
**ئەوانەی مانیفێستی گۆشەگیری خۆیان نوسی**
**ئیدی دەرگایان بۆ چییە؟**
**ئیدی دەرگایان بۆ چییە؟**

**کانونی یەکەم - ١٩٩٢ کانوونی دووەم ١٩٩٣**

**بەسینەی بازەوە من و تۆ دوو دەستین لە ئاگر**
**ئەهریمەنزادە و پەریزادەی ئاوێنەکانی مەرگین**
**من سەرابیترین پیاوی دونیا**
**مندالێک لە جنسی (با) و (دوکەڵ) و (تۆز)**
**بەیازی دڕندەترین حەرف و کراسی خوێناویترین جەستە**
**بەرپرسیارم لە ئافەتەکانی ڕۆح/ بەرپرسیارم لە فیتنەکانی عەقڵ**
**لە کۆدیتاکانی لەزەت و لە یاخیبوونەکانی جەستە**
**بۆنی ئەو باڵدارانە لە هەناسەم دێت، لەم جەهەنەمی گومانەدا**
**یەقین بەسەر دارستانە ترساوەکانی ئێوارەدا دەبەشنەوە**
**وەکو پیرترین ئەسپ، پیرترین مەیتەرەوان... پیرترین... زێرینترین...**
**خەمگینترین بازی خراپکار / شەهێنێک کە ئاسۆکانی پیربوونی خۆی**
**بەفڕینێک لە ئاگر/ بە مەرگێکی وەک ئاسن سارد... بەکێلونێک لە**
**ڕۆشنایی و قفڵێک لەبروسکەکان دابخات/ لە کوچەی ئەم توتییە**
**بێوەفایانە دەچمەدەرێ**
**بۆ مردن لە چاوەڕوانی سوتاندا لە سەر پشکۆی ئەم دیانەتە دێرینانە**
**دەڵێم: (ئەمە نهێنی نییە و هەرگیز نهێنیش نەبووە)**

**تۆش لە ڕۆژگارە بەهەشتییەکانی خۆت چنگێک خۆشەویستیم بدەرێ**
**ئەگەر حەکیمی ئەم باغچە گۆشەگیرەیت، ئاشوفتەترین دەروێشی ئەم جەنگەڵەم**
**ئەگەر شازادەترین ئادەمکوژی، شەڕانگێزترین ڕۆحی ناو ئەم بایەم.**

**سەیرکە، پاش عەشق چەند تەماحەکانم گەورەبوون**
**سەیرکە، بووم بە چ کیمیاگەرێک و خەون بەچ لابورێکەوە دەبینم**
**سەیرکە... سەیرکە، چ کافرێکم لێدەرچوو**

**بێهودە ئەنجن ئەنجن بوونی خۆم لە وانەی ئەم دەروێشانەدا دەڵێمەوە**
**مردنی من... دۆزەخی من، ڕۆژی زیندووبوونەوەمە**
**لە نێوان میللەتە سەرخۆشەکان و فەلەکە مەستەکاندا**
**من لە جنسی دوکەڵ و گومانی ئەهریمەنانەم**
**تۆ لە جنسی فریشتە دڵتەنگەکانی دەریایت**
**ئەو فریشتانەی بەڕۆژوون لە سەیری ئەستێرە و گیا و ئاو و جەنگەڵەکان**

**ئەی یار... ئەی شەونمی نێوان کتێبە دۆزەخییەکانی من**
**ئەگەر تۆ لە تەڵا زیاتر نەدرەوشێیتەوە**
**من شەڕم لەگەڵ ئەم دوژمنە کانزایانەدا بۆ ناکرێت**
**ئەگەر پرشنگی تۆ لە پرشنگەکانی زیو ڕۆشنتر نەبێت**
**دەنگی من لە دەنگی بەیانییە ناسازەکانی مردن گەورەتر نابێت**
**ئەگەر تۆ ئاوازی جەنگ نەخوێنیت**
**شمشێرەکانی من لاسکی گوڵەکانی ئەم جەهەنەمەیان بۆ نابڕێت**
**ئەی یار من چیتر بام خۆشناوێت، ئەو بایەی بەڵگەنامەی خوێنینی منی**
**لەگەڵ تەنهاییدا دڕی/ سوێندی منی لەگەڵ خاکە بەیارەکاندا شکاند/**
**ڕۆحی منی لە جەنگەڵ و گیاکان ترساند**
**سەیرکە پاش عەشق چەند تووڕەترم لە گەردەلوول و دەریا و تۆفانەکان**

ئەوەی لە من بەجێما، ئایندەم بوو
ئەوەی لە مندا با دەیبات، ئەو ڕۆژانەیە کە بۆ خۆمم هەڵگرتووە
ئەوەی لە مندا دەکوژرێت
ئەو دەقیقانەیە کە باوکان و وەچەکانم لێی بێبەرین
ئەوەی لە مندا دەکوژرێت، منم نەک تۆ
منم، ئەوەک زەمەن و بەیانی و ئایندەکان
منم، ئەوەک کەناری و ئاو و چەمەنزارەکان
سەیرکە دوای مردنم عەشق چ یارییەکدەکات
ئەو کەشتیانە دەمبوورن کە منێک لە ئاودا ڕزگاردەکەن، کە من نیم.
ئەو گیایانە دەمبوورن کە خەونی مردوویەک گەورەدەکەن، کە من نیم
سەیرکە دوای عەشق، مردنم چ یارییەکدەکات
(وەک یاری دۆلفینەکان لە ئاودا)

ئەوەی لە من جێدەمێنێت، ئەوەیە کە لە باڵی باڵندەکان جێدەمێنێت لە کەنار ئەستێرەکاندا/ ئەوەی لە مندا با دەیبات، ئەوەیە کە باکان لە ڕۆحی ئێمەدا جێیدەهێڵن/ ئەوەی گەردەلوولەکان دەیبەن، ئەوەیە کە لە گەردەلوولەکان دەچێت لە ڕۆحمدا

ئەی عەشق
ئەی کەنیسەکانی شێتیم لەم جەنگەڵە فیرعەونییەدا/ ئەی بەردەنوێژی بەجێماو لە جەنگاوەرە شکستەکان/ ئەوەی لەناو تۆدا جێدەمێنێت منم/ کە تۆ لە خەراباتەکاندا دەمریت، ئەوەی لەناو تۆدا بەر لە مردنی تۆ دەمرێت، منم/ ئەی حەقیقەت، بەرلەوەی تۆ جێبمێنیت، ئەوەی لەناو بەجێمانی تۆدا جێدەمێنێت، منم

**پارچەکانی من لەناو پارچە مردووەکانی دەریا و ئاسماندا بوو**
**لەناو سفرەی هەلاهەلای عەشق و حەقیقەتدا بوو**

**سەیرکە دوای عەشق جەستەم چ یارییەکدەکات**
**چ تەماحێک دەخاتە بەر ئاوێنەکان و سەرابەکان و گێژەنەکانی مردن**

**ئەوەی لە سەفەرەکانی من و تۆ جێدەما، گوڵە ژاکاوەکانی خوێن و ماچ و جەهەنەم نەبوو/ سێبەری ئەستێرەکان بوو، لەسەرگیای پاکێتیمان/ من بووم دەگەڕامەوە دۆزەخ، بۆ سەفەر لەدوای جێپێکانمان لەپشت مردنەوە/ لەبری گەڕانەوە بۆ سەر مێزەکانی خۆشەویستی و پێخەفەکانی سەدەف و گیا، دەگەڕامەوە بۆ برینەکان، ئەو برینانەی وانەی نەمریمان بوون**

**ئەوەی دواجار لە مردن بەجێدەما، من بووم**
**سەیرکە، دوای عەشق مردن چ یارییەکم لەگەڵ دەکات**

**ئەوەی لە مردن دوادەکەوت، لە ساتێکدا مەرگ بەفریای ئەم ئادەمیزادانە دەکەوت/ من بووم ئەوەک لە وێنەکاندا جێدەمام، بەڵکو لە دەستە تەلیسماویەکانی (با)دا، کاتێک بە سەر گیاکاندا تێدەپەڕی/ من بووم لە جەهەنەم بەجێدەمام، وەک ئاگر لە دەستی فریشتەکاندا/ وەک گوناهی ڕژاو بەسەر خامۆشی ئەو کڵپانەدا کە با دەیکوژاندنەوە**

**ئەی یار**
**ئەی تاقانەترین شەراب لەم تاعوونەدا**
**ئەی شەوی من لەناو ئەم ڕوناکییەدا، کە ژەهرە**
**قەفەزی من لەناو ئەم ئازادییەدا، کە زیندانە**

تۆ پەڕوباڵی بازەکانی منت بەست لەم فڕینەدا، کە مەرگە
تۆ منت بە سیاهی و مەرەکەبی شەڕ ڕەنگکرد
لە شەوێکدا ئاسنگەران، مانگیان لەسەر سندانەکانیان دەشکاند
خواکان شەڕیان لەسەر سێبەرەکانی یەکتر دەکرد
فریشتەکان خەزینە بەتاڵەکانی بایان لەناو یەکتردا بەشدەکرد

ئیدی ژیان شکستی دواهەمین حورمەتی من و تۆ بوو

ئەی شەڕانگیزترین یار، ئاوێنەم لە بەهەشتێکدا سیماکانی سپین وەک خامی تابووتەکان/ تاریکیم لە بەیانییەکدا، هاوڕێکانم ناز بەسەر دەرگای دۆستایەتیمدا دەکەن/ ئەی حەسودیم لە زەوی، لە گیا، لە باڵندە کۆچەرییەکان

من ڕقم لە خواکانە کە قەترە خوێنی منیان لە خوێنی تۆ جیاکردەوە

ڕۆژێک تێدەگەن کە باس لە چ وێرانەیەک دەکەیت
تێدەگەن ئەفسانەکانی تۆ چەندە لە حەقیقەتەکان، ڕیای تۆ چەند لە چاکەکان، چاکەی تۆ چەند لە موعجیزەکان گەورەترە.
ڕۆژێک تێدەگەن، ئەوای من ئەوای چ پێشبینییەکە
سازی من سازی ئەو بومەلەرزانەیە کە خاک شیریان دەداتێ
سازی من سازی ئەو شەهێنانەیە، ئاسمان لە قەفەزەکانی ڕۆحیدا هەڵیگرتوون
تۆ دەستی منت بەنهێنییەکانی زەوی و کلیلەکانی خەیاڵ شارەزاکرد /
تۆ منت بردە سەر پاشماوەی بەهەشتەکان و سفرەی تەفروتونابوونی بنەماڵەکانی شیعر/ تۆ ئەو ئاسمانانەت پیشانی مندا کە ئاسمان

دەیشارێتەوە (تا ئاسمانێکی دیکەمان لێدیارنەبێت)/ بەلام سەیرکە عەشق لە چ دەرگایەکی پێداین...
بەچ ڕێگایەکدا بردینی
بەچ ئاوێنەیەکی ناساندین

(ئەمە نهێنی نییە و هەرگیز نهێنیش نەبووە)
ئەوەی لە ناو گەردەلوولەکاندا بەجێدەما، من بووم
ئەوەی لە مەیدانی سێدارە و فەنابوون و ئەشکەنجەدا تەنیا لەسەر سەکۆکان بەجێدەما
تەنیا لە بەردەم سزای فانۆسەکان و نیگای شەهێنەکان و چپەی گیاکاندا بەجێدەما، من بووم
من کە دەستم بەستوونی عەشقە پاکەکانەوە بەسترابوو
بەزنجیری پەیمانێکی مەستانە دڵی خۆم بەم گەردەلوولانەوە شەتەکدا
وای لە من وای
چیرۆکی یەکبوونی من لەگەڵ ڕۆحی ئەم ئاگرانەدا
جیابوونەوەم لەگەڵ نهێنی فەلەزەکانی کوشتندا... حکایەت بوو
بەلام سەیرکە عەشق چ یارییەکمان پێدەکات

دەبێت ستایشی ئەم ترس و چارەنوسە خوێنینانە بکەم
دەبێت کەمێک بەحیشمەتبم و لە تەک گوڵ و پۆلا و خوێن و ئەستێرەکاندا... برابم

ئەی یار/ نوێژی من نوێژی جەهەنەم نشینە نەخوێندەوارەکان بوو/ سوژدەی من سوژدەی پیاوە سەربڕاوەکانی ژێرباران/ ئەی یار... من نەورەسانە مردم/ عەشقی من سزای من بوو، بۆ ئەو ڕۆژگارانەی ناپاکییان لەگەڵ

**کردم/ عەشقی من تۆڵەی من بوو، لەو دەستانەی گیاکانیان لە باغچەی گشتیدا کوشت**

**من نەورەسانە مردم... نەورەسانە دڵی خۆم فڕێدایە دەریا**
**نەورەسانە سپێتی خۆم بەخشی بەم لمە پاکیزانەی عەرشی لەسەر بونیادنانرێت/ من نەورەسانە مردم/ لە ڕۆژگارێکدا زەوی کچێتی تۆی دەفرۆشت بە بازرگانە چاوشینەکانی ئاسمان/ خاک تاعوونی بەسەر درەختە چکۆلەکانی باغچەی گشتیدا دابەشدەکرد/ ببورە... ببورە فریشتەکەم/ دەبێت بوکێنی تۆ لەسەر سەکۆی ڕێگاکانی ئەم جەهەنەمە بێت و من نەورەسانە بمرم/ من وەچەی هەور، کوڕی زەرەنگەرە کوێرەکان، وەچەی سنەوبەرە خەمگینەکانی قەراغ شار/ تۆ کچی ئەو نەتەوانەی کە دەستیان بەخوێنی یەکدا چووە.**
**ئەوەی کە زەوی فەرامۆشیدەکات، من و تۆ دەیچێنین**
**ئەوەی باران نایبارێنێت ئێمە دەیبەخشینە دەریا**
**ئا من چیتر ئەم ڕێگایانەم خۆشناوێت**
**کە مژدەی گەڕانەوەی من بوون بۆ ژێر ئاسمانی ئەم گەلاوێژە ئاسنینە**
**دەبێت لەم خاکانە دەرچم، لە خاکی ئەم بستەباڵا کانزایانە**
**لە ئاوی ئەم بەلەمەوانە قەمورانە بپەڕمەوە و شەوێک... شەوێکی تاریک، دەست لە زەنگە مەستەکانی (با) بدەم... گیا ماچبکەم، هەرێزەکانی شەو... باڵی ئەو باڵندانەی پاسەوانی بورجە دوورەکانن**
**دەستبدەم لە گریانی با لە لەنگەری کپی قەراغ دەریاکاندا**
**لە ئالودەبوونی لمەکان بە هەناسەی لەشکری ئەم ئافرەتە خەوتووانە.**

**ئەی یار**
**دەبوایە فەنابوونی خۆم ببەخشم بە فەنابوونی خاک/ مردنی خۆم**

لەنێوان شەو و عەشق و خەیاڵدا، ببەخشم بەپشویەک لەنێوان ئەستێرە و شیوەن و کێلەکاندا/ لەبری ئەوەی گیاکان بۆم بگرین، مەرگی خۆم بەخشییە شیوەنی ژنە ڕەشپۆشەکانی نێو ستوونەکانی با و ئاگر و شەو/ فاڵی خۆم لەدەستی بەجێماوی ئەم لافاوەدا گرتەوە کە خاک فەرامۆشیدەکات/ عومری خۆم لە نیگای ئەو مردووانەدا خوێندەوە، بێوادە لەم ڕێگایەدا چاوەڕێماندەکەن/ من ئالودەبوونی خۆم بە غروری باکان خوێندەوە/ خنکانی بەیانیم بە دەستی ئەم قەقنەسانەی (پیرترن لەوەی بەئەفسانەکانی خۆیان بوێرن)... حکایەت بوو... کوشندەبوو

من پیربووم لەم شەوەدا کە ڕزگاریم دوورترین شارە و ڕۆحم دوورترین ئومێد
بە من مەڵێ باڵندە سیحربازەکانی شەو چیان پێگووتم
ئەوەی کە لە شەو دەڕژێت، دەبوایە سێبەرەکانی من و تۆ بیشارنەوە
ئەوەی خۆر خیانەتی لێکرد، من و تۆ وەفامان پێفرۆشت
بەڵام سەیرکە چەند سەختە عەشق... چەند سەختە... چەند سەخت
تۆ کاڵتربوویت لە باران... کاڵتربوویت لە خوێنێک لە یەکەم نوتفەی ئادەمدا
کاڵتربوویت لەو شەونمانەی ئەم وەرز دەیانبەخشێتە ئەو وەرزی دیکە
سەخت بوو، من منداڵتربووم لەو بایانەی پەپوولە پاییزییەکانیان بۆ ناگیرێت
منداڵتربووم لەو پەنجەرانەی پاسارییەکانیان بۆ ناگیرێت.

ئەی یار، دەبوایە ئەستێرەیەک ئاوەدانبکەینەوە
ئەستێرەیەک (بە وێرانەی درەخت و گیا و شەونمەکانییەوە)

ئاە سەیرکە عەشق چ شەڕێکمان پێدەفرۆشێت
ئاخر چۆن... چۆن؟
من و تۆ دەتوانین خوێن لەناوچاوانی ئەم تۆفانە بسڕین
چەقۆ لە دەستی ئەو درەختانە دەربهێنین لە باغچەی گشتیدا خۆیان کوشت
خەم لە دڵی کۆترەکانی سەر گومەز و منارەکاندا دەربهێنین
خەم لە دڵی ئەو ڕیشۆڵانەدا دەربهێنین کە من و تۆ نایانناسین
برینی گیایەک ببەستین... شکانی چڵێک لە هەنار تیماربکەین
کەروێشکێکی چکۆلە لە پشیلەکان بکڕینەوە (کە ئەوانیش دڵیان نەشکێت)
پەپوولەکان فێربکەین کە دەبێت کەمێک زۆرتربن
مردن تێبگات کە کەمێک زیاتر لە بەردەرگاکەمان دووربکەوێتەوە

سەخت بوو... تۆ لە ئاو سادەتر و لە تەم نازکتر بوویت
من لە فڕین شاعیرانەتر و لە چیمەنەکانی باغچە بێدەنگتربووم
تۆ لە قەڵەم چکۆلانەتر و من لە کتێب تەنهاتربووم
ئەی یار... ئەی شەڕانگێزترین دۆستی من لەم جەنگەڵە تاریکەدا
ئەی یار... من لە جنسی موڵکدارە زۆردارە خۆفرۆشەکان بووم
چی کردمی بەم تەنبورژەنە بێڕەحمەی تارەکان بەرگەیناگرن؟
تۆ لە نەوەی ئەو میللەتانەی لە خوێنی یەک دەخۆنەوە
لە نەوەی ئەو جەنگاوەرە پایز نشینانەیت، کە نازانن ڕەنگی گیا چۆنە؟
لە قەفەزی ئەو ژنە دڕکاویانەدا گەورەبوویت، کە بۆنی بیابانیان لێدێت

چارەم نەبوو... چارەم نەبوو، خۆشەویستم
من لەبری ئەوەی خۆم لەسەر دەفتەرەکانی باران و فەرهەنگەکانی گیاو خاکدا بنوسم، خۆم لەناو گوناهەکانی تۆدا نوسی و لەناو لیستەی

ڕەشی عاشقەکانتدا مردم، لەبری ئەوەی لە موعجیزەی سیحربازەکانی ئاودا دەرکەوم، لە نابەینی پەنجە ئەفسووناوییەکانی تۆدا... لەگرێی دەستەسڕی سیحربازەکانی تۆدا و لە کڵاوی چکۆلەی سیحربازەکانی تۆدا بووم، لەبری ئەوەی لە درەوشانەوەی مانگ و غروری ئەستێرەکاندا دەرکەوم، لە درەوشانەوەی تۆ و غروری دەستەکانی تۆدا بووم، لەبری ئەوەی لەو پشکۆیانەدا بم کە پاسەوانەکانی زەمهەریر جێیدەهێڵن، لەو بارەشانەدا سووتام کە تۆ لە دوای خۆت بەجێتدەهێشت

ئەی یار
من لەدەرگاکانی ئەبەدییەتم دا
لە دەرگای بچوکترین ساتەوەختەکان
لە داخراوترین جەنگەڵ و بەرینترین ئاسۆ
لە ئۆقیانووسە تاریکەکان و فانۆسە خەمگینەکان
لە جەهەنەم و لە پزیسکی کوورە چکۆلانەکان
نا کەس لە مانای ئەم گۆرانیانە تێناگات
کەس باکی بە قەترەیەک شەونم نییە لە دۆزەخدا
کەس لەو ئاورنگە تێناگات کە بەسەر دڵمەوەیە
دووبارە دەبێت خۆمان بەخاک و دەفتەر و حەرفەکان بناسێنینەوە
من سەرابیترین پیاوی دونیا، نیشتەجێی کۆشکێک لە وەهم
تۆ کچێک لە هەڵمی ئەو دەریاچانەی (با) نایگاتێت
ئاهێک لە ئاهەکانی هوما
پرشنگێک لە پرشنگەکانی قەقنەس
دەبا خۆمان بە حەقیقەت... بە گیا... بەدەستە پاکەکانی باران بسپێرین/ دووبارە (با) ناومان لە سروودەکانی مردندا بنووسێتەوە/ باران بەو پەلکەزێڕینەیەمان بناسێنێت کە بەم جبەخانەی عەشقەوە بە

جەنگاوەرمان تێدەگات
عەشق سیمای منداڵان دەگۆڕێت بۆ سیمای سەرهەنگە یاخییەکان
بەڵام پەشیمانی
پەشیمانی ئەوە حیکمەتی لەیادچووەوەی جەنگاوەرەکانی عەشقە
دیسانەوە دەبێت خۆمان بە گریان و زەردەخەنە، بە وەرزەکان بناسێنینەوە
چونکە جەهەنەمی عاشقان جیایە لە جەهەنەمەکانی دیکە

تەواو... تەواو ئیدی حیکمەتەکانی عەشق بێکۆتاییە

سەیرکە خۆشەویستی بەرەو چ دەریایەکی بردین
عەشق سەختترە لە خەیاڵ... سەختترە لە جەنگ
سەختترە لە گۆرانی گووتن لە ژوورەکانی مردندا
دوای تێپەڕین لە دواهەمین پاسەوان کە دواهەمین هەناسەمان دەبات.
بەڵام من وەک سیحربازێک مسقاڵی ئەم زەرنیخەم لەسەر تەرازووی ئەم بازارە بۆ ناکێشرێت
عەشق جەنگە، بەڵام ئێرە بازاڕی خیانەتە

(من وەک سیحربازێک بۆنی زەردەخەنەی جەنگڵەکان لە لێوم دەهات، بەڵام فێربووم بەم دەمامکە سپیانەوە، خۆم لە پیاوە شەڕانگێزەکان ونبکەم و لەناو بازاڕی ئاسنینی ئەم پیاوە زرێپۆشانەدا، دەفتەرەکانی منداڵیم بدڕم و بڵێم: عەشق گەمەی منداڵانە و من گەورەبووم و بێگوناهم)

ئەی یار، خۆشەویستی فێری چ درۆیەکی کردین
ئەی عەشق... لەم ڕۆژی خۆشاردنەوەیەدا
ڕێگا بەم ئەستێرە خوێناوییانە دەدەیت بێنە ژورەکەمەوە؟/ ڕێگا بەم

ئەسپە زامدارانە دەدەیت لە ژێر پەیکەرەکانی ئەم باغچەی پەشیمانییەدا بمرن؟/ نا... ڕێگا بەم دەریاوانە پیرە مەدە، قولاپەکانی لەناو دڵمدا کۆبکاتەوە/ ڕەوا نییە، من دەرگا بکەمەوە و ملیۆنێک گەردەلوول و ملیۆنێک دزی تەنها، بێنە ئەم مەرقەدەوە/ ملیۆنێک گەڵای مردوو خۆیان بەسەفەری ئەم دارستانە خورافیانەدا هەڵواسن/ ئەو ئەسپانەی کە لەم زەوییەدا بۆنی مردن دەکەن، سوارە برینداره‌کانیان هەڵبگرن و بێن/ دەترسم، تۆ ڕێگا بەم ئاسمانە بدەیت، کە ئەستێرەکانی لێرەدا بفرۆشێت

بمرێت... وە بمرێت ئەو بایە

ڕێگا بەم گوڵانە بدەیت برینەکانیان لە دڵمدا کۆبکەنەوە

ڕێگا بەم کۆترانە بدەیت، فڕینیان لەسەر شانم بسوتێنن.

ئاه ئەی عەشق

ئەی ئەو عەترەی قەتارچییە ڕووخۆشەکان دەیکەن بە ڕێگاکاندا

لەم ڕۆژگاری تالانییەدا... تالانمکەن

چارەم نییە، خۆشەویستم، چارەم نییە... تالانمکە

لە بەرچاوی ئەم تۆفانەدا تالانمکە

لە بەرچاوی ئەم دزە ماندووانەی شەودا بازیبەندەکانم لێبستێنە و تالانمکە

ئەم قوبە و منارانە لە گیانم بستێنە

ئەم خوایە لەگیانم دەربهێنە

کەوەک داهۆڵ لەم کێڵگەی نورەدا چەقیوە

(تا پاسارییەکان بەسەر سەرمەوە نەنیشنەوە)

ئەو خودایەی وەک گوللە نایان بە ناوچاوانمەوە.

ئەی عەشق، لەبەر چاوی ئەم سوپا ئیمپراتۆرییانەدا تالانمکە

لەبەرچاوی ئەم دەریایانەدا بمکوژە، کە شەرمدەکەن نەهەنگە عاشقەکانی

خۆیـان بکوژن
کە ئێستا ڕۆژگاری تـالانییە
لەبـەردەم ئـەم قەڵایـەدا تـالانمکـە کـە شـەرمەکات قافڵە عـاشقەکانی خۆی تـالانکات.

هەناسەکانم بۆ تۆ و ئێسقانەکانم بۆ مردن
وشەکانم بۆ تۆ و پەنجەکانم بۆ مردن
دەریاکانم بۆ تۆ و ماسییەکانم بۆ مردن
جەنگەڵەکانم بۆ تۆ و باڵندەکانم بۆ ئەو
خاچەکانم بۆ تۆ و بزمارەکانم بۆ ئەو

ئەی یار لەم ساتی تالانییەدا، تالانمکە، چونکە من هاتووم تالانتکەم
ڕەشەباکانم لێبستێنە، چونکی من ئەستێرەکانت لێدەستێنم
مزگەوتەکانم لێبستێنە، چونکە من باغچەی گشتیت لێدەستێنم
بورکانەکانم هەڵگرە، چونکە من تۆفانەکانت دەبەم
تالانمکە چونکە من هاتووم بەم سکە زێڕینانەی عەشق
سەوای ئەم ماسییە دوورانەی ناو دەریا دەکەم
سـەوای ئـەم مردووانـە دەکـەم کـە جەهەنـەم نایانگۆڕێتـەوە بـەم بارمتـە زیندووانـە/ سەوای ئـەم شمشـاڵانە دەکەم کە شمشـاڵژەنە سوخۆرەکان داوای مانگم لێدەکەن بیفرۆشم/ ئـەم کتێبـە دەکـڕم و ڕۆحـی خـۆم بەبارمتـە لای ئـەم کتێبفرۆشـە دادەنێـم

ئەی عەشق
ئەی عەشق بەدگومانم لەم بروسکەیەی لەگەڵ سیمرغەکاندا هاتووە
بەدگومانم لەم بایەی لەگەڵ قەلەڕەشکەکاندا دێت

دەکراسەکەت داکەنە و فێری تەنهایم بکە
لەبەر ئاوێنەکاندا دانیشە و فێرمکە خۆم بۆ ئەم کەرنەڤالی بروسکەیە برازێنمەوە
لەبەر دەریاکاندا دانیشە و فێرمکە چۆن ئەم ئەستێرە وەریوانە کۆکەمەوە
فێرمکە جەهەنەم و بەهەشت لە یەکتر جیابکەمەوە
ئاخر موسیبەتی عاشقان ئەوەیە
جەهەنم و بەهەشتیان بۆ لەیەک جیاناکرێتەوە
دە ئەم جامەی شیوەنە بگۆڕە
با چاوم بەو ئەستێرانە بکەوێت کە لەسەر لەشتدا دەکوژرێن
با جێخەنجەری ئەو مەغۆلیانە ببینم
با زەخرەفەی ئەو دیکتاتۆرانە ببینم

ئەی یار
حاشا لەم نەتەوانە بکە
حاشا لەم درەختانە بکە کە دڵیان وەکو تیترواسکی مردوو بە لقەکانەوە شۆڕبۆتەوە.
ئەی تەمەڵترین قوتابی ئەم ماتماتیکی مردنە
حاشا لەو شیعرانە بکە کە قافیەکانیان ژمارەیە و کێشەکانیان لە مسە.
حاشا لەم پەپوولانەی جەهەنەم و
حاشا لەم ئیمپراتۆریەتی جەبر و
حاشا لە لۆگاریتمی ئەم دڵدارییە ڕەشانەی نیوەشەو

چارە نییە... موسیبەتم... چارە نییە
با لەم ئاهەنگی سەمایەدا، من و تۆ دەست لەیەکتری بەردەین
دەستەسڕەکانمان ببەستین بە ناوچەوانی ئەم (با)یەوە

**کە من و تۆ دوو سەماکەرین قەدەر کۆیکردوینەتەوە**
**تۆ هەمیشە بەسەر خەڵوەتی مندا دێیت لەگەڵ باڵندەکاندا**
**بەسەر پیربوونی مندا دێیت**
**بەدیار شۆڕەبییە ترساوەکانی دوای تۆفانەوە**
**من بەسەر ئەو ساتانەدا هاتووم کە تۆ ئەسپەکانی خۆت دەنێژیت**
**من بەسەر ئەو سەرابانەدا هاتووم کە تۆ ئەڵماسی حەقیقەتەکانی تیا دەشاریتەوە**
**بەسەر ئەو خەیاڵانەدا هاتووم کە کسپەی فیراقیان لێدێت**
**بەسەر تەپوتۆزی نغرۆبوونی ئەو شارانەی تۆدا هاتووم**
**کە وەک تەمێک لەسەر زەوی جێدەمێنێت**

**ئاساییە... موسیبەتم... ئاسایی**
**عاشقان هەمیشە دواهەمین میوانن دەگەنە سەر ئەم سفرەیە، لەبەرئەوە هەمیشە بەسەر وێرانەی یەکتردا دێن**
**گوێم لێبگرە:**
**من بەدگومانم، لەم میللەتە باڵدارانە / بەدگومانم لە چلوچێوی ئەم کیمیاگەرە ڕەشانە/ من ناکۆکم لەگەڵ ئەم ئەستێرانەدا کە لە نێو چاوانمدا دەسوتێن/ ناکۆکم لەگەڵ ئەو موعجیزەیەدا کە لە دەستەکانم ڕواوە/ ئاشوفتەترین دەروێشی ناو ئەم بایەم/ ناکۆکم لەگەڵ بورکانەکانی ڕۆحمدا. ناکۆکم لەگەڵ مەنجەنیقەکانی سەرابدا/ ئەی یار، شەڕ بەم ئاسمانانە دەفرۆشم کە دەرگایەکیان نییە من لێیبدەم/ شەڕ بەم زەوییە دەفرۆشم کە پەنجەرەیەکی نییە بمداتێ/ شەڕ بەم پەلکەزێرینانە دەفرۆشم کە باڵیان نییە بمدەنێ و لەگەڵ هەموو وەرزەکاندا دوژمنم ئەمەش دواهەمین حیکمەتی منە.**

**عەشق شەڕێکە بێکۆتایی لەگەڵ خوا و لەگەڵ سروشت و موعجیزەکاندا و عاشق هەمیشە دەدۆڕێت**

**ئەی عەشق ڕێگا بەمَ ئیمپراتۆرە تەنهایە بگرە**
**کە غرور لەبەرامبەر گوڵەکاندا دەیکوژێت**
**شەریعەتی مێخەک بە کەڵکی پاکبوونەوە نایەت لەم شەرمە**
**شەریعەتی باران بەکەڵکی پاکبوونەوە نایەت لەم خوێنە**
**شەریعەتی شەونم سوودی نییە بۆ سارێژکردنی ئەم شەرەفە**

**من زەمهەریری ئەم دەستە ساردانە و ئەم ڕۆحە ساردانە دەمکوژێت و تۆ باس لە هاوینی ئەم پەتا کوشندەیەی خۆشەویستی دەکەیت لەنێوان بوکەشوشەکاندا/ من بێڕەحمی ئەم دایک و ئەستێرە... ژن و دەربەند... پیاو و هەتاوانە دەمکوژێت و تۆ باس لە گەرمی ئەم فێ عاشقانەیەی نێوان پەیکەرەکانی ژێرباران دەکەیت.**

**حیکمەتی باغچەکان بەس نییە بۆ ئارامبوونەوەی ئەم بەدمەستییەم**
**حیکمەتی قارەمانەکان بەس نییە بۆ شکاندنی ئەم جەنگاوەرە شێتانە**
**من بەم نەخشەی جەهەنەمە، کوچەی ئەم خۆشەویستییەم بۆ نادۆزرێتەوە**
**بەم ئەستەرلابی سەفەرە، دەستم لە شێتیدا دەلەرزێت و تۆم بۆ نادۆزرێتەوە**
**من بەکەڵکی پیرێتی نایەم لەم گەردەلوولەدا**
**کە چاوم هێندە کز بێت گوڵەکانی مردن نەبینم**
**کە لە دوورەوە سێبەری کارگە وەحشییەکانی جەهەنەم نەبینم**
**چ شۆخییەکە لە جوانیدا مردن**
**تا لە دەرگای جەهەنەمەوە، ڕووبەڕوو قسە بەرامبەر خوا بکەیت**

چ شۆخییەکە لە جوانیدا مردن...چ شۆخییەک

دوا جار ئەی عەشق
تۆ بۆنی ئەو مەغۆلییانەت لێدێت کە جەستەی سەربڕاوی باکانیان بە دەرگاکانمدا هەڵواسی

قەدەرێکی بەدە، کە عەشق هەمیشە پاشماوەی جەنگەکانە

گۆرانی خۆت بڵێ... گۆرانی جەهەنەمی خۆت
گۆرانی من و تۆ لە شەوێکدا کە فیتنەی نێوان ئەم میللەتانە هەڵدەگیرسێت
درۆیە ئەم ئاشتییە، درۆ... بەیانی جەنگ هەڵدەگیرسێت
ئیدی دەبێت، خۆمان بە تۆپ و تفەنگ و گوردانەکانی شەڕ بناسێنینەوە
چ قەدەرێکی بەدە، کە عەشق هیروگلیفیایەکی جەهەنەمییە.
من بەرپرسیارم لەو هەورەی بە چڵی ئەم درەختانەوە خۆیدەکات بەم مەنفایەدا
بەرپرسیارم لەو بارانەی لەژێر جبەی ئەم میوانە بەدگومانەوە هاتووە

بەیانی جەنگ هەڵدەگیرسێت
بەیانی... بەیانی جەنگ هەڵدەگیرسێت

تۆ سەبووری مردووە خەمبارەکانی من نادەیتەوە، کە بێدەنگ لەسەر سەکۆکان پشوودەدەن
ناهێڵێت بریندارەکانی (من) خۆیان بەم دارانە بخنکێنن
منیش بەرپرسیارم لەو مردوانەی باران بەمنی دەسپێرێت
(ئەمە نهێنی نییە و هەرگیز نهێنیش نەبووە)

**شاعیرەکان هەمیشە لەگەڵ مردووەکاندا دۆستن**
**عاشقەکان هەمیشە لەگەڵ ڕەشەباکاندا بران**

**ئەی یار... زویر مەبە... بەهەشتی عاشقان شێتخانەیە**
**زویر مەبە... سەیرکە من و تۆ چ ئیمپراتۆرێکین**
**ئەوەی (با) لە خەزنەکانی جەنگەڵدا جێیدەهێڵێت**
**پاسەوانە مەستەکانی گیا و شەونم دەیبەخشنە من و تۆ**
**ئەوەی لە باڵندەکان جێدەمێنێت دوای مردن لە زەمهەریردا**
**(با) دەیبەخشێتە من و تۆ**

**ئەو گوڵانەی لە وەرزەکان جێدەمێنن،**
**تاعونەکان دەیدەن بە من و تۆ**
**ئەوەی لە ئاوازەکاندا دەسوتێت، دوای هەرەسی ئۆپراکان**
**من و تۆ لەناو خۆڵەمێشەکەیدا سەمادەکەین**
**سەیرکە، سەیرکە چ سامانێکمان هەیە**
**خەزنەکەمان، چەند لە خەزنەی پادشاکانی (با) و (مردن) پڕترن**

**من لە سەراب و گیا و برینی نەیزەکانەدا، لە ئەمیری دەریاکان دەوڵەمەندترم/ تۆ لە خەون و پرسیار و بەدگومانیدا، لە دڕندەترین ڕەبەنی بیابان پیرتری/ ئەی یار سامانی خۆت لە کۆشکەکانی سەراب و دۆنمەکانی خەون بژمێرە/ با پێت بڵێم چەند فەدان گوناهم هەیە و چەند کیشوەرم داگیرکردووە لە تەنهایی/ ئەی ئەمیرەم بیژمێرە، چەند دڵۆپ بارانت دەوێت/ چەند نەیزەکت پێویستە بۆ شەو و چەند پەلکەزێڕینەت دەوێت بۆ بەیانی**

ئەی یار
تۆ سەر لەم سەرافە دڵتەنگانەی پایز دەرناکەیت، کە گەڵاکانت بۆ دەگۆڕنەوە بە (با) و باکانت بۆ دەگۆڕنەوە بە هەور، گرەو لەم سووخۆرە پیرە نابەیتەوە کە ئەڵماست دەداتێ و بارانت لێدەکڕێتەوە، بەڵام بۆنی یەقین لەم قاسە پڕ لە ئاگرەی من و تۆ دێت، بۆنی ماچ لەم خەزنە پڕ لە ڕیسواییەی من و تۆ دێت.

ئەی یار
بەیانی دێت و مەرگ دێت و پایز دێت و تۆ دێیت و عەشق نایەت
عەشق دێت و بەیانی نایەت و پایز نایەت و تۆ نایەیت و مەرگ نایەت
تۆ دێیت و عەشق دێت و بەیانی نایەت و پایز نایەت و مەرگ نایەت
تۆ دێیت و عەشق دێت و بەیانی دێت و پایز نایەت و مەرگ نایەت
تۆ دێیت و عەشق دێت و بەیانی دێت و پایز دێت و مەرگ نایەت
مەرگ دێت و بەیانی نایەت و عەشق نایەت و پایز نایەت و تۆ نایەیت
سەیرکە هەرگیز لەگەڵ مەعجیزەکاندا کۆنابینەوە

بەڵام عەشق
ئەمری خۆی دەداتە ئەو سوارچاکانەی لە ئەسپەکانیان دانابەزن
من و تۆش دوو پیادەین لە ئاو
دوو پیادەین لە ئەومکانی تەپوتۆز
لەژێر سێبەری ئەو باڵندانەدا دەمرین، کە بەرەو جەهەنەم دەفڕن
دەمرین و نهێنی ئەم وەنەوشە خائینانە لەگەڵ نهێنییەکانی خۆماندا دەسوتێنین/ دەمرین و نهێنی نێرگسە نائومێدەکان لەم ئاوێنە چکۆلانانەی بیاباندا دەشارینەوە/ دەمرین و ڕازی ئەم دەریا ئاگرینە دەکەین بەژێر لمەوە

**ئەی یار**
**جەهەنەمە بچکۆلەکانی خۆت لە گیرفانتدا بشارەوە**
**تابووتە زێڕینەکانی خۆت لە قافڵەی مردنتدا بشارەوە**
**ئەستێرەکانت بخەرە نێوانی دەفتەرەکانت**
**ئێرە دەرگای جەهەنمە**
**من ڕابوردووی خۆم لە ناو ئەم لمەدا بەجێدەهێڵم بۆ دەریا**
**ماچەکانی بەیانیم و پەپوولەکانی پیریم لەم جەنگەڵەدا بەجێدەهێڵم بۆ ڕێبواران**

**چ چارەنوسێکی تاریکە... کە عەشق پاشماوەی خوێن و تەنهاییە**
**ئەی یار.. بڕوانە لەبەردەم مردندا، عەشق چ جەنگێک بەرپادەکات و چ ئاشوبێک دەگێڕێت**
**جەنگێک کە پێمانخستە دۆزەخەوە**
**جێیدەهێڵین بۆ جەنگەڵ و ئەستێرە و دڕندەکان... تەواویکەن**
**جێیدەهێڵین بۆ دەریا و هەور و عاشقەکان... تەواویکەن**
**جێیدەهێڵین بۆ گیا و نەورەس و فریشتەکان... تەواویکەن**

**تشرینی دووەم ١٩٩١**

# ١

**پشووبە، قەڵەمی سەراب و مەرەکەبی ئاشوب لێرە نییە**
**بۆ هەناسەی گیاکانە ئەم دەفتەرە**
**بۆ لێوی ئاسنینە ئەم خەندەیە**
**کۆتایی ئەم جەژنە شوومەیە و ماندووە ئەم زەنگانە**
**هێمن بە**
**لاوازە ئەم ئەستێرەیە و خوێنی ئەم مانگە بریندارە لە تەرزەیە**
**سەیری ئەو باڵندانە مەکە لە ئامێزی فریشتەکاندا خەوتوون**
**سەیری ڕووتی فریشتەکان مەکە لە ئامێزی یەکدا خەوتوون**
**دەست لەم کاتژمێرانە مەدە، یاری بە وەرزەکان دەکات**
**چی لە دەستی ئەم خوایانەدا نوسراوە... گرنگ نییە**
**ڕۆحی ئێمە لە سەرەتای زەماوەندەوە، ژەهراوییە**
**فریو مەخۆن**
**بە بڵێسەی ئەم بورجە خاکستەرانە**
**دەڕۆین بە مژدەی ئەم لالەزارە ئاگرینە**
**لە ترسی ئەم دەریایە، ئایەتی بڵێسەکان بەسەر دڵماندا دەخوێنین...**
**ئەوەی ئینجیلی ئاگری پێنییە... با بەم کوچەیەدا گوزەرنەکات**
**ناهەق نییە... فریشتەکان لەو ئاوە ساردانەدا، دەنگی خوا لە پێستیان دەشۆن/ پەنجەی خوا لە ژێر مەمکیان و سەدای ئەو لە دەنگیان دەردەهێنن/ بەبێ ئایەتی ڕاوە ئەم ماسیگرتنە سەیرە/ نە سروودی دەریاش دەزانین... لێرەشدا ماسی نییە.**

لێرەدا ژیان نییە... ئاو هەیە، هەوا هەیە، گیا هەیە، ژیان نییە
ئەی ڕاوچی کۆترە بەهەشتییەکان... لە کوێیە، هەرەسی بەهەشت؟
بۆنی حۆرییەک نییە/ هەناسەی خوایەکی خنکاو نابیستی/ گوێت لە
شکانی شوشەی پەلکەزێرینەیەک نییە/ لاشەی دڵدارە بەهەشتییەکانمان
لێدیارە/ وێرانەی میوەکانی خەیاڵمان لێدیارە
بەڵام ئێرە بەهەشت نییە
فڕین هەیە... هێلانە و ئاسمان و قەفەز هەیە... بەڵام باڵندە نییە
بڵێسە لەم جەنگەڵانە هەڵدەستێ...
بورکانییە دەریا
چ شەوێکە، ئاگر و ئەستێرە و مانگ هەیە... بەڵام ڕوناکی نییە
ئەی ئەو پیاوەی بۆ سەدەفەکان، خۆت نوقمی ئەم ئاوە دەکەیت
درەنگ هاتوویت، ئیدی مرواری نییە
درەنگ هاتوون
ئەی تۆڕە بەربەرییەکان... مەغۆلی دوژمن بە خوێنی پەپوولە
تاراجی زەوییەکی تاراجکراو نییە
سەیرکەن... ڕەنگ و بۆن و زەوی هەیە... بەڵام گوڵ نییە.
شەونمە سەر مەچەکی ئەو قەیاغکێشە ماندووانەی ژێر مانگ
درەنگە، شمشاڵژەنی تەنهایی پڵنگەکان
درەنگە دایەنی شێرە کەفتەکارەکان
سەیرکەن
قەفنەسە و لەم بێشانەدا چاوەڕوانی ئەفسانەیە
چنگی شێرە هەڕەشە لە پەرستگا نفرۆکان دەکات
هەڕەشە لە پەلکەزێڕینە ڕزیوەکانی ژێر باران دەکات

پشوویە، ئەی پاسکیلسواری سەر زیخەڵانەکانی دۆزەخ/ بۆن بەو گوڵانەوە مەکە با سییەکانت نەسوتێت/ ئەی ماتۆڕ سواری ڕووت لە سەر مانگ/ خوودەکەت پڕبکە لە نەیزەک و بنوو/ یادگارەکانت هەڵواسە بە ئەستێرەیەکدا، سەعاتەکەت بشکێنە و بنوو/ پشوویە، ئەی ئەو کچە بێقاچەی کەوتوویتە ناو ئەم ماراسۆنی لەزەتەوە/ لە سەر ئەم پشکۆیە تلدەدەیت و ڕەحمت پڕ بووە لە گوڵ/ لێرە پێکەوەنوستن هەیە... ماچ هەیە... لەزەت هەیە، بەڵام ئادەمیزاد نییە

گیا دایەنمان بوو، هەورەکان بە مەمکی پڕ لە بروسکەوە شیریان داینێ
وەک گوناهبارەکان گەورەبووین
ئەوەی وەک گوناهبارەکان گەورە نەبێت... سەفەرناکات
ببینە...
شەڕ لە سەر دوربینەکانی (با) دەکەین
گەڵایە باڵ و لە ئاوە دەسترازەمان
ڕامانژەنن ئەی ئەو دورگە بەنازانەی جاڕزن لە گریانمان/ لەو سەرما کوشندەیەدا سێبەری یەکترمان لەبەردەکرد/ هەزارەها منداڵ بووین، لە شاخە بڵندەکان هاتینەخوار/ باوەڕمان بە (ڕێگا) نەبوو/ نائومێدی دەستیگرتین/ خەبەرداربووین، لە ئاهەنگە سامناکەکانی ژێر خاک/ گوێمان لە سەمای ڕەگەکان و شیبوونەوەی زەمین بوو
ئەمەیە دەنگی ئاسنگەرە مردووەکان و زرنگەی کانزا سەختەکانیان؟
کەوتین بەسەر وەسیتی شاردراوەی جەنگاوەرەکاندا
بەسەر جەنگی ئەو بنەماڵانەدا، کە میراتی بورکانەکانیان بەشدەکرد
شکاتی ئێسکەکانمان لە گیا... پاڕانەوەی کەللەسەرەکانمان لە بەرد، گوێ لێبوو
دەنگێکی ترساو گووتی: چارە نییە، با بڕۆین بەرەو کەرنەڤاڵ

**وای...**
**ئەم ئیمپراتۆرە برسییانە بۆ دەگرین؟**
**ماسیگرەکان لە حەسرەتدا سەر بە دەریادا دەکێشن**
**ئەم جانەوەرانەی خاک، دارستانەکانیان کاولکرد**
**باڵندە پەرەوازەکان دڵی ئەستێرەکانیان زامدارکردو**
**دەنگێکی وەکو بروسکە گووتی: چارە نییە... چارە نییە، با بڕۆین بەرەو کەرنەڤال**
**هەزارەها منداڵ دوعایان بەسەر کێڵگەکاندا دەخوێند، بە دیار پەتای چەمەنزارەکانەوە گریان**

***منداڵێک گووتی:**
**سەر ئێشەی ئەم تاڤگانە دەمانکوژێت/ نەخۆشی ئەم (با) یانە درمە/ حیلەی ئەم ئەسپانە بۆنی سیلی ناو لەشکرە دوورەکانی لێدێت/ زۆنگاوێک لە مەرگ لە ڕێگای ئەم پەپوولانەدایە/ با ڕوناکی مۆمەکان لە ئاوێنەکاندا هەڵگرین/ بارەش بئاخنینە ئەم شوشە شەرابە بەتاڵەوە/ سروشت... ئەستێرە دووزمانەکان... ئەو ئاوانەی کە شووناکەن، ئەم فیتنەیەیان هەڵگیرسان/ چاکترە... بەڵێ چاکترە... لە بەر شمشاڵی وەحشیانەی ئەم تاڤگانەدا دانیشین/ بە نوری برۆنزی ئەم مانگانە، دووبارە خۆمان بدۆزینەوە/ با تێکەڵبین بە مارشی ئەم دێو و درنجە پیرانە/ تێکەڵبین بە ئاهەنگی ئەم تارماییانەی شەرابیان لە ئاگرە/ لە ناو کریستاڵە چلکنەکانی ئاسماندا، باڵندەکان خەوتوون.**
**ئێمەش خەوتنمان نییە**
**یان با بمرین... یان بڕۆین بەرەو کەرنەفال**

* منداڵێک دوربینە ژەهراوییەکان کوێریانکرد و گووتی:
خەزێنەی پایزێکی کۆن لە کەشتییە خنکاوەکاندا دیارە/ شەو قفڵ لە شار و دەریاکان دەدات/ ئیتر پێوستیمان بە چاو نییە/ پیاوکوژەکان ڕۆژ لەم تاریکییەدا نامانگەنێ... مۆتەکەکان... شمشێری فریشتەکان... ئەرکەکانی خوا نامانگەنێ/ ئێمە لە تاریکیدا جوانین... لە تاریکیدا ناتەواوییەکانی بەهەشت تەواو دەبێت/ بەم قفڵە ڕێگاکان دواییدێت و کێلونی ئەم دەرگایە گۆڕە/ زیندانی ڕووناک... سەفەر لە ژێر خۆردا... ژیان لە چاوەڕوانی خەلاتی ئیمپراتۆرەکاندا تەواو دەبێت/ ڕۆژگاری قافڵەکان... بۆنکردن بە گوڵەوە ئاوادەبێت
بۆ جەهەنەم هەموو هەڵفڕینەکان بە سەوداسەری خۆرەوە...
بۆ جەهەنەم ڕۆژوگرتن تا خۆرئاوابوون
ڕکاتە پارچەپارچەکان... پارشێوکردن لەبەر ڕوناکی مانگدا
بڕیاربدەن، یان با لێرەدا کوێربین

یان بڕۆین بەرەو کەرنەڤال

* یەکێکی نەناسراو گووتی:
سەیرکەن باڵی باڵندەکان بەر سەقفێکی ئاگراوی دەکەوێت/ ئەم بێچووە کەنارییانە بە مەڵبەندی زەنگە جەهەنەمییەکاندا دەفڕن/ کوکوختییەکان بە ناو بارووتدا کۆچدەکەن/ ڕۆژگارێک دێت، باڵندە شەڕانگێزەکان جێگای مرۆڤ دەگرنەوە/ (پارە) دەکەنە سفرەی ئاو و دانەوێڵە/ دەنگی ئێمە لە هاواری قوڵنگ و شاهێنەکاندا ون‌دەبێت/ ئێمە دەبێت لە قەفەزەکاندا بخوێنین... هەرزن بخۆین
لە دارستانەکان دەرماندەکەن، لە دانیشتنی گوێ ئاوەکان
لەم زەوییە ناتەواوەدا ئەو گومەزانە دەبن بە شوێنی کۆنگرەی شەڕ

منارەکان دەبن بە شوێنی پشوی لەقلەقەکان...
گوند بۆ هەڵۆ و شار بۆ قنس و تاووسە ئەرستۆکراتەکان
ڕۆژگارێک دێت... زەوی پڕدەبێت لە وڵاتی نوێ... ئیمپراتوریەتی تازە...
جوگرافیای دیکە... تاجی دیکە/ ئیدی ئەم شەرەفە ساختەیە دەچێتە سەر
دەمامکەکان/ ئەم ژیانە دەکەوێتە سەر شانۆ/ خۆمان بە جۆری شمشێر...
چڕی تێزاب... چەقۆ تیژکردنەوە، سەرقاڵناکەین/ هاواری ئامادەبوون،
پەلاماردان، پاشەکشێ، قریشکەی تۆپ، لەناو چاونماندا وندەبێت
بەرەو زانستی دیکە...
جیۆلۆجیای خۆشەویستی هەنگاو دەنێین
بۆ ڕۆژگارێک کتێبەکانمان پولێک ناکات
تێدە پەڕین گیای شەو خەونەکانی خۆیمان بۆ باسدەکات
با، ئەزۆکی... ئاو، ئەتکبوونی کچێتی خۆی
هەزارەها منداڵ دەبین، پاڵە پەستۆمان بۆ هەڵهاتنە
تا ڕۆژگارێک شیرەخۆریمان ئەبەدییەتە و ئاریبوونمان خورافات
بە گاگۆڵکێ دموری مەغۆڵەکان دەبینین
دەبین بە تەیموری ئەم شیرەخۆرانە
بە جەنگیزی ژێر ئەم سێبەرانە
گەر دەتانەوێت شمشێرەکانتان کول نەبێت
با بڕۆین بەرەو کەرنەڤال

*کچێک وەک ڕێوییەکی زۆرزان، بەو منداڵە شەرمنانەی گووت:
سەردەمی فڕو فێڵ، تەڵە، سیحرکردن لە خۆر ئاوابوون دێتە پێشێ/
(با) چارۆکەی شوانەکان پڕدەکات لە نوشتەی گورگانە/ بەهار کۆشی
کچان لە ڕێواسی کوشندە

بەڵام وای چ فریونکە
بەروبومەکانمان لەبەر خۆردا دەڕزێت/ میوەکانمان بەم خوانە پێدەکەنن/ تانە لەو شەرابە دەدەن کە بەخوێن گیراوەتەوە/ ئێمەش جگە لە شەرمەزاری هیچمان نییە/ ئاڵتون و هەمیشە ئاڵتون بۆ وەرچەرخانی فەلەکە بچکۆلەکان/ ڕتووشکردنی ژیان بە بریقەی کانزاکان
با ڕوو لەو ئاهەنگە بکەین، کە چەپڵە ڕێزان بۆ سەماکەرەکانە/ بۆ بست بە بستی ڕووتییە... سەیرکەن، پیاوان کاسی باڵای ژنەکانیان وەردەگرن/ پێشبڕکێی ماچکردن دەستپێدەکات، پێشبڕکێی خۆ ڕووتکردنەوەی کچان دەستپێدەکات/ بنوو، لە ناوەڕاستی ئەم ڤیستڤاڵەدا ئەی سەرخۆش
لێرەدا مەرگ، سوتان، نوقمبوون هەیە... بەڵام گۆڕ نییە
فەسڵی گۆڕان، گەڕان بۆ کانگاکانی زیو و زێڕ و ئەڵماس بە سەردەچێت / مردن بەسەر بڕین و کوشتن و خنکاندن بەسەر دەچێت / سوکترین ڕێگا بۆ کۆتایی/ پادشایەتی سیاناید... بە گشتیکردنی زەرنیخ... کۆدیتای ژەهرپەرستەکانە
سوپای ئەم میللەتانەی باوەڕیان بە خۆکوشتنە، پایتەختەکان داگیردەکەن
لەشکری دوژمن دیوارەکانمان پڕدەکەن لە دروشم
وای... فریاناکەوین، خۆمان فڕێبدەینە ناوەکانەوە.
فریاناکەوین ئازایەتی تاقیبکەینەوە
سەرفرازی لە پاشەکشێدایە لە کۆنگرەی ئەم میللەتە شوومانە
بۆ هیچ بەند و باوێک گوێنەدان
خۆ نەبەستنەوە بە تیزابی حەرفەوە
گەر بەرگەی ئەم یارییە ناگرن

با بڕۆین بەرەو کەرنەڤاڵ
پشووبە خێڵێک لە پەپوولەی شەرابی و گرێک لە دۆزەخی عەشق

**ئاو هاندەری ئەم گرەیە... لافاو تۆی داگیرساندووە ئەی چرا پشوویە**
**بادارە ئەم دارستانە ئیفلیجە... شەلە ئەم ئەستێرەیە**
**ئالای سەر بورجەکانی دەریا ملکەچە... تامی ئەم خەیاڵە لە زریانە**
**ئەی شۆفێری دڕندەی ناو ئەم سەرابە**
**کەرنەڤال لە کوێیە... لە کوێ؟**
**ئەم دارانە تەرزە دەگرنەوە ئاسمان**
**بۆمبای ئەستێرەییە ئاسمان لەم ئاوی سەرابانەی دەگرێت**
**لەناو ئەم تەرزە و بارانی تیشکەدا ناتوانین بیربکەینەوە**
**بۆ کوێ بڕۆین**
**ئاگر، کەشتی شکاوی ئەم سیحربازانە بوو**
**شێتەکان بە خۆیان و دۆلفینە بادارەکانیان**
**منداڵان بەخۆیان و بوکەشوشە زگپڕەکانیان**
**ڕێگاش بە سەمفۆنیا ساردەکانی**
**ڕامانکێشێت**
**ڕووەو تونێلی ئاوریشمین... بەرەو ئەم گومڕاییە سەوزە**
**(چ قەیاغێکی ڕەوایە/ لەتکردنی میوەی باغەکانی گومانە/ تەیکردنی هالاوی مۆری مردنە)**
**بە دەستنوێژی شەرابی ئەم کوفرە، ڕێمکەوتە ئەم زەماوەندە**
**(ماچی شمشێرە بۆ گوڵەپەمووە نازگەکان/ لە ئامێزگرتنی ئاسنە بۆ پەپوولە)**
**پەتامان بدەنێ... پەتای ئاو**
**با (زاوا)ی لە گەنم خوڵقاوی لەشی ئەم ئەستێرە بین**

**بە بێ پەتا، چۆن بڕۆین بەرەو کەرنەڤال**

گالیسکەی شێتیمان دەوێت، گوناهی ئاسنینی ئەم مەیخانەیەی پێبەرین/
ساقی گومڕامان دەوێت، شوشەی ئاگرینی ئەم بادەی تێزابە بگێڕێت/
شێی سەر بەردەکان هەڵبگرن/ ڕەنگە بیابان بێت (کەرنەڤاڵ)
بورجی هەورەکان ناگرین... سەفەر لە جانتاکانتاندا بشارنەوە
حیکمەتی هەنگ... غەریزەی پەپوولە... گومانی پاساریمان بدەنێ
کێ خەنجەری لە مانگ تیژتری لایە
گورزی لە مەدارەکان گەورەتر... دەربێنێت
ڕەنگە دوژمن بێت (کەرنەڤاڵ)
پاڵتۆی گیا... سەوزی تەقینەوەی بورکانەکان لەبەربکەن
کەس ڕەنگەکان لە یادنەکات
ڕەنگە پایز بێت (کەرنەڤاڵ)

* * *

بلیاردی لەدایکبوونی ئەستێرەکانمان دۆڕاند
زەوی بەم یارییە کوشندەیە، هەموو زەوییە چکۆڵەکانی زگی دۆڕاند
ئەم خۆڵە موتوربەناکرێت
ئەم ئەستێرەیە گۆپکەی ئەستێرەیی ناکات
جەنگەڵەکان هێندە بەسەر زاری ئەم یارییەدا قیژاندیان، دەنگیان نووسا
ئاوەکان بەسەر ئەم ئەسپە ئیفلیجانەدا... هاواریانکرد
وای لە پایز، فەسڵی قوماربازە بێهۆش و کەمتەرخەمەکان
لە ناو ئەم گەلایەدا، بۆ ئازادی مەگەڕێ
(ئازادی چی؟ ئێمە ئەم ئەستێرەیەمان دۆڕاند)
ڕەنگەکان لەم سەهۆڵبەندانەدا هەڵگرن... نەبا بڕزێن
جزدانەکانتان پڕبکەن لە گوڵ و جزمەکانتان لە هەتاو

دەشێت تاریک بێت کەرنەڤال
بۆ ناسینەوەی خوێن و چاندنی فڕین لە دەستماندا
قوم لە خوێنی ئەم جەنگە بدەن
حیسابی ئەم فڕینە تەلیسماوییە هەڵگرن

ئەی بەتاری ئەم گیتاری کۆچە گەشکەگرتوو
دیدەڕوون بە کەمانی سەفەر
بەدە ئەم زەماوەندە
کە کێل دەمی مردووەکان ماچدەکات
کاسەسەر سینەی ئەم گەردەلوولانە دەمژێت
کچانی عەیار بەم گیا داوێنپیسە، خۆیان ووشکدەکەنەوە
وای لەم زەماوەندە... وای
بۆ مشتێ (نور) نەیزەکێک سەربڕن
بە دڵی ورشەداری ماسییەکان، نەهەنگەکان بکەن بە برای یەکتر
سەیرکەن... ئەمڕۆ (با) لە ناو (با) دا بۆ نهێنییەک دەگەڕێ
ماسی لە ڕۆحی ماسیدا بۆ میراتێک وێڵە
باڵندەش لە کۆچەکانیاندا بۆ دەستنوسی فڕین، لە ئەستێرەکان دەپرسن
سەیرکە... سەیرکە... سەیر
(با) قفڵی بورکانەکان پارچەپارچەدەکات/ چەتەیەک شەونم سەرخۆشدەکات و بەرتیل بە ئاوە هێمنەکان دەدات/ سەرهەنگێک لە پەلکەزێرینە، شاهی ئەم کیشوەرانەی زەهرخواردکرد
هەمووش لەم زەماوەندەدا هاواریانکرد:
با بڕۆین بەرەو کەرنەڤال... کەرنەڤال لە کوێیە... لە کوێ؟
لە کوێیە کەرنەڤال... لە کوێ؟

## ٢

دەچووین بەرەو کەرنەڤال
دۆزەخەوانێکی پیر بیریخستمەوە کە لە خۆراکی سووتانم
ڕەشەبایەکی زمانزان،
خۆڵەمێشی ئەم گوڵە فریوبازانەی ئەهریمەنی بۆ خوێندمەوە
«بەرەو مەنفا، ئەگەر یارمەتی هەیە»... بە دەلیلە مەستەکانیان گووت
«بۆ جەهەنەم، ئەگەر تێشوومان پێیە»
ئاه ئێمە لەو منداڵانەین کە کرێی سەفەر نادەین
«ئێمە ئەسپمان پێ نییە»... کوێرەکان دەیانگووت
«من تفەنگم پێ نییە»... کەرێک لە گەردەلوولەکاندا دەیقیژاند
ئابەلەدەکان دەگریان و دەیانگووت : «ئێمە ڕێگا نازانین»
(بەڵام نەدەبوایە ئاوڕ لە دواوە بدەینەوە/ ئەوی بیەوێت پەلاماری پاشەڕۆژ بدات، ئاوڕناداتەوە/ زەمەن تەنها ڕێگایەکی هەیە و زەمین تەنها دیوێکی هەیە)

دەڕۆیشتین بەرەو (کەرنەڤال)
پاڵمان بەو گالیسکانەوە دەنا کە پڕبوون لە فریشتەی شەڕانی
ئێمە کۆڕالی فەنابوون بووین... کۆڕالی فەنابوون...
زەنگە گەورەکان دەریایان ڕادەچڵەکاند
ئەو مردووانەیان بە ئاگاهێنایەوە، کە لە جۆلانێی دارستانەکاندا

خەوتبـوون
چەتەیەکی ڕەشپێست بازبەندەکانی لێسەندین و گووتی:
ئەی منداڵان مەڕۆن بۆ ئەم تەروادەی خەیاڵە،
مەچـن بـۆ ئـەو شـارانەی باوکـە خراپـەکارەکان لـە ئاوێنـە دروسـتیانکرد،
مـەڕۆن بـۆ ئـەم عاشـورای نومێـدە، بـۆ ئـەم کەربـەلای سـەرابە
قیبلەنماکانتان لە تەپوتۆزی ئەم شاری تەنهاییەدا ڕێنابات
تەتەرەکانتان لە بەر دەرگای ئەم دەریایەدا کوێردەبن
ئەم خاکە تینووی ئێسکە زێڕینەکانتانە

گووتم:
ئەی خاک، ئێسکی پڕ لە حیکمەتی منت بۆچییە؟
من دەریـاوانێکی گومڕا، دەزانم چی لە دڵی ئەم ئاوانەدا هەیە...
دەزانم ئەم منداڵە خائینانە بۆ چ ئاهەنگێک سەفەردەکەن...
ئاە...
دەڕۆم، دەمامکێک دەکەمە سەرم و ئایەم بەرەو کەرنەڤاڵ.

- دەبێـت بـە مەخسـەرەی ئـەم باڵنـدە پیرانـە، بـە گاڵتەجـاڕی ئـەم کەمانجەژەنانـەی مۆسیقای دەریـاکان و نۆتـەی باکانـی نیوەشەو دەنوسنەوە

بەڵام سیحربازێک لە ئاگر سەمایدەکرد، گووتی:
بـڕۆن وێنـەی باوکتـان دەدۆزنـەوە/ ئـەو زانسـتانە بۆنێـوە کـە دەبـن بـە جێگری ئەوان/ سەرقاڵبن بـە بیرکردنـەوە لـە کیمیـا و مەرگ/ سـەرقاڵبن بە ئاسینی ماتماتیکـی بورجـە دێرینـەکان/ تـا بەندۆڵـی ئەم خورافەتـە قەشەنگانە هەبێت، ئێـوە هەست بـە پیـری ئاکـەن/ شەوێک دێت بوغردی

تەتەرەکانتـان لێهەڵبسێت/ خـۆری مەغۆلیانـە زۆرە... مانگـی فاشستییانە زۆرە/ بەڵام ئێوە کە زانست و شەڕ لـە ڕۆحتانـدا بۆتەیەک/ کە کیمیا و خوێن تێکەڵاوی یەکتردەکەن/ بێباکبـن لـە حورمەتـی لەشی یەکتر/ بەشی خۆتـان لـە زەرنیخ و جەنـگ و لـەزەت هەڵگرن/ بەشی خۆتـان لـە سێکس و خوێن و ئەفیـون زەوتکـەن

ئەوکات

وەکـو فەیلەسـوفێکی پیـر و خەسـتە سـەیری ئاسمانم کـرد و پێکەنیـم... شەو یـاری بـە چراکەی دەستم دەکـرد... بۆنـی گەیشتن بـە کوچەی یەقینە تاریکـەکان لـە گیاکانـی دەوروبـەرم دەهـات. لـە ڕۆخـی ئەوبـەری ئـەو کەشـتییەدا، کـە منـداڵان و بایەقوشـە غەزەلخوێنەکانـی پێبـوو، وەسـتام گوێم لێبوو دەنگێک لە ڕۆخی دەریاوە بانگمدەکات.

باڵندەیەک لەو پەڕی سنووری شـەوەوە، بـە نـاوی خۆمەوە لـە دەرگایـدام:

سەیری مرواربیەکان بکە.

دەریا وەچە خنکاوەکانی خۆی زیندوودەکردەوە،

شەپۆل دەستی ئەو ڕێبوارانەی دەگرت لە دەیجوری دەریادا پێدەکەنین

هەمووشتێکی ئەو شەوەزەنگە بۆنی پاڕانەوەی لێدەهات

بەردەکان بۆنی نوێژی پەشیمانییان لێدەهات

مردووەکانـی ئـەم لمە پاکیـزە سەریـان بەرزدەکـردەوە و گوێم لەهەناسەیان بوو.شـەهێنێک لەوبـەری سـنووری شـەوەوە بەرامبـەر قافڵـەکان وەسـتاو گووتـی:

سـەیری ئـەو کەشـتییانە بکـە، سـەیرکە ئـاو چـۆن مەمکـی ئـەو کچـە چکۆلانانـە دەڕوشێنێت / بـۆ خـۆت بـە چاکردنـی سەعاتی شکاوی ئـەم کەنـار دەریایـەوە خەریکدەکەیت / لـە سـەر عەرشـی ئـەم ماشێنە شکاوانەی فڕیـن وەرەخـوارێ... دەشـێت فڕیـن بێـت (کەرنەڤـال)

ئەو سەر سپییە شوومەی چارۆکەی کەشتییەکانی هەڵدەدا
هاواریکرد:
ئەی فەیلەسوفی تەنها، گومان لە لم ناکەیت؟
بەڵام گومان لە خەندەی ناو دەکەیت. سەیری ئاوێنەکانی شەفەق ناکەیت وگوێت لە مشتێ خاک گرتووە. گوێت لە فڕینی ئەم هەزارەها باڵندەیە نییە کە باوەڕیان بەدەریا و کۆچ هێنا، خۆت دەدەیتە دەست زمانی باڵندەیەکی نەناسراوی ئەوپەڕی شەو
ئاه، دەبوایە بگریاباماییە... دەبوایە سەرم بخستایە سەر ئەم لمە و بمردمایە
دەبوایە بە ماسییەکی قەترانی بەجێماو لە شەپۆلەکانم بگووتبایە:
ئەی هاوڕێی حیکمەتم، فێری ڕێگاکانم بکە... ئەی قەلەڕەشکەی دەریا چارەنوسمان چییە؟ ئەمجارە هەموو بنەماڵەکانی زەوی لە کەشتییەکاندا سواربوون و بە تەنها من، منی نوح لە سەر زەوی ماومەتەوە... نە بایەکم لەپشتە... نە بارانێک...نە شارێک... نە جەنگەڵێک... نە هەورێ... نە تاریکستانێک.

بەڵام شەو دەستیدەگرتم و دەیهێنا بە دیوارە ئاوریشمییەکانی خۆیدا. هاڵاوی دڵنیاییەکی کوشندە، لە گیاکانی دەورویەرم دەهات. نا، هەرگیز خەیاڵ نەبوو... من بەشێک بووم لە گەردون، بەشێک بووم لە وردبوونەوە و چکۆلەبوونەوەی لم و سەدەفەکان، بەشێک بووم لە شەو... مانگ بە هەموو ڕوناکی خۆیەوە برام بوو
کەشتییەوانی پیر و نامۆ... نا خودای خەمگینی سەفەرمان دەیگووت:
کەرنەڤال خاکی تۆیە... تۆ پاشەڕۆژت نییە، کەرنەڤال زەمەنی تۆیە.

وای... وای... لەو کاتەدا
پیرێکی بێگوناه لە دەریاوە هاتەدەرێ، ئاو لە پرچە سپییەکانی دەتکا،
پاستۆنە سیحراوییەکەی هەڵبڕی و تاجەکەی فڕێدایە سەر لمەکان.
شەو ئێجگار سارد بوو، دەنگی پێی سەدەها سوار لە دووردەهات... ئەو
کزەبا خەمگینەش یاری بەسێبەرەکان دەکرد.
نێرفانا... نێرفانا (ئەو پیرە مەستە بانگیکرد)
گەرووی شەو لە هەموو کوچەکانی جەنگەڵدا بانگیکردەوە (نێرفانا)
دوا جار ئەو باڵندە نادیارەش، وەک تیرێک پێکابێتی،
بە نوزەیەک هەموو ئافەریدە و ئافەریدگارەکان
گوێیان لێبوو، وەڵامیدایەوە:
«نێرفانا»
لەو ساتەدا بەشێک بووم لەو باڵندانەی کە دەفڕین
لەگەڵ گیا و لم و کزە باکاندا دۆستبووم،
هاوڕێی ئەم ئەستێرەیە بووم، بەشێک بووم لە تەنهایی و پەشیمانی
دەریا
لەو شەوەدا «با» یاری بە چراکەی دەستم دەکرد
پاسەوانی ئەو دەروازەیە بووم، ئاوی لێهاتۆتە زەوی
بەشێک بووم لە پاکی (با)
لە غروری (جەنگەڵ)
بێهاوسەری (دەریا)
«چەندە پیرم» هاوارمکرد
باڵندەیەک لە ئاوێنە شکاوەکانی دارستانەوە، هاتەدەرێ و فڕی
قەقنەسێک هێشتا خۆڵەمێشەکەی بە باڵییەوە بوو
لە سەر شانم نیشتەوە و گووتی:«چەندە پیریت»

**ئەو پیرەمێردە هات و (با) بەرەو ناو وێرانەکانی دەبرد**
**گەردەلوول نەیدەهێشت سەدای ئەو بگاتە لام**
**نەک من، بەڵکو دەریاکان ڕێشکەوپێشکەیان دەکرد**
**هەوا پڕبوو لە مۆتەکە و خەیاڵ**
**ئەو تارماییە سپیانە دەستە دەستە لە حاڵی پرسەدا بەلامدا ڕابوردن**
**دەمویست بسووتێم و زەوی دەستیدەگرتم**
**دەمویست بسووتێم، بەڵام دەنگێک هاواریکرد**
**«نێرفانا... نێرفانا»**
**من بەڕووی دەریادا هاوارمکرد:**
**«من گەورە بووم... من گەورە بووم. گەورەبوونیش موسیبەتە»**
**ماسییەکان هاواریاندەکرد: «تۆ گەورەبوویت... تۆ گەورەبوویت »**

**مەنجەنیقسازی سەر قوولەی کەشتیەکان هاواریدەکرد:**
**«سەیری تۆپە ئاگرینەکانی من بکە/ هەموو شتێکی پیرۆز لە ئاگرە/**
**کەرنەڤال و زەماوەند و شێتی/ سێکس و جەنگ و عەشق»**
**ئەی مەنجەنیقسازی پیر، دەستە سووتاوەکانی خۆتم بدەرێ**
**من یاری بەم ئاگرە دەکەم... ئالەو کاتەدا بوو**
**دەریا... دەریای بە میهر و بەوەفا... ئامێزی بۆکردمەوە و گریا**
**دەریا هاواریکرد: «تۆ کوڕی منیت»**
**خنکاوە نەسرەوتەکان پێکەنین و گووتیان:«تۆ برامانی»**

**ئاگر خەندەکانی خۆی دەجولاند، ئاو بەزەیی دێرینەی خۆی**
**با مەستانە پێدەکەنی و شەو ئارام بوو**
**دڵم لە نێوان ئاگر و دەریادا وەستا بوو**
**ئاگر بیستنی پڕکردم لەو پەپوولانەی لە گوێمدا باڵەفرێیاندەکرد تا**

حەرفێکی ئاو نەبیستم. ئاو دڵی پڕکردم لە سەدەف، گەروی بە مرواری ڕازاندمە، تا لەگەڵ ئاگرا نەدوێم
سەراسیمەبووم، بەڵام سەراسیمە بوونێکی کوشندە
دەنگێک لە ناو ڕۆحمەوە دەیگووت «نێرفانا»
گەیشتمە ئەو خەڵوەتانەی ڕۆح کە ورشە و ئاوێنەکان دەیلاوێنن
عەقڵ گیای پیرێتی خۆی ئاگر تێبەردەدا
ئاه، چ هیرۆگلیفیایەکە ئەم ئاوە
چ تەلیسمێکە ئەم ئاگرە
چ هیرۆگلفیایەکە تەنهایی، لە ئامێزی جەنگەڵێکی وەک پڵنگ شەڕانگێزدا
گووتم: گەورەبوونم موسیبەتە
منداڵیم بەو خەتە قرمتییانە نوسراوە
وای گەورەبوونم موسیبەتە

ئەو مەنجەنیقسازەی، دەستەکانی لە ئاگر بوون، گووتی:
بە تەنها جیادەبێتەوە، لم تەماحی لەو پیاوە بێکەسانەیە کە بە نێویدا گوزەردەکەن/ (با) تەماحی لە منداڵە تەنهاکانە/ دەریا تەماحی لەوانەیە، دەڕۆن و سێبەرێکیش نییە دەستیانبگرێت.

دەمگووت:
منیش تەماحم لەوەیە لە هیرۆگلیفیای ئەم شەوەزەنگانە تێبگەم، تەماحم لەوەیە لە تەلیسمی ئەم باڵندە و دەروێش و مەنجەنیقانە تێبگەم، تەماحم لە شاژنی ئەم قەراغ دەریایانەیە، کە تەنیا پیاوانی تەنهایان خۆشدەوێت... ئەو دارستانە تەنهایەی پیاوانی تەنها دەیگەنێ

**کەشتییەکان بەئەستێرەکانیانەوە دەکەوتنەڕێ**
**منداڵەکان دەیانگووت: تەنیا ئەم پیاوە تەنهایە نایەت بەرەو (کەرنەڤال)**
**ئەستێرەکان دەیانگووت: هیچ کەشتییەک لێرەوە ڕانابورێت، ئەمە دواهەمین کەشتییە**

**کەشتییەکان ڕادەبوردن و دەیانگووت:**
**تەنیا یەک پیاوی تەنهایە... تەنیا یەک پیاو**
**باڵندەکان دەیانگووت:**
**نایەت بەرەو کەرنەڤال**
**تەنیا پیاوێک چییە؟!! گەر نەیەت بەرەو کەرنەڤال**

**ئەستێرەکان دەیانگووت:**
**ئەی کەشتییەکان تێپەڕن،**
**ئەو نایەت بەرەو کەرنەڤال**
**با نەیەت بەرەو کەرنەڤال**

**منداڵان دەڕۆیشتن و دەیانگووت:**
**ئەو پیاوە تەنهایەی ڕۆخی دەریایە**
**هەر ئەوە کە نایەت بەرەو کەرنەڤال**
**هەر ئەوە کە نایەت بەرەو کەرنەڤال**
**با نەیەت... بەرەو کەرنەڤال**
**با نەیەت... بەرەو کەرنەڤال**

**سلێمانی ١٩٩٠**

# ١

سەرەتا ڕێگاکان لێرەوە ڕابوردن
لێرەوە ساڵەکانی ژەنگ و ڕۆژەکانی تاعوون تێپەڕین
لێرەوە سەدەکانی ئاسن و چاخەکانی تابووت تێپەڕین
لێرەدا سوپاکان بەشکستی و ئەسپەکان بەکوێری دەگەڕانەوە
لێرەدا براوەو دۆڕا و تێکەڵاو بەیەکتر دەبوون و
خۆشەویستی و ڕق دەبوون بە یەکێ
وەک ئەستێرەیەکی بێگوناه هاتم و شەیدایی یەکەمین ئادەمیزاد لەڕۆحمدا بوو
گەلێک ویستم لە مانای شتەکان بپرسم
بەڵام ئەفسوس، زمانم نەدەزانی
دارەکان بە چەپۆکی شەونماوی، چەمۆلەیان لێنام
ڕێگاکان بە گاڵتەیەکی نامەردانە، بابەخولێیان پێکردم
لافیتەکان بە ناوی بەهەشتەوە، فڕێیاندامە دۆزەخ
چراکان بە شەوقی ئەهریمەنانە، کوێریانکردم
ئەی ئەو شارەی بەجزمەی زێڕینەوە، لە دڵتدا بۆ گوڵی خەیاڵی گەڕام
بە دەستکێشێکی تەڵاوە
پێکی خەندەی ژەهراویم، لە چاوە پڕ فیتنەکانت پڕکرد
نمەکی گوناهەکانتم کرد و خوێنی تاوانەکانتم چەشت
لەڕێگا تاریکەکانی تۆدا
ڕووم نەهات سڵاو لەو غونچانە بکەم، کە دەمیان لە دەمی یەکتردا بوو/ ڕووم نەهات ئەو هەورانە تیماربکەم، کە دەست لە ملانی یەک

**لە ناو تابووتەکاندا خەوتبوون/ هەموو شتێ پشتی تێم بوو... پاس و شەمەندەفەرەکان... کەشتی و درەختەکان... تابووت و عاشقەکان.**

**من دەرختێک بووم نە دەسەڵاتی وەرزەکان، نە زنجیری زەوی، نەیتوانی بمبەستێتەوە/ پێکەنینم بە یاساکانی سروشت دەهات/ گەزۆی گەردەلوولەکانی ڕۆحم پاڵتۆی قەشەنگی بەرم بوو/ لە پەرلۆنی ئاسمانەکانی خۆم کراسم بۆ ڕۆحی خۆم دروو/ قەلەڕەشکەی تاریکستانەکانی دڵم، شەبقەی تاریکی سەرم بوو**

**من سازژەنی سەرمەست بە مۆسیقای ئەفیوناوی... جەنگەڵەکانم خستە سەما/ ئەو جەنگەڵانەی باڵندە خەوتووەکانیان، لەسەر هێلکەی بەردین کڕکەوتبوون/ پیاوە برسییەکانی گەڵایان دەگوشییە خوێنەکەی خۆیان و دەیانخودارد/ نوشتەی ئەهریمەنێکی تازە بە باڵی هەڵۆکانییەوە بوو/ سمۆرەی پیری حیکمەتێکی ئەو، نهێنی خۆی لە دارستانەکانی ڕۆحمدا ونکرد**

**ئەی شاری بەد**
**کەشتی تاعوونێکی تۆم فڕاند، بەرەو دڵم/ ڕێگای قافڵەیەکی کوشندەی تۆم، بە سەر جگەرمدا ڕاکێشا / زەماوەندی خەنجەرەکانی تۆ، پەنجە شێتەکانی منیان کردە یەخسیر/ سوپای فریوێکی عاشقانەی تۆ، بورجە تاریکەکانی دڵیان ئابلۆقەدام/ لە مەیی پیاڵەی دەستی سیحربازەکانتم خوارد/ لە کتێبی شەرەفی تۆدا، وانەی بێباکیم خوێند/ لە وانەی حیکمەتی تۆدا، قەڵەمی شەڕێکی گەورە کەوتەدەستم/ ئاگری هەرەسهێنانی ئاسمانێکی تۆ، گڵێنەمی بە ئەستێرەی نوێوە سووتان/ تەمی کۆچکردنی خودایەکی تۆ، ئەسپەکانی ڕۆحیان لێونکردم**

ئەی شاری بەد
من مامۆستای ڕەنگکردنی یاقووت بووم/ لە بەردەم گوڵە پەچەبەسەرەکانی
تۆدا/ لە دەرباری دارستانە چارشێوە بەسەرەکانتدا، تامی هیچ ڕەنگێکم
بۆ نەکرا
من مامۆستای بۆنە ئەفیونییەکان/ لە زەمهەریری تەلا ساردەکانی تۆدا/
لە کرێوەی کۆشکە زستانەکانتدا/ بۆنی هیچ جوانییەک و گوڵاوی هیچ
شۆڕشێک نەچوو بە سەرمدا و نەشمردم چونکە سەرابی یەزدانێکی تازەم،
لە سەر بێشکەکانی تۆدا بینی

لە سەر فریوی بارووتی جەنگێکی خەیاڵی تۆ
ڕۆحم کۆدیتایەکی خوێناوی کرد بە سەرمدا
ئیدی پیانۆی دەستی فریشتەکانم فڕاند
ئۆرگۆنی خوێناوی پەرییەکان کەوتەدەستم
بە تاڵی گیتاری نوێوە بەسترامەوە بە ئاسمان و
پێوەندی مۆسیقایەکی تازە، ڕۆحی بە خۆیەوە بەستم
ئاە، ئەی شاری ئاوێنەبەند، بە خوێن و خەڵوز و خیانەت
پڕچەک، بە فرمێسک و عەشق و تەنهایی

من ئەو دەربەدەرە بێنیشە بووم، لە سێبەری بیبە کافرەکانتدا ویستم
پشوویدەم
ئەو موسیقارە بریندارە بووم، قریشکەی باڵندە خەسیووەکان وەک خوێن
لە گوێچکەکانم دەهات
هاتم و نەخشەی کۆچی نەیازکەکانتم پێنەبوو
لە تۆڕی جەنگەڵەکاندا بووم بەداوی کوشندەی تۆوە

وەک ڕاوکەرێکی فریوخواردو، مەتارەکەم تەنیا سەرابێک بوو لە شانمدا کۆچمکرد تا لە ئەفسونی شتەکان بگەم/ بەڵام لە بەردم کلپەکانتدا، کوێربووم/ لە زرینگەی شەپۆلە خوێناویەکانتدا، بێدەنگی شانشینێکی گەورە نوقمیکردم/ کونە پەپووی زانستێکی شووم نیگا شەڕانییەکانی خۆی دامێ.
هاتم لە کۆگاگانتدا خەیاڵ و ئەفیون بدزم
بەڵام هیچم نەدی
تەنیا دڵی خەیاڵاوی، دڵی خۆم بوو
تەنیا نیگای ئەفیوناوی، نیگای خۆم بوو
هاتم، لە ناوەڕاستی ڕێگای دۆزەخە ڕەنگاوڕەنگەکانی تۆدا... ئاڕاستەی با و باڵندە سەرمەستەکان ڕێکبخەم...
«لە قەیفەی بەیانییەکی زیوینی تۆ برینەکانی سەر دڵم ببەستم... لە شیفۆنی دەریایەکی شینی تۆ، قوماشی کراسێکی نوێ ببڕم» *

بە هەورەکانم گووت:
من ڕووتم، کەمێک بارانی ئاڵتونی بەسەر شانمدا ببارێنن
ئەی شادی بەد
من چۆن بە حیکمەتی منداڵێکی سەرسپییەوە، لە زمانی تۆ نەگەیشتم...
تۆش لە حەرفی من نەگەیشتیت
تۆ هەموو شتێکی خۆت دا بە من
من هەموو شتێکی خۆم دا بە تۆ
بەڵام نە تۆ بە نهێنی منت زانی و نە من بە نهێنی تۆ
من کڵاوی خەونێکی گەورە لەسەرمدا بوو، بە ملوانکەی ئاینێکی کۆنەوە گێلانە چاوەڕوانی تەرزەی نوێ بووم لە ئاسمان، گێلانە خەوم دی، خۆرێکی کۆچەری لە گالیسکەیەکی قەرەجدا بەرەو ڕووم دێت، عاشقانە نیازم بوو،

**خۆشەویستییەکی ئەفسانەیی، لە بورجە تاریکەکانی تۆوە سەردەربێنێت.**

**لەبەر دەروازەکانی تۆدا، پادشایەک بووم بەجلی گەداکانەوە، چەتەیەکی دەریا بووم، خەزنەکانی خۆمدا بەکۆڵمدا و هاتم بەتەلیسمی ئەفسانەیەک نیازم بوو**
**قفڵی ئەهریمەنانەی تۆ بکەمەوە.**
**بەنوێژێکی دەریایی تەمام بوو**
**کێلونی بەهەشتی تۆ بشکێنم.**

**دڵی کوڕانەی کەشتییە پێشەرمەکانی من بوون**
**حەزیان لە خەزنەکانی تۆ کرد**
**پرخەی دەریاوانەکانی من نەیهێشت**
**ماسی و ئەستێرەکانی تۆ بخەون**
**کە هاتم وامدەزانی**
**زەنگۆڵەکانی تۆ، بەقەد تینوێتی پەنجەکانی من دەزرنگێنەوە**
**درێژی وەرزەکانی تۆ، بەقەد درێژی وەرزەکانی ڕۆحی منن**

**بەلام کە بینیم...**
**پێکەنینم بە زستان و هاوینە درۆینەکانی تۆ هات**
**تۆ چی بوویت؟ من خۆم پادشای فەسڵەکانی خۆم بووم.**
**کاتێک لە پۆلەکانی خوێندندا، سەرم بۆ مامۆستاکانی تۆ لەقاند... درۆمدەکرد.**
**هەرگیز لەمانای سامان و ژیرێتی و ڕەوشت و ئاین نەگەیشتم**
**ئەو ڕۆژانەش بەعاقڵی من سەرسام بوویت، تۆ هەڵەبوویت**
**... من چەتە بووم**

کەشتیەوانێک بووم
تێشووی سەفەری دەریایم... خوێنی خۆم بوو
تفەنگی قارەمانێتیِ جەنگەکانم، دەستەماندووەکانی خۆم بوو
ئاە... من خۆم باکوور و باشووری گەردونی ڕۆحی خۆم بووم
تەنیا دووربینی من چاوە پڕ فرمێسکەکانم بوو
تەنیا پردی من قاچە برینەدارەکانم بوو
زیندانی من، جەستەی پڕ لە عەشقی خۆم بوو
عەشقی من، تەنیا دڵی کڵپەکردووی سینەی خۆم بوو
بەڵام دواجار، خەزنەکانی خۆمدا بە کۆڵمدا و هاتم
چەتەیەک بووم، لایلایەم بۆ دەریاکان دەکرد
سەیری کفنی کەشتییەکانی دیکەم دەکرد و نەترسام
زەنگە تێکشکاوەکانم بینی، لم لەسەر دڵیان نیشتبوو
سەعاتی دەریاوانەکانم بینی لەملی ماسییەکاندا...
بەڵام وای نەترسام
چەتەیەک بووم، کفنی گۆڕستانەکانی تۆ لەبەرمدا شەکایەوە/ بۆنی مەرگی تۆ لە دڵم دەهات/ پەنجەی تۆ، سەعاتی زیندەگی منی دەخستەئیش/ دەستی تۆ، زرینگەی لەزەنگی جگەری من دەهێنا/ کەچی چەند سەیر بوو نەترسام/ ئازاد بە ڕۆحی تۆدا گەڕام و شیعرم نوسی/ بێباک لەوەی کە بمکوژن، هەمووشتێکم درکاند.
زمانم بوو بەباڵ و پێیفڕیم
خەنجەرەکانی تۆ نەبوون بەلەمپەرم
بۆمردن خۆم ڕێگای خۆم هەڵبژارد و
چەقۆی هیچ جەلادێکت، نەهات ببێت بەنەشتەرم

چەتەیەکی باڵندە بووم، باڵەکانم لە گەرمەی فڕینێکی عاشقانەدا گڕیگرت/ دەنووکم بە تیشکی خواکردی سرودێک درموشایەوە / لە پەرستگا نەبینراوەکانی ئاسماندا، هێلانەمکرد / نەوازشی دەستی خودایەکی جەلادی تۆ، خەوی هێنایە سەر پێڵووم/ بە لایلایەیەکی پڕ لە کوفر دارستانەکانی تۆ، شیریان دامێ/ گەنمی سەر تەوێڵی کێڵگە خائینەکانی تۆ گەورەیکردم

کاتێک کە دەریام بەجێهێشت،
باڵەکانم وەک جبەی ڕەش بەسەر شانمدا هاتەخوارێ
دەریا تێر بە پرشنگی ئاو، ماچی دامێ
شەپۆلەکان، ماسی بێگوناهیان کوشت و لێوی خۆیان بۆ سوورکردم
ئەی شاری بەد... منی ماسی، منی وەک کەشتی مەلەوان
تۆ بوویت کە لە دەریات کردم
تۆ بوویت کە لە دەریات کردم
لە دەروازەکانی تۆمدا
ئەو دەرگایانەی پڕبوون لە نیگاری جادووئامێز/ نەخشەی پەنجەی ئەو عاشقانەی، هاواریان ناگاتە ئەودیو شوراکان/ زەخرەفەی دەستی ئەو قەرەجانەی لە بەر قاپییەکانی تۆدا مردن/ یادگاری ئەو سوارچاکانەی لە ترسی تاعوونی خۆشەویستی، بەگوزەرتا ڕانەبووردن
لەوێ بینم
بازرگانەکان پەنجەی پاسەوانە خەوتووەکانی شەو پردەکەن لە ئەنگوستیلە و ڕادەبوورن
لەوێ، تێگەیشتم
ئەمە ڕۆژگاری بازرگانە قژڕەشە بالابەرزەکانە

بەیانی سووخۆرە گەنجەکان و نیوەڕۆی گوناهبارانە
ئەمە ڕۆژگارێکە، ئەگەر سیبیەکانت لەزێڕ نەبێت، هەوا خۆشی ناوێت/ دەستت پڕ نەبێت لەتەلا، ئاو ناهێڵێت بیخۆیتەوە/ ئەگەر دڵت لەبەرد نەبێت، دەستت ناگاتە عەشقێک / ئەگەر ڕوحت لە مس نەبێت، بەخەندەیەکدا ڕاناگەیت
من چەتەیەک بووم
گووتم: وەکو ئەوان ئیدی بازرگانی بەشمشێرو ئافرەتەوە دەکەم
بەڵام ئەفسوس، شمشێرەکەم کەوتە ناو ئاو و دڵم کەوتە ئامێزی یەکەمین کچ
وەک ئەو هەورە بێبارانانەش نەبووم، ڕوومبێت بە دارشەقێکەوە بگەڕێمەوە بۆ دەریا، وەک سەربازێکی قۆڵبڕاو، ناوچاوانم خستە سەر زەنگەکان
بەڵام بینیم...
بازرگانەکان، چنگی پاسەوانەکانیان پڕکردوە لەملوانکە
منیش هاتم تەرزەی خۆشەویستیم کردە چاویان
لەخەزنەی دڵی خۆمم دانێ، لەشەرابی ڕۆحی خۆمم لەبەردەستدا دانان...
بەڵام هەرگیز ڕازینەبوون، پاسەوانە نەگریسەکان
کاتێک کە شوراکانم شکاند

ئەی شاری بەد...
من دیکتاتۆری شیعر و بەختیاریی ڕاستەقینە
لە فیشەکدانەکانتدا، بەدوای گوللەی زێڕیندا گەڕایت تابمکوژێت
گەلێک لەجامە تاعوونیەکانتدا، ئاوت دامێ
بەو دارستانانەدا منت برد... قریشکەی درەختەکانی شێتیانکردم...
ئەی شاری وەکو بەرد دڵڕەق
من نەخشەی سەربەردەکانی تۆم، لە سەر ناوچاوانم هەڵکەند

به خەنجەری ئەڵماسی تۆ، چرۆکانی سەرزمانمم بڕی
بە تفەنگی دڕندەی تۆ، دڵی خۆم پڕکرد لە باروت
بە تێزابی تۆ، شیعرم لە سەر لێوم سووتان
دەمویست، تامی نەخش و خەنجەرو باروت و تێزابی تۆ بکەم
بەڵام ئەفسوس لە تۆ، من خۆم پادشای مردنی خۆم بووم
(گەر ملم نابێتە بەر بروسکەت
مەبەستم بوو لەمانای مەرگی تۆ بگەم...)

بەڵام... بەڵام...
من چەتەیەکی دۆڕاوبووم
لە سەردابە تاریکەکاندا تەنیا سەراب و کچی شەرمنم ڕاودەکرد/ لە گەنجینەکانتدا، تەرمی هاوڕێکانی ڕابوردوی خۆم دۆزییەوە/ بازرگانەکان، بە قیبلەنمایەکی ڕەشەوە بەر لەمن گەیشتنە سەر خەزنەکان/ یەزدانێکی بەڕەحم نەخشەی گەنجینەکانی تۆی دایە دەستیان/ تۆش کلیلی ئەو کۆشکانەت دانێ، کە لە ڕوی ئێمەدا داتخست هەزاران ساڵ
تەلای ڕاستەقینەی خۆت دا بەوان
بەتەلایەکی دی، فریوتداین... تەلای خەیاڵ.
بەڵام دڵی من مەیخانەیەک بوو . ئارەزوویەکی سەرخۆش تیا دەگریا. تەماحێکی پیر، بەدەستە لەرزۆکەکانییەوە، شەرابی تیا دەبەشییەوە. ئاواتێکی سەرسپی، مەستانە لەسەر مێزەکانی سەمایدەکرد. ئەو چەتە ڕیشسپییە چلکنانە تیاخەوتبوون، کەچاوەڕوانی گەردەلوولێکی ئومێدیان دەکرد هەڵیانسێنێت. ئەوچەتانەی چی دیکە نیشانەیەک نەبوو بیشکێنن. ئەسپێک لە زەویدا نەمابوو، سواریبین. دوژمنێک نەبوو بیترسێنن.
ئەو چەتانەی
لە پەنجەرەوە سەیری ئەو بەهەشتە ڕەشەی تۆیان دەکرد

کە هەمیشە شەو بوو... شەو
بێهودە تفەنگەکانیان ئامادەدەکرد و دەیانزانی
ئەو جەنگەی چاوەڕوانیدەکەن
خەونێکی ئەبەدییە و خەون... خەونێکی ئەبەدییە و خەون.

## ٢

دڵمان بارمتەبوو لێرە، ڕۆحمان قەرز و خوێنمان خەراج
دڵمان بارمتەی سۆزەکانی تۆ بوو، سۆزەکانمان بارمتەی فریوی تۆ
فرمێسکەکانمان تالانی چاوانی تۆ و چاوانمان تالانی گوناهی تۆ
قافڵەکان بارمتەی ڕێگاکان و ڕێگاکان بارمتەی زەوی بوون
مرۆڤ بارمتەی قەفەز و قەفەزەکان میوانی هەمیشەیی
کاتێک کە هاتینە ئێرە
ڕۆحمان لە سپێڵەکان خواست و دڵمان لە باجگرەکان وەرگرت
بەسوو بەشە خوێنی خۆمان لەچەقۆکان سەند
پەنجەمان لای مردووەکان هێناو
چاومان لە خنکاوەکان قەرزکرد
ئێمە شیوەنگێڕەکانی شایی و شاییگێڕەکانی پرسە
ئێمە ئاژاوەگێڕانی ئاشتی و ئاشتیخوازانی ئاژاوە
هەڵەیەک بووین لەناو هەڵەیەکدا
هەرەسێک بووین لەناو هەرەسێکدا

ئێمە بێدەنگییەکانی گەردەلوول و گەردەلوولی بێدەنگییەکان بووین

**خامۆشی ڕاپەڕین و ڕاپەڕینی خامۆشییەکان بووین**
**کاتێک کە هاتینە ئێرە**
**زەوی خوار و شەو و ڕۆژەکان لاسەنگ بوون**
**لاسەنگ بوو، سۆزی ئێمە لەگەڵ سۆزی تۆدا**
**عەشقی ئێمە لەسینەی تۆدا ڕق و**
**ڕقی تۆ لەسینەی ئێمەدا عەشق بوو**
**دەنگی ئێمە نامۆ بوو بەدەنگی تۆ**
**دەنگی تۆ نامۆ بوو بە دەنگی ئێمە**
**ناتەبا بوو ئازادی ئێمە لەگەڵ ئازادی دڵی تۆدا**
**ڕەنجی تۆ بە جەستەی ئێمە ناتەباو**
**جەستەی ئێمە بۆ ڕەنجی تۆ، ناتەبا بوو**
**نەهاتین**
**ئەو گیایانەی بارمتەی ئاگر و ئەو چاوانەی کە تالانی شێتیین...**
**ڕزگاریانکەین**
**نەهاتین، زەنگەکان لە پەنجەی زریان و گۆڕەکان لە قەدەر ئازادبکەین**
**زانستی کوشتن و قورئانی تەنهاییمان دەخوێند**
**شێتێک بووین یاساکانی شێتیمان فەرامۆشکرد**

**سنوورە تەسکەکانی عەقڵ و دەرفەتە کزەکانی هۆش چارەنەبوون**
**لە سەفەرێکی ناوەژوودا لە کۆتایی ڕێگاکانەوە بۆ سەرەتا**
**لە دواهەمین ڕۆژی دۆزەخەوە، بۆ یەکەمین قەترە ئاو**
**لە هەرەسی دواهەمین چرکەی بەهەشتەوە**
**بۆ هەرەسی یەکەمین نێر و مێ**
**لە مێژوومەوە بۆ خودا**
**لە کۆتایی ژمارەکانەوە بەرەو سفر، سەفەرمانکرد**

**لەسەفەرێکدا ڕۆحی بومەلەرزە سوڵتانی بوو**
**کتێبەکانمان پڕبوون لە دڵنیایی**
**بەڵام سەریان خستبووە سەر ڕانی خەو**
**پایەی ئاینە گەورەکان،**
**سەرێکیان لەبڕوا و سەرێکیان لە گوماندا بوو**
**ڕەوابوو جارێکی دی یەزدان بەسەر حەرفەکانیدا بچێتەوە**
**چاو بینینی ونبووی خۆی بەکوێری**
**گوێ بیستنی هەڵهاتووی خۆی بەکەڕی... بدۆزێتەوە**
**ڕەوابوو ئازار ڕەوایی خۆی بسەلمێنێت**
**بەختیاریی لە خۆبووردنی لە دڵدا بیربچێتەوە**
**سەفەرێک بوو ساتە ئاوەژووەکان سۆزی پێچەوانەیان داینێ**
**(با) ئاڕاستەی شمشێرەکانی دەگۆڕی**
**شمشێرە ئاوەژووەکان، برینی ئاوەژویان داینێ**
**سێبەری وەرچەرخانی دڵەکوشندەکان، عەشقی کوشندەبوو**
**لە گێژەنی وەرچەرخانی چرکەکاندا**
**کوێر بوونمان لەناو ونبووندا**
**هەڵنەهێنانی خۆمان وەک مەتەڵێک**
**پاکنووس نەکردنی گریان و بەختیاری قەدەرمان بوو**
**هەرچەند بەدوای خۆماندا نەگەڕاین،**
**بەڵام ونبوونی خۆشمان نەدۆزیەوە**
**هەرچەند دوای سەرکەوتن نەکەوتبووین، نووشستی خۆمان نەدەژیاین**
**ئەمە مەرگی شمشێری دوژمنەکانمان نەبوو**
**زیندوبوونەوەشمان، زیندوبوونەوەی خودا نەبوو**
**هەر پارچەیەکی لەشمان، بۆنی جەنگەڵێکی لێدەهات**
**هەر دڵۆپێکی خوێنمان، ڕەنگی سەردەمێکی گرتبوو**

ملیۆنەها سەعاتی تێکشکاو، لەژێر پێستەکەماندا دەگریان
پۆنگی بلێسەی هەزارەها زستان، لە ناوچاوانمانەوە دیاربوو
نازانین چۆن کتێبی نوقمبووی دەریاکانمان دەخوێندەوە
چۆن زمانی باران فێربووین
ئێمەکە ئەستێرەکان باوکمان بوون، ئەو باوکانە... باوکی ئێمە نەبوون
ئێمە کە لە ئاسمانەوە هاتووین، چیرۆکی ئەم پشتانە چیرۆکی ئێمە نین
ئێمە کە هەتیوی هەرێمێکی دووری گەردونین
ئەم برا ڕیاکارانە... برامان نین
ئێمە کە ڕۆحی خۆمان ئاوەژو لەبەرکردوە.
لەم شاری پرگاڵ و ڕاستەیەدا، ئیشمان چییە؟
چ کارەین لەم گەڕەکی ماتماتیک و سەهۆڵەدا؟
چ کارەین لەم سەفەری جەبر و تەپوتۆزەدا؟
شاعیری چەرغ و فەلەکی مەستی و جۆلانێی سەرسوڕمانین
لەم زەماوەندی عەقڵ و شایی هوشیارییەدا ئیشمان چییە؟

ئێمە
ئەسپسواری پێکەنینی بێشەرم و تریقەی نامەردانەین
چ کارەین، لەم تەویلەی حورمەتەدا؟
ئێمە کە نەهەنگی خەونین
چ دەکەین لەم حەوزی کرمەدا؟

سەرمان پڕیتی لە دەریای نغرۆ و دڵمان پڕیتی لە شاری پێچراوە
ئەم دەریا سەرفرازە... دەریای ڕۆحی ئێمە نییە
ئەم شاری بێسیپاڵی ئەفسونانە... شاری دڵی ئێمە نییە

**پێغەمبەرێک نییە، بەم یەزدانە تازانەمان بناسێنێت**
**ئێمەی نەبین، لێرە دیدەمان نییە، یادگارێکمان بۆ باسبکات**
**ئەلبومەکانمان، هەر پەڵەی خوێنە و پەڵەی خوێن**
**لە ناو کتێبەکانماندا، بە مردوویی ڕاکشاوین و تابووتەکانمان خاڵییە**

**ئێمە کە تەنیا گیانین... دەستمان لێبدە**
**لاشەمان خەیاڵە و گۆڕەکانمان پوچ**
**ئێمە کە تەنیا عەشقین... ببینە، خاڵییە دڵ و بەتاڵە جگەرمان**
**سەفەرمان کە سەفەر نەبێت... تورێدە قیبلەنماکان**
**بە قەد نەزانی ئاو و غافڵی نەیزەک فەرامۆشیکە ڕێگا**
**کە ئەم شارە نغرۆبێت لەناو خۆیدا**
**شاعیری بارمتەی خەون**
**شمشاڵی چ هۆشێک و تەمبووری چ عەقڵێک لێدا؟؟**

# ٣

**ئەی ئەو شارەی هاتم و چارەنوسم وەک مەدالیای ڕەش بە پەنجەی کچەکانتەوە بوو/ گۆڕستانەکانت ناوی منیان لە کتێبەکانی خۆیاندا نوسیبوو/ هاتم بێنەوەی عاشقبم، دەمویست گوللەبارانمکەن لەسەر خۆشەویستی/ وەک نەیزەکێک لە ئاسمانەوە هاتبێ، بە ئازار دەدرەوشامەوە/ من... خۆر جنێوی تێشکاوی پێدام و مانگ تفی تریفەیی لێکردم/ وام هەستکرد نەفرینی هەموو درەختەکان لە ڕۆحی تەنها و ئاوارەمە/ تۆڵەی هەموو تاوانەکان لە دەستە بێگوناهەکانی منە/ ڕقی هەموو عاشقەکان، لە چاوە بێخەتاکانی منە/ وام هەستکرد، قامچییەکان خەو بە جەستەمەوە**

دەبینن و خەنجەرەکان بێزو بەدڵمەوە دەکەن.
من قەشەیەکی کوێر و ڕەبەنێکی برسی بووم
زەنگی نەهریمەنانەی کڵێسە پیرەکانت، بۆ هەتاهەتایە کەڕیانکردم/ خودایەکی مردووم لە تابووتەکانی تۆدا باوەشێنکرد/ ئەو تابووتانەی قوتابییەکان وانەیان لە ناودا دەخوێند و عاشقەکان نامەیان بۆ یەکدی دەنوسی.

بۆ کوێ بچوومایە؟؟
ڕێگای وا لە خوێنەکەمدا بوو، لە جەهەنەمەوە دەڕۆی بۆ جەهەنەم.
بۆ کوێ بچوومایە؟؟
من براکانم لەبەردەم خوداو پاشەڕۆژدا، حاشایان لێکردم
دیلێک بووم، ڕازی بەقەفەس
هەرگیز چاوەڕواننەبووم خودایەک لە گوناهە پاکەکانم خۆشبێت
چەندە ڕقم لە سزا بوو، هێندە ڕقم لە لێبوردن بوو
کاتێک وەک قارەمانێکی خائین لە زیندانەکەم دەریانکردم
حەزمدەکرد لە ژێر خۆرا ببمە زوخاڵ و
تریفە لە جیاتی جەلاد بمکوژێت
ویستم وەکو پاڵەوانێک بگەڕێم
زرینگەی پێوەندێکی نادیار، دەست و قاچمی ئیفلیجدەکرد
ویستم وەک ئەمیرەکان قسەبکەم
شریخەی قامچییەک لە گوێمدا ڕێگرم بوو
بەڵام لەژێر هەر دڵۆپێک فرمێسکەوە، دەریایەک لە ئازادی داگیرسابوو
بە هەر چەمۆڵە و پێوەندێک، قەترەیەک سەربەستیم کڕی
برسێتی و تینوێتی و ڕۆژە پەیتاپەیتاکانی بێ دڵداری
بست بە بست هەڵیانگرتم و بردمیان بەرەو ڕزگاری

من (با)ی کارەساتەکان گەروومیان پڕکرد لە گۆرانی مەرگ
دەستڕێژەکان پێکایانم و بەزەبری عەشقێکی گەورە هەر دەڕۆیشتم
سەرم لە ڕەشەباکاندا کەوتبوو
تەنیا لەشم بوو، وەک پێغەمبەرێکی ڕەوا، دەیرِوانییە ئاسمان
دەستەکانم سووتابوون و سەراب هەنگاوەکانمی فێنکدەکردەوە
من کوژرابووم و گوللەیەک لەدڵمدا بوو
بەڵام توانیم درێژترین، بانگەواز لە سەر پرد و شەقامەکان بخوێنمەوە
توانیم دواهەمین نیگای عاشقانە، بگرمە دواهەمین ئاسمان
ئەی شاری بەد... هاتم پێتبڵێم
دەرگای قەفەز لە باڵندە مردووەکانت مەکەرەوە
ئەو دیلانەی بەزنجیرەکانیانەوە مردوون، بە زنجیرەکانەوە بیاننێژە
ئەو نەستێرانەی تەوقێک لە گەردنیاندایە
با بە تەوقەکانی ملیانەوە هەرەسبهێنن
پێویست بەهیچ ئازادییەکی درۆ ناکات
پێویست بە پیاسەیەکی درۆ ناکات بۆ گۆڕستان
با گۆڕەکەم هەر لەناو زیندانەکەمدا بێت
من کە باڵندەی قەفەز بم
پێویست بە فڕینێکی ناکامانە ناکات بەرەو دەریا
من کە بەلەمێکی شکستەبم، بۆ لە ئاو بپارێمەوە
من کە خوداکان بەچۆکیاندا هێنابم، سوژدە بۆکێ بەرم؟
لە ساتێکی بێزاریدا
بە تاڤگەم گووت: بوون و نەبوونی ئاو، وەکو یەکە
بە ئاوم گووت: بوون و نەبوونی کەشتییەکان، وەکو یەکن
بە کەشتییەکانم گووت: بوون و نەبوونی دەریا، وەکو یەکە

به دەریاکانم گووت: بوون و نەبوونی ژیان، وەکو یەکە
هاتم و زمانم پڕیبوو لە تکا
بە ماسییەکانم گووت: گوللەبەندێکم بۆ بنوسن، دژی دەریا
بە هەورەکانم گووت: نوشتەیەکم بۆ بکەن، دژی ئاسمان
بە ڕێگاکانم گووت: دۆعایەکم بۆ بنوسن، دژی ونبوون
دەشمزانی گەر دەریا و ئاسمان و ڕێگاکان
دۆستم بن یاخود دوژمنم، وەکو یەکە
هاتم گیای تاڵی ئاسمانە سەوزەکانی تۆ فریویدام
پاساری کوێری دارستانە ئیفلیجەکان، چاوساغم بوون
وەک ئەسپێک باران قامچییەکەی بێت، بەوەردەکاندا هەڵهاتم
ئاسمان جەلاد و زەوی زیندانم بوو
بە قولاپێکی شکاو... نیازم بوو ماسی خۆشەویستی بگرم
بەلام زەردەخەنەی پیاوێکی تاعووناوی، لە سەر لێوی جۆگەکانتدا پێمپێکەنی
ئافەتی دەغڵە خنکاوەکان... لە سینەی شەپۆلەکانتدا دایە »قاقا«
من بەو شەقامانەدا گەڕام، کە ئاویان لە قاسەکانیاندا هەڵگرتبوو
دایکە سپڵەکان، شیریان لە مەمکیاندا شاردبووەوە
درەختەکان خۆیان بەری خۆیان دەخوارد

من بە دارستانەکانم گووت: هەموو وەرزەکان وەکو یەکن
من بە ئەستێرەکانم گووت: بوون و نەبوونتان، وەکو یەکە
سوودی مانگ بۆ عاشقان لەم شارەدا ئەفسانەیە
بالابەرزی بۆ سەرووەکان، کە چاویان نەگات بە دەریا، بێهودەیە
هاتم و بوومە سەماکەرێک، کە دڵی پڕبوو لە ئاورنگ و سنگی پڕبوو لە تەرزە و گیرفانەکانی پڕبوون لە ئەستێرە/ سەماکەرێک بەسەما، باڵی

فریشتەکانی لێرواو زمانی بە ئەفسانەی ژیان پڕا/ وەک کەروێشکێک خوداکان ڕاوبینێن، پشووم نەبوو/ وەک ئەیزمکێک بەناز، کە ئاسمان ئاشتیبکاتەوە ئاورمنەدەدایەوە/ ئارەقی گوڵەگەنمەکان، بە ئاوچاوانمەوە بوون/ وەک ئەو باڵندانەی ڕێگای کۆچیان لێ ونبوویێت، چاوانم پڕ بوون لە فرمێسک/ لە وێرانەکاندا... لە هەرەسی ئاسمانە ئەڵماس و گیانەلاوی دارەکاندا/ سەمام سەمای گینگڵ و تلانەوە بوو/ ئەستێرە زەین ڕەشەکان و بەلەمە کوێرەکان، وانەی بیرچوونەومیان پێگووتم/ دەمزانی یادگار کاتژمێرەکانی دەستم تووشی تاعوون دەکات/ هەوری ناو شمشاڵەکانم، گریانیان بیردەچێتەوە/ ڕابردوو دەمکات بە ڤاژوویەکی لاڵ و لەژێر بیرەوەرییەکاندا دەبم بە تەپوتۆز/ وەجاران... جارانی ساتە خومار و وەنەوشەیی و خوێنینەکان/ کۆتی خورپەی دەریایی و گێژبوونی ئاسمانیانەم تیا دەچێنن/ ئیدی شارەکان لە پەیامی ئێستام حەرفی خۆڵەمێشی دەدۆزنەوە/ لەدڵمدا ڕستەی ڕەشی لە مانا هەڵگەڕاوە دەردەهێنن/ لەبەردەم ئەوەکاندا ئابڕومدەچێت/ دڵنیایم دەبێتە شورەیی و خەیاڵم ئاگردەگرێت/ پەشێویم دەبێتە جۆرە حیکمەتێک و شێتیم دەبێتە وانەیەک/ عەشقم لە کتێبەکاندا دەبێتە بەزەیی و شیعرم دەبێتە گوناە/ ئیدی دزەکان دەبن بە برای شیریم/ ئیدی گوڵەکانی زەوی تۆ لە غونچە کوێرەکانی من زیزدەبن/ کەسێکیش دەستناداتە بەر هەرەسی ئاسمانەکانی دڵم.

ئیدی شارەکان هەموو لانەوازێکی حیکمەتفرۆش دەردەکەن
بورجەکان پڕدەبن لە دەنگی بروسکە و تاعوون
وشەکانم لە جەهەنەم پەشیماندەبنەوە
ژیانم دەبێتە ڤوماری ڤومارباززێکی پیر
هەموو شتێک لەبەرچاومدا دەبێتە تەم
شیعریشم دەبێتە ورێنەی ورێنەبازێکی پیر.

# ٤

هێشتا ساوایەک بووم
تەڤینەوەی ناو ڕۆحی دارستانەکانم بینی
ئەڵماسی کورەکانی خەیاڵ و مرواری مەنجەنیقەکانی زوڵمەت... هاتنە ڕێگام
گەلێ لە شەیتان وردبوومەوە و تێبینی ئارەزووەکانیم کرد
بەبێ خەونامە، گەلێ لە بەستەڵەکەکانی خەوم شکاند
ڕۆژگارێک بوو، بێدەنگی گوڵ و هاواری باڵندەکانم دەچەشت
بەبێ ویستی خۆم نهێنی بووم، بەبێ ئارەزووی خۆم بەدوای ئەمریدا دەگەڕام
نەمدەزانی دۆزەخ چارەنوسی ئەو پەپوولانەیە کە سوڕی ژیان دەشێوێنن
سزا بۆ ئەو فرمێسکانەیە، لە سەعاتی دەستی خۆیان ناگەن
دەمزانی خودا ڕقی لەمنداڵە و شاعیرەکان هەتیون
دەمزانی گەنم و سێو دوو فێڵن لە کیمیای مەرگ.

ڕۆژگارێک بوو، دەنگی گیانلەبەرە ونبووەکان، ناوی خۆمیان بیربردمەوە
بانگی ئاسمانە دوورەکان، خستییە دڵمەوە فریشتەم
کامەرانییەکی بێسنوور دەوریگرتم
بووم بە تۆڕی شادییەکی ئەبەدییەوە
بووم بە سیحربازێک، بەختیاریم دروستدەکرد
گەلێک شادیم بەخشییە ئەو وشە تاریکانەی هێشتا کێوی بوون بە گەروم

**گوڵی زۆری وەرزەکانی مەحاڵ کەوتنە دەستم**
**گەلێک لەگەڵ ئاوێنە دوودڵەکاندا، بەشەڕهاتم**
**بەڵام دواجار... دواجار، تێگەیشتم**
**کە کتێب فریویداوم و دانایی ئەفسانەیە**

**ڕۆژگارێک بوو، ڕۆژەکانم لە سەعاتی زێڕین بوون و فرمێسکەکانم لە ئاوریشم/ مەرگ لە فەرهەنگەکەمدا مانای نەبوو/ بۆ پرسیاریش ئازارم بە بیردا نەدەهات**
**خەم چی بوو؟... باران بوو... باڵندە... یان ئاین، نەمدەزانی**
**وانەکانم هەر پێکەنین و سەما بوون**
**لەناو خەو و زیندەخەو و وریایدا، من شیعرم لەبەردەکرد**

**بەڵام هەیهات...**
**زانستەکان دەستخەڕۆیانکردم و عەقڵ لە خشتەی بردم**
**ڕۆژگارێک بوو لەگەڵ جیهاندا تەبابووم**
**نامۆنەبووم لە سەیراندا و هیچ شەقامێکیش پیاسەمی بەبێنیشی نەدەزانی/ بەڵام خۆم بە فێربوونی زمان و خوێندنەوەی کتێبەوە سەرقاڵکرد/ پارە بوو بە شەرم و دەوڵەمەندی بوو بە ئابڕووچوون لەلام/ جلی جوانم لە خۆم قەدەغەکرد و باغچەکان بێزیان لە ڕەنگم دەهاتەوە/ بازاڕە جەنجاڵەکان بە برسێتیم پێکەنین و بێزار نەبووم/ بە زەبری ئەو ڕاستییانەی کە بینیم بەختیاریم لە ڕۆحم تۆڕاند.**
**ئادەمێک بووم... هیچ خودایەک نەیدەتوانی لە بەهەشت بمکاتەدەرێ**
**هیچ حەوایەک نەیدەتوانی فریومبدات**

بەڵام خۆم بە پێی خۆم هاتمەدەرێ
ساوایەک بووم، تاپۆکانی بەهەشت، تا هەتایە لە چنگمابوون
دەمتوانـی سەرپشکی هەمـوو ئـەو هەرێمانـە بـم، کـە دەسـتی بـوون پیـا ڕادەگات/ بەبێ خـۆر و ئەسـتێرە و هـەوا دەژیـام/ بـۆ بـوون پێویسـتیم بـە یەزدانێک نەبـوو/ بـەڵام بێزاربـووم لـە بێدەنگی دارسـتان و وەڕزبـووم لـە بێلایەنـی ئاسمان
گاڵتەم بە نائومێدی خوداکان دەهات
دەمزانی دۆزەخ فریوە و کتێبە ئاسمانییەکان تکان
هەموو سزایەک پاڕانەوەیەو، هەموو بڵێسەیەک دۆعا
بەڵام کێ دەیتوانی فریشتەیەکی بێزار پەشیمانبکاتەوە
کە بۆ یادگاریش ناونیشانێکی لە ئاسمانەوە نەهێناوە
بازیبەندی خەزان و فرمێسکی ئەمیرەکانی پایز وا لە دڵیدا

هـات و کۆچـی سـوپاکانی ئاگـر و دەواری خێڵەکانـی سـەرابی بینـی/ مەرگـی کەشتییەکانی بڵێسـە و چارۆکەی بەلەمەکانـی خوێنـی هاتـە بەرچـاو/ بینـی، شـارێکە (بـارەش) ڕۆژژمێـر ناخوێنێتـەوە/ سـەعاتەکان چیدیکـە ناتوانـن بـەرەو پێـش بـڕۆن و زەمـەن لەبەسـتەڵەکدا دەمرێـت/ داهاتـوو کتێبێکـی سپییە و هەمـوو سـاتەکان هـەر ئێسـتان/ ئەبەدییـەت تێکشکانی وەرزەکانـە لەناویەکدا/ تێکەڵبوونـی سۆزەکانە لەناویەکدا/ خنکانـی دەسـتەکانە لەنـاو یەکدا و توانـەوەی جەسـتەکانە بەسـەر یەکـدا
چرای شەقامەکانی پیلان و سێبەری قافڵەکانی مەرگ، ڕایچڵەکاند
ئاگری ئەوتۆی بینی، کە بە هەڵە داگیرسابوون
ڕۆحی ئەوتۆی بینی، کە بە هەڵە دەسووتان

**بینی**
**ژنان لە بازوی مێردەکانیاندا بوونەتە خۆڵەمێش**
**پیاوان بە دیار مۆمەکانەوە بوونەتە (با)**
**پێخەفی بوکێنی نەبێت، هەموو پێخەفێک خوێنی لێدەتکێت**
**دەماری ترسنۆکەکان نەبێت، هەموو دەمارێ ترسی لەبەر دەڕوات**

**شارێک بوو...**
**لە دەرەوە دەمردیت و لە ئاوێنەکاندا زیندوو بوویت**
**لە جلەکانتدا گەدا بوویت و لە کفنەکەتدا پادشا**
**لە خەودا وریا بوویت و لە وریایدا بێئاگا**

**شارێک بوو...**
**بوومەلەرزەکانی تەنیا تەمیان دەلەراندەوە**
**کۆدیتاکانی تەنیا سەرابیان دەڕوخاند**
**تەوقە بەر لە بەیەکدانی دەستەکان دەمرد**
**ماچ بەر لە پێک گەیشتنی لێوەکان تەواو دەبوو**
**ئامێزگرتن بەر لە پێکگەیشتنی جەستەکان دواییدەهات**
**خوێن لە نێوان ئەم دەست و ئەوی تردا دەبوو بە لم**
**لە کتێبێکدا تەم لە پەڕەکانیدا نیشتبوو**
**مامۆستا لاڵەکان وانەیان دەگووتەوە و**
**قوتابییە کەڕەکان لە حەسرەتدا دەگریان**
**بێهودە، ئەم شارە چاوەڕوانی خۆشەویستی دەکرد**
**چونکی دڵی کوڕان، خانەیەکی چۆڵی شەترەنج بوو، سۆزیشیان شوشەیەک بوو بەتاڵ/ دڵی کچان پەلکەزێرینەیەک بوو سپی، عەشقیان ملوانکەیەک بوو، باکان پچڕاندبووی**

ئەوێ شارێک بوو... خوێنی دەپەرەست
گەر دەستەسڕەکان بە خوێن نەشۆرابایە، نەدەکرایە دیاری
ماچ بە لێوی خوێناوییەوە نەبێت... مانای نەبوو
چا لە پیاڵەی خوێناویدا نەبێت... تامی نەبوو
لەسەر فەرشی خوێناوی نەبایە، هیچ ئافرەتێک نەدەهات بۆ جێژوان
یەزدانیان لە خوێن و پێغەمبەرەکانیان لە خوێن
ئاینیان لە خوێن و کوفریان لە خوێن
چاکەیان لە خوێن و خراپەیان لە خوێن
تەنهاییان لە خوێن و دڵداریان لە خوێن
چی دیکە لەژێر پێستەکانیانەوە بۆ گوڵ نەدەگەڕان
لە ژێر پێلوکانیانەوە مرواریان دەرنەدەهێنا
گەروویان بۆنی دەریای لێنەدەهات و
چیمەن لەسەر دەستیان نەدەڕوا

شارێک بوو...
دەیتوانی لە سکی دایکماندا، دەرگامان لەسەر داخات و نەیەینەدەرێ
دەیتوانی بماننووسێنێت، بە پەنجەی خوێناوی مامانەکانەوە
دڵی بازرگانەکانی کردبووە قیبلە و گەشتی سیخوڕەکانی کردبووە تەواف
شمشێری پشکۆی لە گەردنە ئاوییەکانی نێمەدا دەکوژانەوە
دەستی تینووی هەورەکانی دەچزاند بە تەنووری دەریادا
ڕەگی تینوی درەختەکانی لەبری ئاو دەگەیاندە تێزاب
فاڵچییەکان دەیانزانی مردن پێویست بە فاڵ ناکات
جەلادەکانی دەیانزانی، کوشتن پێویست بە لێبوردن ناکات
شارێک بوو
کچان بە جلی درندە کێوییەکانەوە هاتبوون بۆ سەما/ پیاوان بە تۆزی

ئەشکەوتەکانەوە، لە ئاهەنگە خوێناوییەکان هاتنەدەرێ/ دەروێشەکان بە ڕووتی زیکریان دەکرد/ لەبری بۆنی شیر، بۆنی خوێن لە هەناسەی منداڵی ساوا دەهات/ لەبری بۆنی هەڵۆ، بۆنی بەرد لە ئاسمان دەهات

ئاه... مەحشەر بوو... مەحشەر

کەس نەبوو مردوە بێقاچەکان لە گۆڕ بهێنێتەدەرێ/ هەورە ئیفلیجەکان دەستێک نەبوو لە دەریاوە بەرزیانکاتەوە بۆ ئاسمان/ کۆرپەکان تا مردن لە سکی دایکیاندا دەتلانەوە و دەستی خۆیان دەگەست/ شمشاڵ لە لێو دەترسا و کەمان سڵی لە پەنجە دەکردەوە/ کچان دەرگای ئاوێنەکانیان دەکردەوە و تیا دەمردن/ کوڕان بۆنیان بە گوڵاوی کوشندەی قاسەکانەوە دەکرد و دەمردن
شەقامێک بوو
خوداکان بە دارشەق و بازرگانەکان بە ئەسپی تەڵاوە تیا دەگەڕان/ دارستانێک بوو، نە دەبایە بەبێ تەور، بەناو دارەکانیدا گوزەربکەیت
ئاسمانێک بوو
بێ نیزە، هەورەکان کوێریان دەکردی
بەبێ تفەنگ ئەستەم بوو، ڕووبکەیتە دەریا
ئەستەم بوو دڵۆپێک باران نیشانی ئەیزەکێک بدەیت.
ئەو فریشتە تەنهایە تێگەیشت، شایەکە لە خانەیەکی کوژراودا/ شایەکە دەمرێت و نازانێت خوێنی بەسەر چ ڕەنگێکدا دەڕژێت/ نازانێت سەری کردووە بە تەلیسمی چ وەرزێکدا/ بە چ ئاگرێکە دڵی خۆی دەسووتێنێت و بە چ پشکۆیەکە نهێنی ژیانی خۆی خامۆشدەکات
هەستیکرد ئیدی لە کامەرانی و خەفەت بێزارنابێت
ئیدی پێویستناکات:

لەناو ڕێگاکاندا، ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە
لەناو بورجەکاندا، بورجی خۆی بخوێنێتەوە
لەناو ناوەکاندا، ناو بۆ خۆی ئامادەبکات
تێگەیشت:
کە خاڵێکە لە گەردوونێکی ڕوخاودا
دڵۆپێکە لە هەرەسی دەریایەک و
شایەکە لە خانەیەکی کوژراودا.

٥

چ چارەنوسێکی ڕەش بوو، ڕێگاکان بۆ ئێرەیان هێناین
ئەی شاری تاریک و ئەنگوستەچاو
سڵاو ئەی مەنجەنیقەکانی ناو، سڵاو
سڵاو ئەی بتە شوومەکانی تاریکستان، سڵاو
سڵاو ئەی ئەو شورایانەی بەردەکانت بەکوێری ئێمە پێدەکەنێت
کەشتییەکەمان لە ناوەڕاستی دەریادا تێکشکاوە
کەشتییەکەمان بەر ئەو شەپۆلانە کەوت، کە بوونە بەرد
پەلکەزێڕینە ئاسنینەکانی ژێرئاو ئێمەیان خنکاند؟

ئاه، گوناهباربووین/ ئینۆکی کەشتییەکانی ئێمە، مەمکی ئاوەکانی ڕوشاند/ شەو و ڕۆژمان کوشت و وەرزەکانی دەریامان لێکهەڵوەشاند/ بە سەوڵی تێزاب بەیانی ئۆقیانووسەکانمان بڕی/ بە سەوڵی زەمهەریر بەناو نیوەڕۆکاندا ڕابوردین/ چارە نەبوو... چارۆکەکانمان، هەزاران

ماسی فریودا/ هەزاران قرژاڵی هیوابڕاو خۆیان بە دامینماندا هەڵواسی/
هەورەکان قیژاندیان، دەریاش دۆزەخێکە بەبێ ئاگر/ نەهەنگە پیرەکان
گووتیان: وەرن و زنجیری ئاو تاقیبکەنەوە.
لێرەوە ڕۆیشتین و ڕێگاکان بۆ ئێرەیان هێناین
سڵاو ئەی کۆڵەکەکانی خوێ و ئەی پەیکەرەکانی خۆڵەمێش
سڵاو ئەی ئەو پاسەوانانەی لەبری کڵاوی ئاسن، قەلەڕەشکە لەسەر
سەرتانە
خۆش بە حاڵتان ئەی ئەو سیحربازانەی هەور لە دەستەسڕەکانتانەوە
دێتەدەرێ. دەتوانن نوشستی لە خوێنماندا بێننەدەرێ؟

خۆش بە حاڵتان ئەی ئەو جەستانەی ئاو دەتان بات، سڵاومان بەرن
بۆ دەریا
سوپاس بۆ گوڵاوی باغەکانی ڕیسوابوون و بۆ شەمامەکانی تاعوون
سوپاس بۆ ئەو لیرە گەرمانەی لە چنگی ئاگراوی بازرگانەکان
دەرمانهێنان.
بەیانیت باش
ئەی بەهەشتێک، بۆنی گوناهی تازەت لێهەڵدەستێت
ئەی کتێبێک بۆنی بومەلەرزەت لێدێت
ڕێگاکان بۆ ئێرەیان هێناین...
بۆ بەردەمی شارێک پڕبوو لە بتی خەوتوو
چەترمان هەڵکرد و بەژێر تەرزە ئاسنینەکاندا ڕۆیشتین
ئێرە کوێ بوو؟
ئەو دارستانانەی پڕیتی لە توتی فێ لێهاتوو... نەیانزانی
ئێمەش دەمانبینیو کوێربووین، دەمانبیستوو کەڕبووین
کەس نەیدەتوانی بزانێت چ وەرزێکە.

پەلمان دەکوتا تابزانین شەوە یان ڕۆژ.
دەستمان لە پێستە شیفۆنییەکانی یەکتر دەدا،
تا بزانین ئێرە ژیانە یان مردن؟
پەنجەمان دەخستە پرچە سێبەرەکانی یەکترەوە
تا بزانین ئێرە ڕاستییە یان درۆ؟
ڕێگاکان تەنیا ورێنەی کوێری بوون
هەورەبروسکەکان تەنیا گرمەگرمی کەڕ بوون
نەماندەزانی، ئەم تابووتانەی خەو، بەرەو چ دنیایەک دەڕۆن؟/ سوپای ئەم تارماییە تینووانە، بۆچی دەسوڕێنەوە؟/ ئەو زەنگە فێ لێهاتووانە، دەنگیان بۆ ناگاتە گوێمان؟/ بۆ ناوی خۆمان بیرچۆتەوە و یەکتری ناناسینەوە؟
ئەگەر ئێرە زەوییە کوانێ مرۆڤ؟
ئەگەر ئێرە ئاسمانە کوانێ فریشتە و خودا؟
ئەگەر سەرابە کەی خۆرئاوادەبێت؟
ئەگەر ڕاستییە کەی ڕۆژدەبێتەوە؟
ئەم کتێبانە باسی چ کۆتاییەک دەکەن؟
ئەم سەعاتانە نیشانەی چ سەرەتایەکن؟
گۆڕەوشاری ئەم دارستانانە، کەی تەواودەبێت؟
فیستیڤاڵی ئەم مەنجەنیقانە کەی دواییدێت؟
کەی سەفەری ئەم ئامێرە پشکۆییانە لە خەوماندا ئاوادەبێت؟
ئەترسین پزیسکی ئەم کڵپەیە... بگاتە ئەو ئاسمانە پوشە
ئەترسین بڵێسەیەک ئەو مانگە شوشانە بشکێنێت

ئێرە دۆزەخە یان ڕێگایەکە بەرەو دۆزەخ؟
ئێرە ئاگرستانە یان دوورگەیەکی گۆشەگیرە لە جەهەنم؟

لە گۆڕستانەکاندا ئاژێری مەترسی لێدەدەن
باڵندەی سڕ و کوێربوو، لە پەلکەزێڕینە سووتاوەکان بەردەبنەوە

ئاه، ئەی شمشێری بریندار... پێمان بڵێ:
ئەم تاقە وێرانەیە، دیاری داگیرکەرانە، یان یادگاری ئاگرپەرستان؟
ئەم خوێنە ڕژاوە، خوێنی قوربانییەکانە، یان خوێنی جەنگێکی گەورەیە؟
ئەمە وێرانەی بورکانەکانە یان وێرانەی بومەلەرزە؟
ئەم برینانە، برینی شمشێرن یان تاعوون؟
ڕێگاکان بۆ ئێرەیان هێناین
بۆ ئەو کۆشکەی نیوەی لە شەودایە و نیوەی لە ڕۆژ
بۆ ئەو سەردابانەی، کە قفڵیان تیایە بۆ ژیان و
ئەو بورجانەی پڕن لە کلیل بۆ مردن
هاتین و بینیمان، ئەو دەستکێشە ئاوریشمانەی تەوقەی لەگەڵدا دەکەین، دەستی تیانییە
بینیمان، شکاندنی قەفەز جۆرێکە لە شێتی و تەنیایی جۆرێکە لە حیکمەت.

توتییەکان گووتیان: ئەی غەریبە سەرلێشێواوەکان...
دڵتان بکەن بەو نێزانەوە، کە مردن سەلامەتییە.
کونەپەپووە خەڵەفاوەکان قیژاندیان: زانستی ئەهریمەنانە بخوێننەوە/ تەیرەن ئەبابیلەکان، زیخی کوشندەیان تێگرتین/ پەرەسێلکەی گێژ پێیگووتین: بۆ دواوە بگەڕێنەوە/ لەکاتێکدا گەردەلوولەکان هاواریاندەکرد: بڕۆن بەرەو پێشەوە.

ساتێک بوو دەریا و زەوی پێکەوە گۆڕەوشار دەدران
سەرما و گەرما تێکەڵاوی یەکتر دەبوون.
ڕۆح دەخورا و کتێب ئەشکەنجە دەدرا.
لەناکاو تێگەیشتین... ڕێگاکان خۆیان کوشتووە
سبەینێ بەر لە دوێنێ مردووە
تێگەیشتین... ئاسمان لە سەرمانەوە گیاندەدا و
زەوی لەژێر پێماندا تەواوبووە

ئەگەرچی کۆڵەکەکانی مەحشەرمان نەبینی
گوێمان لە شەیپووری هیچ ئیسرافیلێک نەبوو
لە دوریش نرکەی هیچ زیندوبوونەوەیەکمان بەرچاونەکەوت.
بەڵام ئەفسوس... ڕێگاکان لەویادا تەواوبووبوون
نە دانایی خودایەک و نە دڕندەیی ئەهریمەنێکمان نەبینی
ئەفسوس
بەبێ قامچی و ئاگر... بەبێ شەراب و حۆری دەمردین
بۆ دواجار ڕەوابوو، بۆ پەیامبەرەکان بگرین
ئەو پەیامبەرانەی نەیانتوانی ئەمجارە کەشتییەکیشمان پێبدەن سواربببین
نەیانتوانی هیچ نێر و مێیەک لەم کۆتاییە خەمگینە ڕزگاربکەن
سەفەرمان ئەمجارە لە کەشتییەوە بوو بەرەو کارەسات
نەک لە کارەساتەوە بەرەو کەشتی

## ٦

**ئەی ئەو شارەی هێشتا لە خەیاڵی خوڵقاندا بوویت**
**لە تاریکییەکی ئەنگوستەچاودا هاتم**
**ئەستێرەناسێکی قژ درێژ بووم، پێشبینی کارەساتەکانم دەکرد**
**بەختگرەوەیەکی منداڵ بووم، کتێبەکەم پڕیبوو لە زریان و بومەلەرزە**

**سۆفییەکی کافر و دەروێشێکی بێبڕوا بووم**
**لەناو گرمە گرمی ماشێنە پۆلاینەکانتدا، وەک خورافات پەرستێ خۆم پیشاندا/ دەمویست تەفسیری تازە بۆ کۆچی باڵندە و درەوشانەوەی ئەڵماس بکەم/ لابورەکانت بکەم بە دایەنگای جادوو، زانستەکانت پڕکەم لە ئەفسانە/ پرسیاری تازە لە وەڵامە کۆنەکاندا بدۆزمەوە و وەڵامی نوێ بۆ پرسیارە کۆنەکان دروستبکەم**
**بەڵام زریان لە کتێبەکانمدا مردبوو**
**بومەلەرزە نەخۆشەکانم دەترسان**
**گووتم: بجوڵێن، ئەی حەرفە ترسنۆکەکان**
**ئێرە یەکەمین ڕۆژی دروستبوون و ئاخرین دەرفەتی نەجاتە**
**دەبێت لێرەوە ڕابوورین**
**بجوڵێن کە هێشتا ڕوناکی و تاریکی لە یەکتر نەبوونەتەوە**
**هێشتا خودا نەگەیشتۆتەوە ڕۆژی دووهەمی**
**ئێمە لەم ساتەدا کە هێشتا بوون نەبووە، دەبێت تێپەڕین**
**گووتم: ئەی حەرفە ئیفلیجە دژەکان**

**کە گەردون دابەشبوو، ئەم شاری ئاسنە دروستبوو، ئێمە دەمرین**
**ئێمە لەناو تێکەڵبوونی یاساکان و ڕەنگەکان و وشەکاندا دەژین**

**بەرلەوەی خودا باڵندە دروستبکات... با باڵی خۆمان دروستکەین**
**بەرلەوەی نەتەوە و میللەتە شوومەکان دابەشبکات**
**با ببین بە قەرەج**
**ئاچینە بەهەشتێک سبەینێ دەرمانکات**
**با هەموو بەهانە پوچەکان لە چنگی ئاسمان دەربێنین**
**بێ گوناه بێینە سەر زەوی و بێ زیندووبوونەوە با بمرین**

**بەڵام کەوتینە ناو شارێک هەموو بنەماڵەکانی سەراب و خێڵەکانی فیتنە و قافڵە شوومەکان لەوێ بوون/ هەموو منارەکانی گوناه و سەعاتەکانی بێشەرمی و ساتەکانی غافڵ بوون، لەوێ بوون/ لەناو دوکەڵێکی ڕەشدا، ملیونەها مرۆڤی کوێر، چاوەڕوانی چاویان دەکرد/ چاوەڕوانی پەنجە و خوێن و ددان و چرنوکیان دەکرد/ ڕاوکەرەکان چاوەڕوانی نێچیر و نێچیرەکان چاوەڕوانی ڕاوکەریان دەکرد/ ڕق دەیویست بەر لە خۆشەویستی و خۆشەویستی دەیویست بەر لە ڕق دروست بێت/ زنجیر دەیویست بەر لە دەست و دەست دەیویست بەر لە زنجیر دروست بێت**

**ڕۆژێک بوو، کەشتییەکان، ملیونەها مرۆڤی نیوەیان، توڕدەدایە دەریاوە/ پەرییەکان هەزارەها منداڵی سڕبوویان، هەڵدەگرت بۆ لای خودا / زەوی بە بورکان زمانی دەپژا و ئاسمان بە ڕەنگی بروسکە چاوانی دەپشکووت / یەکەمین خێڵی بێزمان، لەناو گڕەوە هاتەدەر/ یەکەمین جەلاد لە پێشدەم قافڵەکانەوە ڕێیدەکرد/ یەکەمین کۆیلە و یەکەمین بەیداخی ملکەچی دەرکەوتن/ یەکەمین سەعات بۆنی یەکەمین خوێنی لێدەهات/**

یەکەمین چرکە بۆنی دواهەمین باروت و یەکەمین سینە، بۆنی ڕزینی دواهەمین دڵی لێدەهات/ کەشتییەکان ملیونەها مرۆڤی بەرماڵ لەشانیان ڕۆکردە سەر زەوی/ یەکەمین بەرماڵ هەڵگری یەکەمین کوفر و/ ڕەنگی دواهەمین گومڕایی لەسەر ڕوخساری یەکەمین نوێژ نیشتبوو
پەرییەکان دەیانگووت: مژدەبێت ئەی جەهەنم ئیدی چۆڵ نابیت. مژدەبێت ئەی قەفەزەکان ئیدی تەنها نابن
لە یەکەمین بستی زەویدا... یەکەمین زیندان
لە یەکەمین درەخت... یەکەمین سێدارەیان دروستکرد
هەر ئەو شەوە خوێنی یەکەمین کچێتی، بەسەر یەکەمین پێخەفدا ڕژا
هەر ئەو شەوە ڕێگاکان پڕبوون لە چەتە و قەفەزەکان پڕبوون لە باڵندە
بینیمان... کوێرەکان بە گۆچانەکانی دەستیانەوە بە زۆنگاوەکاندا دەڕۆن/ لەشکرێکی شەل بە دارشەقەکانیانەوە بەدوای مردندا دەگەڕان/ باڵندەکان لە جیاتی هێلانە، گۆڕی چکۆلانەیان لەسەر لقی درەختەکان هەڵدەکەند/ تابووتەکان سەعاتەکانی خۆیان لەسەر سفر دادەنا و دەکەوتنە ئیش
بینیمان... دڵی یەکەمین عاشق لەسەر یەکەمین سفرەیە
زمانی یەکەمین ڕاستگۆ، لەسەر پشکۆکان دەسووتێت
بینیمان... بەرلەوەی ئەستێرە دروست بێت، دەڕوخێت
مرۆڤ بەرلەوەی یەکەمین پرسیاری بپرسێت... دەکوژرێت
سەراب دەیتوانی بەناو لەشماندا ڕابورێت
چەقۆش دەیتوانی سێبەرمان سەربڕێت
ئەو پەلکە زێڕینانەی لەناو چاوانمانەوە هەڵدەهات، خوێنی لێدەتکا
دڵی ماسییە خنکاوەکانیش، لەناو دەستماندا چەخماخەیدەدا
بنەماڵە شێتەکان لە تۆڕی ئاگردا سەمایاندەکرد
کۆچەرییە کوێرەکان لەناو هالاوی دەریاچەکانی تێزابدا، دەواریان

هەڵـدەدا.
لەسەر بناغەی یەکەمین کوخت، چیرۆکی ڕوخانی دواهەمین کۆشک
لەسەر یەکەمین بەری دەست، پەخشانی دواهەمین مردنمان خوێندەوە.
قەسابەکان بەرلەوەی چەقۆ هەڵگرن، کەوتنە دانانی شەریعەت
بەرلەوەی خۆر هەڵبێت، جارچییەکان یاسایان بۆ خوێندینەوە
ساتەکان هێندە باریکبوون پیایاندا نەدەچووین
بـە یەکەمیـن تەشـوێ، لـە یەکەمیـن بەیانـی و بـە یەکـەم ددان لـە زگـی یەکەمیـن دایـک هاتینـەدەرێ/ بە یەکەمیـن مەرگ دەمانویست لـە نهێنییەکان و بە یەکەم هەناسە دەمانویست لە ژیـان تێبگەیـن/ بـۆ سروشتی کانزاکانی تـرس و دەرونـی میتاڵەکانـی گریـان دەگەڕایـن/ لەگەڵای یەکەمیـن درەختـدا، سـێبەری دواهەمیـن زەمهەریرمـان دی/ لـە تـۆوی یەکەمیـن گـوڵا، هەوێنـی دواهەمیـن ئاگرمـان دۆزییـەوە
کوشندەبوو... کوشندەبوو
پەنجەکانی خودا لەسەر لەشمان و حەرفەکانی ئەو لەسەر دڵمان
پاکیمان وەک گوناهبارێک، باخیبوونمان لە سوژدەدا... کوشندەبوو
تێزاب لە یەکەمین تیشکدا و گڕ لە یەکەمین تـاریکیدا
کینە لە یەکەم ماچ و خەنجەر لە یەکەم لەئامێزگرتندا
بێهۆشی لەیەکەم وشە و یەکەمین وشە لە دواهەمین کتێبدا... کوشندەبوو
سەرمان لەسەر جەستەمان و جەستەمان لەژێر پێماندا
دڵمان لە سینەو سینەمان لە ژەهردا
خوێن لە لەشماندا و لەشمان لە خوێندا...
کوشندەبوو... کوشندەبوو... کوشندە.

پایزی ١٩٨٧

# ١

**گوناه هات**
**ئەی خوایە تۆ لەکوێ بوویت؟**
**وەک مەیتەرێکی پیر ڕەوە ئەسپە ماندووەکانت ئاودەدا؟**
**وەک شوانێکی سەرمابردوو، فووت لە کورەکانی دۆزەخ دەکرد؟**
**یان وەک کەیبانوویەکی خەستە،**
**پەنجەرەی کۆشکەکانی بەهەشتت پاکدەکردەوە؟**
**تۆ لەکوێ بوویت... لەگەڵ فریشتەکاندا خەوتبوویت؟**
**لەذەتی شاهانەی خوایەتی، ئەو خوێنەی لەیادبردبوویتەوە**
**وەک فوارە لە نێوچاوانمانەوە هەڵدەقوڵی؟**
**خوای گەورە کوا؟**
**ئەو سامانەت چی لێکرد، کە باڵندەکان کۆیانکردبووەوە، هێلانەی پێدروستبکەن؟/ ئەو پارەیەت لەکوێ دۆڕان کە ڕیشۆڵە خەمگینەکان، کۆیانکردبووەوە، تا گەرووی کەناریی پێبکڕن؟**
**دات بە چ فریشتەیەک و لەگەڵیدا خەوتی**
**چیت لێکرد؟... ئەو گەنجینانەت چی لێکرد؟ کە پایزەکان، لە سنگیاندا هەڵیان گرتبوو، ڕۆژێکی بەهاری پێماچبکەن/ کیژە بێدڵدارەکان لەژێر مەمکیاندا دایاننابوو، خۆشەویستی کوڕە قژ زەردەکانی پێحاسلکەن/ ئەو پەپوولانەت چی لێکرد، کە سەمایاندەکرد لە سەرمدا؟/ کوان ئەو گڵۆپانەی لە تاریکستانەکانی کوفردا، لەسەر زمانما هەڵدەبوون/ کوان ئەو زارانەی، لە قومارخانەکانی ئومێدا، هەڵمدەدان؟**

**گوناه هات**

**بێهودە گوێی درەختی باخچەکانم بەتەرزە ئاخنی، تاگوێیان لە شەپیورەکەی نەبێت/ بێهودە لەشم بەعەشقی نابەجێ پڕکرد، تا هەست بە قامچییەکەی نەکەم/ ڕووی پەنجەرەکانم کردە خۆم و لێوم نا بە لێویانەوە/ دەستمخستە نابەینی مەمکی درەختەکان و گۆرانیم گووت/ سەرمخستە سەر باڵی نەرمی کوژراوەکان/ تیری غەفڵەتم لە دڵم دەرهێنا و ئەسپە وێڵ و سەرگەردانەکانم بانگکرد، ئەو ئەستێرانەم بانگکرد/ کە وەک جانتای تەنگی سەفەر، جلی خوێناوی ئەیزەکەکان، لە دڵیان هاتبووەدەرێ/ ئەو ئەستێرانەی نینۆکیان لە جەرگی ئێمە ڕەنگدەکرد و دەیاندایە بەر کزەبا گەردونییەکان**

**بانگمکرد و گووتم:**

**بمدەنە دەست ئاوێک، لەسەرچاوەوە کچە سپڵەکان دەمیان تێنەخستبێ**

**بمدەنە دەست شەپۆلی بیابانێک، لە ئەزەلەوە قافڵەی پیاوە نامەردەکان پێیان تێنەخستبێ**

**گووتم: گەلا مەنێن، بەڕووتییە پاکیزەکەمەوە**
**لێگەڕێن، با هەتاو سەرخۆشمکات، ئەوەک مەی**
**با لەدەست (هەنگ) هەڵبێم، ئەوەک گوللە**
**لێگەڕێن، با خۆم خێزان و خێڵ و نەتەوەی خۆم بم**
**خۆم مانگ و ئەستێرە و ئاگر و زەمهەریری خۆم بم**
**با لە کتێبی، پەنجە خەوتووەکانی خۆمدا،**
**بۆ سیحری کیمیای دەروونی خۆم بگەڕێم**
**با لە گێژەڵووکە موگناتیسییەکانی ئازار و عەشقدا**
**ئەو خەونە پیرە بم، کە لە دوورەوە وێڵتاندەکات**
**هەتاهەتایە ئەو لێوە سەرابیانە بم کە ماچ نایانگاتێ**
**ئەو تەمە نازکەی ڕۆح بم، کە دەستی هیچ کچێک نایگرێت**

ئەو قافڵەیەبم کە نە جەردەیە و نە یاسا
ئەو باڵندەیە بم کە نە ڕاوکەرە و نە نێچیر

بەڵام وای بۆ پەژارەی من... وای
وای لە ئازاری من... وای

چرپەی ڕۆحێکی نەزانراو کە نیوەی لە خوا دەچوو، نیوەی لە شەیتان
پێیگووتم: ئەو ڕۆژە دێت... ئەو ڕۆژە دێت
کە بەو لێوە تۆزاوییانە بە تۆزی بەخیلی و خیانەت، ماچتدەکەن
ئیدی ئەو کوڕە پەپوولەیە نابیت،
کە باران لە کارەساتەکاندا پڕ بەگۆناتدا بکات
ئەو منداڵە ئەزەلییە چاو پڕ لە فرمێسکە نابیت
کە دارستان سوژدەی بۆ نیگاکانت دەبرد
ئەو کوڕە بێگەردە نابیت،
کە تەم خۆشیدەویستیت و هەور خوازبێنیتی دەکرد
ئەی منداڵی دڵسۆز...
ئەی گورزەیەک لە تیشکی خوا، هیچ شتێک نییە، تۆ بکوژێت
خۆت نەبیت... خۆت نەبیت

ڕۆحێک کە نیوەی لە ئاو بوو، نیوەکەی دیکەی لە خەڵوز
بە چرپەیەک وەک چرپەی سەعاتەکانی ئەفیون
پێیگووتم:
ڕۆژێک دێت، کچان بە دەستی پیس و خوێناوی
بەخوێنی گوناه و بێوەفایی... لە پێخەفە سپییەکانیاندا دیلتدەکەن
کچێتی پیر و ئەستووری خۆیانت پێدەفرۆشن و پیستدەکەن

ئیدی ئەو ڕۆحە ئازادە نیت
کە هیچ جادووبازو پادشایەک نەتوانێت، بە تۆڕی هیچ تەلیسمێک ڕاوتبکات
هیچ کچێکی بێوەفا وَ هیچ عاشقێکی ڕاگوزەر نەتوانێت،
پەنجە لە پەنجەیەکتەوە بدات
وای چ ماسییەکی دەست خەڕۆیت... وای
وای چ کۆترێکی خەڵەتاو و دەستبڕاویت... وای

ڕۆژێک دێت
ببیتە ئەو بەلەمەی هەر پارچەیەی ڕوو لە دەریایەک دەکات
ببیتە ئەو تەرازووە شەلەی هیچ هێزێک تاکانت ڕاست ناکاتەوە
ڕۆژێک دێت
ئەو زۆرانبازە دۆڕاوە بیت، لە یەکەوە تا هەزارات بۆ دەژمێرن و هەڵناسیتەوە
ئەو مەلەوانە خنکاوە بیت، لە سەعاتێکەوە تا هەزارت بۆ دەگرن و ناپەڕێیتەوە
هاوارمکرد و گوڵە سپییەکانی عەشق گووتیان:
ئەی ئەو پیاوەی لەبری بۆنی باروت، بۆنی ئەو ڕۆحانەت لێدێت
کە بەسەردان دێنەوە بۆ ئەم دنیا.
لەبری دەنگی گوللە، دەنگی لێکجیابوونەوەی وەرزەکان لە دڵتایە... بڕۆ
ئاوەکان گووتیان: بڕۆ، ئەی ئەو شاهەنشا ڕەشپۆشەی، ڕۆژگارێک بوو، پادشای گوڵە بێکەسەکان بوویت... بڕۆ
دارستانەکان گووتیان: بڕۆ، ئەی ئەو جبەپۆشە چاونەترسەی، سەرمەستی گوێگرتن بوویت لە پۆستاڵە زەردەکانی پایز.

وا گوناه بە خۆی و پادشاکانییەوە هات
ترس، بە خۆی و ژەنراڵەکانییەوە هات
مەرگ وەکو سیحربازێک، بە پرچە درێژەکانییەوە، لەوسەری شەقامەکانەوە دەرکەوت/ وەک سەعاتێک شەراب لە میلەکەی بتکێ، تۆڵە لە پەنجەکانی دەتکا/ هات و تیشکی سەرابئاسای ئەفسانەیی باران بەسەر سەرمدا/ من ماسی زمانئەزان و نەفام و گێل، دوای عیشوەی ئەو قژە زەردەی کەوتم/ دوای شەرابی ئەو دڵە بێباکەی کەوتم... کە وەک ئاو خستبوویە بەردەستم

وای لە من وای... وای لە من وای... وای لە من و..ا..ی

وەرن سەیری هەناسەم کەن
دەڵێی دڵم ئەو کیشوەرە تەنیایەیە، کە شەیتان حوکمی تیادەکات
هات و بە زێڕ، بە ئەفرینی باروت و خوێن، دڵمی کڕی
لەسەر مێزی خەونێکی خەتاکاری شەراباوی
کە گیای ڕۆحم مەستتر لە )با) دەهەژێ
دارستانەکانی سینەم، جریوەی پاساری (ئاگر) غەڵاندنی... هەموو شتێکی لێسەندم
وای لەمن... وای

لە خاکی بەرپێی بتەکاندا، بۆ جێنەژنۆی سوژدەکانی من عەوداڵ بوو
لە مەرگی ئەورەسەکاندا
بۆ مەرگی نهێنی و شاردراوەی ڕۆژانی زووی من عەوداڵ بوو
گوناه هات
من ئەستێرەیەکی نوستوو، تەنها، خەوقورس بووم

گیای بێحەیا و درەختی سۆزانیم نەدیبوو
نەمدەزانی گوڵی شەڕفرۆش و ماچی کوشندە هەیە
بارەکەم زستانی سارد و تەرزەی پیر بوو
لە بورجەکانی سەرما و لەزەتدا نوقمبووم
سەرەڕۆ و بێخەیاڵ، تەفرەی سەعاتەکانی زیندەخەوم هەڵگرتبوو
بەژێر ئەو ئاسمانانەدا ڕۆیشتم و دەنگی زەنگەکانی ئەفیون... بانگیانکردم
خۆری ژەهرپرژێن بەسەر خاکدا چاوساغم بوو
ئەو ئەیازکە شوومانەی، زەنگی هەمیشەیی خەتەر، لە دڵیاندا دەهاودەچوو
نەخشەی پێپلکەکانی ئاسمانیان نیشاندام و نهێنی سەردابەکانی شادییان بۆ خستمەڕوو/ ئەو نیازکە خنکاوانەی، کۆیلەی زنجیرە بایەکی نەبینراو بوون/ بە چپەی ئەفسوناوی خەمێکی لە مرۆڤ حەرام/ بەزمانی جادوویەکی گەورە و مەزن...
ئۆقیانووسەکانی خەیاڵیان، نیشاندام
ڕۆیشتم و هەور ئاخودای گێل و خەواڵووی سەفەرم بوو
لەسەر تەختەی وەنەوشەیی پاپۆڕەکەی، ئەو دڵۆپە بارانانەی دامێ
کە بە ئەشئەو گومڕایی ڕەش، بەبێهۆشی و گوناهی دڵڕەقانە، فریویاندام
گوناهمکرد، گوناهی سپی و ڕەنگاوڕەنگ
من سێبەری خۆڵەمێشی نیگای ئەوم، لەناو دەفتەرەکانی خوادا دی
من ئەفسونی ڕەنگاوڕەنگی دیدەی ئەوم لە دڵی ئاگرگرتووی پەرییە خنکاوەکاندا دی
بینیم لە سەرابستانەکاندا بە دوای مندا ڕێگای ئەفسانەکان دەبڕێ
بینیم لە لۆفەکانی ئاگردا بەدوای مندا یەخەی فریشتەکان دەگرێ
گوناهمکرد
تفەنگێک نەبوو بمترسێنێ و سێدارەیەک نەبوو خەوم لێخا
وەک ئەو وشانەی، لەژێر پەنجەمدا مردن

لەژێر زەبری جوانییەکەیدا، دڵم ژاکا
وای... چەندە دڵڕەق و بێخەیاڵ بووم، لە ترۆپکە سپییەکانی شادیدا بێباک
نەشتەرەکەم چەقاندە دڵی ئەم لاپەڕە سپییانە
وای... حەرفم کوشت، حەرفی وەکو فریشتە پاک
لە گەرومدا وەکو زەنگی پەشیمانی، هێشتا زرنگەیان دەهات

**گوناهمکرد**
تا بەلەشی پاکیزەوە نەگەڕێمەوە بۆ لای خوا
لێوم وەکو قەتران ڕەش بێ و نیگام وەکو بەرد بێوەفا
قافڵەکانی ڕق لە مەرهەمی ڕەشی خۆیان پێبەخشیم
قافڵەکانی خۆشەویستی لە دوامەوە کەوتنە نزا
بەڵام من جەستەم یەخسیری خەیاڵێکی تەماوی بوو
خەیاڵێک وەک نەیزەک بە چاوما تێپەڕی و کەوتە دڵمەوە وەکو »با«
خەیاڵێک کە گەروی پڕکردم لە کوفر و لە ستایش
نەیدامە دەست یەزدان و شەیتانیش دڵی لێمشکا
نا، من نە منداڵی بەوەفای ئەوین بووم و نە دەستگیرانی هەتاهەتایی ڕق
ئەهریمەن داڵدەینەدام و لە بەهەشتیش ئابڕومتکا.

# ٢

گوناهمکرد
ڕەگم وەکو ڕەگی درەختە پیرەکان، بە زەویدا، چووبووە خواری
هیچ شتێک نەبوو بتوانێ لەم زەوییە هەڵمکەنێ
گەردەلوول لە سینەم دەهات و مەرگ لە دڵمەوە دەچووەدەرێ
گوناهێک بووم، شەوبۆی وەکو زوخاڵم لێڕوا
زوخاوی وەکو قەتران ڕەش بوو بە خوێنم
گوناهباربووم و ئەستێرەی لە خۆم گوناهبارتر
گەنجینەکانی ئاسمانیان دزی و بەبێباکی کەوتنە شوێنم
نا، ڕۆژانێک بوو، دڵم پڕبوو لە شەرم و شکۆی خوایانە
بەڵام دەستێک دڵی خستمە سینەی گوناهبارێکی مردوو
بە بزمارێکی ژەهراوی دڵی ئەویان، بەسەر سینەمدا داکوتا
ئەو بە پاکی چووە لای خوا
شەرمی ئەویش وەکو قەترە شەونمی ڕەش
بەسەر ناوچاوانی مندا تکا.
ئێستا پادشایەکم، ڕۆحە ئاوارەکان پاسەوانی کۆشکەکەمن
ئەو ڕۆحانەی لە ئاگربارانێکی ڕەشدا، دڵیان بوو بە خەڵوز
لە بەهەشت و لە دۆزەخدا قەدەغەن و لە دەریای ئەفیوندا دەنوون
پادشایەک بووم.
لەبەردەم هەموو ئەستێرە دز و مانگە پیاوکوژەکاندا، سوێندم خوارد
باغەکانی بەهەشت بسووتێنم و ئاگرەکانی دۆزەخ خەفەکەم

دەستمخستە سەر کتێبی پیرۆزی خەتاکاری و لێوم نا بە یەقینی ئاڵی
گوناهەوە
ئەو کەشتییە خەواڵوو بێخەبەرەی،
تاریکە شەو لە دەریا باوێشکدەدا
ئەو نیازکە شەرمنانەی
بە ماچی (با) ڕوومەتیان سوور سوور هەڵگەڕا... چەواشەکەم
خەتامکرد و بوومە پادشاهێکی مەزن
سوپاکەم ئەو ڕاوکەرە قژلوولانە بوون، لە کیشوەری ئاو هاتنەدەرێ
ڕاوکەری ئەوتۆ حەسوودبوون کە چنگیان پڕ بوو لە گەوهەر
کراسی خوێناوی ماسییە کوژراوەکانیان لەبەرابوو
تاجی ڕەشی شاهەنشاکانی ئاویان کردبووە سەر
ڕۆژگارێک بوو، بەرلەوەی ڕۆحی من وەک تەلیسمێک بیانکڕێ
دەستی ئەیزەکە ترساوەکانی ئاویان دەگرت و
سیمرغە پیرەکانیان تا دەرگای ئەفسانە دەگەیاند
نهێنی ناو تەلیسمەکانیان دەدۆزیەوە، میوەی کریستاڵییان دەوەراند
لەژێر بارستاییەکانی ئاودا، شەوو ڕۆژ ئاسوودە دەکەوتن
گوێیان لە زرینگەی بورجەکانی خەون دەگرت
لە دوورگەی شادومانیدا دەخەوتن
ڕۆژگارێک هات... فێرمکردن
چۆن بە چاوی پڕ جادوو تەلیسمەوە
سەیری بورجەکانی ئاسمان دەکەن تا دەڕوخێن
لەو کۆشکەدا، کە بەوێنەی ڕەنگاوڕەنگی گوناه ڕازابووەوە... فریومدان
زمانی تازەم فێرکردن... زمانی کۆنم پێتوڕدان
پادشایەک بووم، لە خەونمدا، سەرخوانی ڕازاوەی خواکانم دی
سەرمەست بەبۆنی شەراب و ئەفیونی سفرەکەیان، هاوارمکرد: یاخیدەبم

**بەدڵی خیانەتکاری پیاوێکی مردووەوە**
**نە بە چپەی غەزەلانەی تافگەکانی چاوەڕوانی**
**نە بە سووڕی مزگەرانەی ئەستێرەکان نەخەڵەتام**
**سەرمدایە بەر دووشیِ ڕەشی نەفرەت**
**لەژێر فوارەی خوێنینی دوورگەکاندا... وەستام**
**دەفی ڕەشی سواڵکەرەکان لە شانمدا بوو**
**جانتایەکی پڕ لە پەپوولەی پەشیمانم هەڵگرتبوو**
**پادشایەک بووم**
**دەمویست بە گوناهی بچکۆلەی خۆم، گوناهە گەورەکان ڕیسواکەم**
**دارستانە سەرخۆشەکانی ئاسمان**
**بە گوێچکەی ئاورنگاوییەوە، گوێیان لە هەنگاوەکانم گرت**
**نیازکێکی ئاگراوی سپیە سووتاوەکانی خۆی پێبەخشیم**
**با گوێچکەی ڕاکێشام و لەبەردەم جەنگەڵەکاندا بەبۆنکەوتم**
**ویستم بە نوقورچکی چکۆلانە**
**ئەو دارانە لە خەو هەستێنم کە هەزاران ساڵە نوستوون**
**ویستم ڕێگا بۆ هەورەکان ڕاستکەمەوە**
**ئەو هەورانەی بە چاوی شینەوە ونبوون**
**دەنگی تەپڵە ئاگرینەکانی شەڕێکی دوور دەهاتەگوێم**
**سەمای هەزارەها تارمایی ڕەش، لە پێش چاوما دەهاودەچوو**
**ملیۆنەها فرسەخی دوورم دەدی و پزیسکی پاکێتییەک نەبوو**
**جارێکی تر بۆنی ئەو ئەستێرە شەرمنانەی »با« کراسەکەی دڕیبوون**
**بەلەمی خەون و خەیاڵی گومڕاکردم**
**بەناو دەیەها شەوی ڕەنگاوڕەنگدا تێپەڕیم**
**ئەو شەوە بێشەرمانەی وەک سۆزانی لێوی خۆیان سوورکردبوو**
**ئەو شەوە بێباکانەی شەماڵی کورەیەکی ڕەشیان دەدا لە ڕووم**

ئەو شەوانەی بە کزەبا خوێناویەکەیان، مارانگازبوو گۆنام
بارانیان وەکو شیلەی ڕەش، لە ڕوومەتم نەدەبووەوە و
لە گێژەنی گەڵا زەردەکانیاندا سووتام
فریشتە ڕەشپێستەکانی دۆزەخ، ڕێگای ڕزگاری و خەونم بوون
موریدی هەتاهەتایی گوناه بووم
بێزار لە خوا و لە گەردون و ژیانەوە
دڵم بە شەرابی خەستی بێدینی گەشایەوە
نە گرەوم لەسەر مێژوو کرد و
نە دڵم لە عەشقی پاشەڕۆژێکی شیریندا توایەوە
نە دڵم بۆ ئەو تەلیسمە پاکە بوو
کە عاشقانی ساویلکە فریوی سیحرەکەیان خوارد
نە ئەنگوستم خستە سەر کتێبی جادوو
نە نزام بۆ فریشتەکان نارد
نە باوەڕم بەم دنیایە هێنا و نە بەو دنیا
نە بووم بە کۆیلەی بەزەیی و نە بووم بە ملکەچی ڕیا
شەوی تۆفان بە پێکەنینی شێتانەی گەروی خۆم گەرمم بووەوە
شەوی ڕق وەکو نیچیرێکی بریندار، دڵی پاکم کەوتە دەستی
شەوی عەشق بێباک پێم نا بەسەر جەستەی دڵدارە شێتەکانمدا
شەوی ئاگر بە کڵپەی نیگا ساردەکانی دڵم بەستی
ژەهر لە دەمارەکانمدا بووە پاشا
زرینگ... زرینگ... زرینگ... زرینگ
زەنگی ماتەمینی بۆ هەتاهەتایە، لە ڕۆحما دەنگیدایەوە
بە بەلەمەوانە یەخسیرەکەم گووت: با دیسان چارۆکەکەی هەڵکات
بە (با)ی هیچ خۆشەویستییەک و بە (چرا)ی هیچ ڕقێکی پیرۆز
فریونەخوات

**گووتی: ئەی دەریاوانی گێژ و خەووتوو بە ورشەی ئاو**
**ئەی ئەو پیاوەی سپیەکانت پڕێتی لە شەونمی وەک لم ورد**
**ئەی ئەو عاشقەی نە نەخشەی دەریات پێیە و**
**نە لە حەرفی شەڕانگێزی ئاو تێدەگەیت**
**ئێمە و ئەم بەلەمە کلۆڵانەت بۆ کوێ برد؟**
**نە بە سەراب فریودەخۆیت نە بە ڕاستی**
**نە بە خەندە شادمانی نە بە گریان**
**نە تێر لە گوناه دەخۆیت نە لە پاکی**
**نە لە زمانی مردن دەگەیت، نە لە ژیان**
**سەرمەست بەو بەیداخە ڕەشەی لەلای چەپمەوە، دامنابوو**
**عاشق بەو ئاڵا سپییەی لەلای ڕاستم هەڵکرابوو**
**لە سەر مێزی خوانێکی پڕ لە مەی و ئەفیون وەستام**
**مێزێک کە هەرگیز نەمزانی... ئەهریمەن ڕازاندویتییەوە، یا یەزدان؟**
**گیرفانم پڕکرد لە چکلێتی ژەهراوی شەوە ئاڵووالاکانی پێش خۆم**
**کە ئێستاش تێنەگەیشتم**
**دیاری مەرگ، یان دیاری فریشتەکان بوون بۆم**
**لە هێشووی هەزاران باغچەی سیحراویم خوارد**
**بوغوردی هەزاران نیازکی ژێر ئاوم هەڵمژی**
**خۆری تازە لە گەرومدا هەڵهات و دەستم بەرەو ئاسمانی تازە هەڵبڕی**
**دڵم بەردی وورشەداری تاوان بوو، پەنجەم قیبلەنمای گوناه**
**سینەم حەرفی ئازاری لێنووسرا و گەروم بە زمانی خەون دوا**
**لە جگەرمدا بای تەلیسم هەڵیکرد**
**لە ڕۆحیشما چیمەنی ئاگرین ڕوا.**

# ٣

**گوناهمکرد**
**کاتێک ئاسمان وەکو باوکێکی دڵنەرم، ئامۆژگاریکردم**
**کاتێک زەریا پەندی شەرەفی خوێندەوە بۆم**
**گوێمنەدایە زەردەخەنەی هیچ خۆرێک و لەحیکمەتی هیچ تریفەیەک رانەمام**
**بێئەوەی مەلەبکەم و لە زەریا بەم لەناو دڵی خۆمدا خنکام**
**سندوقێکی تاریک بووم تەنها بەچرای گوناه ڕۆحی خۆمم بینیبیەوە**
**مەحکەم نهێنییەکانم شاردەوە**
**مەحکەم نەخشەکانی دەروونی خۆم، یەک یەک سووتان**
**نا... دڵی من نەڵماس نەبوو، دڵم ژوورێکی تاریک بوو... پڕ لە گریان**
**ڕووبارە خەڵوزینەکان هاتن و**
**ورشەی ڕۆحلەبەری ڕەشیان بۆهێنام**
**گوڵی زمانزان هاتن، و گەرومیان ڕازاندەوە بەوشەی بۆندار**
**لە تاریکی جەنگەڵەکاندا حەرفی کتێبی نوێم دۆزییەوە**
**ڕۆحم کەژاوەیەکی سووری پڕ لە جەردەی ئاوڵاوی بوو**
**لە دڵما قافڵەی کچە تاعوونییەکان کۆچیاندەکرد**
**من بووم، ئەم دەستە بێڕەحمانەی من بوون**
**قیبلەنمای کۆچی باڵندەکانیان شکاند**
**لە گێژەنی ئەزەلی و بەردەوامی نهێنیدا**

بووم بە هەڵگری کلیلی تەلیسمستان
لەسەر ئەو پردە پشکۆییانەی خەیاڵ، دوربینی ئاواتێکی دوور لەملما بوو. بە تیغی ئەو فسفۆرە سەوزەی، لە شانشینە خنکاوەکانەوە هات، گەشامەوە. »با«ی کیشوەرێکی پڕ نەفرین، لەگەڵ دەستە پیسەکانیدا رایدام
وەرەقەی ژەهراوی قومارێک بووم، بۆ جارێک توڕدرامە سەر ئەم مێزە
وەک هەر یاخییەکی بەدڕەوشت و بەگومڕایی خومار
دەستووری قومارخانەکانم گۆڕی و ڕەنگی کارتە ڕەشەکانی قومار
نەخشەی يارییەکانم تێکدا و نهێنییە نەبینراوەکانم درکاند
پەلاماری دۆزەخی ئەو خەیاڵانەمدا، کە شاعیرانی پێش منی سووتاندبوو
سەرمەست، بە برینی تەورێکی شەراباوی
سەرمەست، بە شنەبایەکی خوێناوی
تابووتەکەم لە ناوەڕاستی زەمهەریردا بەجێهێشت و
دیسان ڕوومکردەوە ژیان
ڕوومکردەوە سیحری بارینی ئەو تەرزانەی بە بینینیان
وشە جەهەنەمییەکانی ڕۆحم هاتنەزمان
من لە غەیری گڕ و کلپەی حەرفەکانیان، لە مانای هیچ شتێک نەگەیشتم
عەوداڵ لە دوای دوکەڵی ئەو زمانە نەبیسراوە
وەک شێت بە دەریا و جەنگەڵەکاندا ڕۆیشتم
وەک شێت تونێلە پڕ لە شوعلەکان، ئامێزیان بۆ کردمەوە
لەبەردەم ئەو دوورگەیەدا، کە بۆی تلیاک لە سینەی دەهاتەدەرێ
هاوارمکرد: ئەی دوورگەی نەشئە و خەیاڵ سەمایەکی تازەم بەرێ
سەمایەک دەمارەکانم پڕکات لە لەنجەی بومەلەرزەیەکی ڕەش
کە ئاسمانی دڵم پڕکات لە تەرزەی وەکو پشکۆ گەش
بەدەم ئەو ئاوازانەوە، لەسەر پردەکانی خەیاڵ بمرم

**بمرم و هەتا هەتایە**
**بە پەنجە خنکاوەکانم، شیعر وەکو شمشاڵ بگرم**
**بە باوێشکە ئەفیونییەکەی، بەو دەستەسڕە سپییەی بە بوغردی خەیاڵ ڕەش بوو**
**ڕۆحمی خستە ناو دەستی و دۆعای پڕ لە کوفری بەسەردا خوێند**
**قەترانی ورد ورد وەک خەونی لە دڵما چاند**
**گوناهی کردە قەدەرم و تاوانی بەسەرما ڕوخاند**
**گووتی: ئەی ئەو پیاوە ناڕەزاییەی منداڵی قەدەرتە تا مردن**
**بڕۆ و دەرگای دڵت بخە سەر پشت**
**لێگەڕێ، چ ئازارێک ڕەشە و چ ژەهرێک کوشندەیە**
**لەگەڵ گڤە ڕەشەکانیدا، ڕۆحت ببات**
**چ تەلیسمێک سیحراوییە و چ ئەفسوسێکیش ئەمرە**
**لەگەڵ شەپۆلە دڵڕەقەکانیدا... قوتتبدات**
**لێگەڕێ، بە چ عەشقێک سەرمەستیت و بەچی ئەشئەی مەرگ دەگریت**
**با دڵت بکەن بە یەخسیر**
**چ خەیاڵێک ئێجگار بەدە، مەترسەلێی**
**با هەمیشە بای ترسێکی هەتاهەتایی لە مردن**
**زەنگی ڕۆحت بێنێ و ببات**
**با ئەفرینی ڕەشی شیعر ببێت بە پاداشت و سزات**

## ٤

**گوناهمکرد**
**بەو تەباشیرەی لە چنگی چکۆلە و مردووی**
**قوتابییە ترساوەکانی پێش خۆم، دەرمهێنا**
**چ پرسیارێک، ئاسمان نەیدەتوانی حەلیبکات... حەلمکردو**
**چ مەتەڵێک زۆر قورس بوو، هەڵمهێنا**
**وەک هەر لانەوازێکی دڵڕەق و بە ئازادیی گومڕا**
**ئاژاوەم خستە ناو وشەکان و ڕستەکانم لەناو یەکترا بەشەڕدا**
**لە شەوێکی ڕیسواییدا،**
**قسەم بۆ هاوڕێکانم کرد و دەمم پڕ بوو لە وشەی تەڕ**
**کچە بەستەزمانەکانم ماچکردو**
**ڕۆحم پڕ بوو لە گوناه و خراپە و شەڕ**
**لەو شەوی مردنەدا**
**بەسەر سێدارەکاندا گەڕام و نیگای کچە خنکاوەکان دڵیانگەستم**
**ملوانکەی گەوهەرم دزی و بازنە زێڕینەکانی ئەوانم کردەدەستم**
**ئەو کچە ڕاگوزەرانەی کە زووتر لە بەفر مردن**
**ئەو کچانەی منیان بە منداڵ دەزانی و بۆ بەهەشتی خۆشەویستیان نەبردم**
**وەک هەر ئامۆیەکی تەنها، لەباغە تاریکەکانی ئەودیو دۆزەخەوە**
**جۆلانێم بۆ خۆم هەڵخست و لە تاریکیدا لێینوستم**
**بەڵکو دونیای بەتامی خەو، چرایەکم لێهەڵبکا و**

دەستی عاشقێکی بەڕەحم بێنێ و بینێتە ناو دەستم
بەڵام ئەفسوس هیچ یەکێک لەو ئاهەنگە جیانەبووەوە و
ڕوویکاتە ئەم دارستانە تەنهایە
ئەم دارستانە خەمگینەی، دڵێکی ڕاوکەری پیری وەکو دڵی منی تیایە
بۆیە بۆ هەتاهەتایە
خۆم ڕاژەنی، تاپیربووم و وەکو پەتێ جۆلانێکەم ڕزام
دواجار، بەدەم سیحری خەویکەوە تێگەیشتم
کە ئەوە چارەنوسمە و ئەوەشە پاداشت و سزام.

## ٥

گوناهمکرد... خۆری تازە لەژێر پێستەکەمدا هەڵهات
سیحری تازە فێربووم و گرێی فێڵی گەلێ نهێنیم شکاند
وەرزێک هاتە ڕێگام، کە هەرگیز نەتانبینیوە
حەرفی ئەوتۆ زمانی سووتاندم، بە گەروی هیچ کەسێکدا تێنەپەڕیوە
بەخاکی ئەوتۆدا تێپەڕیم، کە خەیاڵ ناوێرێ ڕوویتێکات
پیاڵەی ئەوتۆ ژەهراویم چەشت
ئەهریمەن نەیوێراوە تەنیا زمانێکی لێخات
بۆنی ئەوتۆ ئاگرین چوو بە دڵما، کە ناشێت دۆزەخ دیبێتی
عەشقی ئەوتۆم لەسەر دڵم نوسی
کە ناشێت کەس بەر لەمن نوسیبێتی
تاریکی ئەوتۆم دۆزییەوە، کە چاو زەفەر بەبینینی نابات
ئازاری ئەوتۆم چەشت، کە کەس هەست بە بوونی ناکات
گەنجینەی ئەفسوناوی خەوم، لەژێر دڵما هێنایەدەر

**بێباک لەئەشکەنجە و سزا، ڕێگای خەتەرم گرتەبەر**

**گوناهمکرد... بۆ ئەوەی پاکێتی خۆم بەمە دەم (با)**
**بەڵکو تاوان و جوانییەکەی بەرەو بەحری حەقیقەتی خوێم ببا**
**گوناهمکرد، پاسەوانی پیری دۆزەخێکی نەدۆزراوە**
**سەرمەست بە بۆنی دوکەڵی ڕەشی ملیۆنێکساڵ**
**دەرگای دۆزەخە گەورەکەی لێداخستم و بردمی**
**بەرەو دۆزەخێکی کوشندە و تاڵ**
**دۆزەخێک کە لە مێژە لێیدەترسم**
**دۆزەخی بێتخوب و بێڕەنگ و بێڕەحمی خەیاڵ**
**سووتام، لە دڵڕەقی ساتەکانیدا، سووتام...**
**وای کە خۆڵەمێشێکی ڕەشم**
**ئێستاکە خۆشم تێناگەم...**
**چیدەڵێن گەر بێنە زمان، گوناهەکانی ناو لەشم**
**بینیم، چی لە ڕۆحی شەپۆلدایە، کاتێک کە دەمانخنێکی**
**چی لە دڵی یەزدان دایە، کاتێک بە فێڵ و تەڵەکەی خوایانە دەماندوێنێ**
**لکەی سەر ڕۆحی پەیامبەرەکانم بینی**
**سۆزی نیگای ئەهریمەنە نەفرەت لێکراوەکان**
**چۆن گوێم لە خوا گرت، ئاواش گوێم لە بتەکان گرت**
**چۆن گوێم لە ئایینەکان گرت، ئاواش گوێم لە کوفری بێبڕواکان گرت**
**دڵی خۆم لە نێوان هەموو شتەکاندا کردە حەکەم**
**نە ڕووم لە خوا کرد نە لە شەیتان**
**نە باوەڕم بە بتەکان هێنا و نە بە یەزدان**
**بەزەردەخەنەی منداڵێکی مەکربازەوە وەستام و گووتم:**
**ئازاد لە ڕەوشت و لە بڕوا و لە عەشقتان**

**نە لە سزاتان بێزارم، نە پاداشتم لێتان دەوێت**
**ڕۆحم ڕێبوارێکی ماندووە... لێگەڕێن، تاکو دەتوانێت**
**تاوەکو بەزمی ئەم یارییە ئەمرەتان تەواو دەبێت**

**بابخەوێت**

## ٦

**گوناهمکرد، پاداشتەکەی ماچی لێوە ژەهراوییەکەی تۆ بوو**
**گوناهمکرد، ئەستێرەکان شایەتبوون و دۆزەخ بوو بە ناونیشانم**
**دارستان و با و هەورەکان، پێم پێکەنین**
**کە زانیان بە نهێنی سیحرێکی گەورە دەزانم**
**پرشنگی خوا پەڕیوەتە سەر ڕۆحم و قەترەیەک ڕەحمی ئەهریمەن وەکو کچ بۆتە مێوانم/ کە زانیان بە نوری چ خۆشەویستییەک، لەو ڕێگا تاریکانەدا دیسان بە شەوارەکەوتووم/ کە زانیان دوای شەوقی چ گومڕاییەک و دوای غەمزەی چ فێڵێک کەوتووم**
**گوناهمکرد هەوای موگناتیسێکی ڕووناک، بەرەو زەوییەک گێژیدام**
**زەوییەک شێتانە ماچمکرد و وەکو (بت) لەبەردەمیا وەستام**
**درەختەکان چەتریان لە سەر سەرم هەڵکرد**
**باڵندە تەنهاکانیش دەستەسڕی فرمێسکیان لە پەڕی خۆیان بۆهێنام**
**هەورەکان، قەترەیەکیان کردە چاوم، قەترەیەک خەیاڵی نوێی کردە نیگام**
**کە گەردەلوولێکی خەیاڵاوی هێناو من وەک باڵدارێکی ئارام ماوەیەک لە ئامێزیا ژیام**
**بەڵام وای چەندە کورت بوو، ئەو بەهەشتەی گوناه بە ڕۆحمی ناساند**

چەنـدە بێهـودە و غەمگیـن بـوو، ئـەو عەشـقە تەلیسـماوییەی دڵمـی لەنـاو چنگیـا تـاسـاند
نـا، سـوار ئەسـتێرەیەکی کـردم، مەسـتانە، بەنـاو ئاسـمانێکی عەتراویـدا، تێدەپـەڕی
سوار هەورێکی کردم، دڵۆپەکانی شێتانە لە سەمایەکی تازەدا هەڵدەپەڕین
پەیکەرەکانی جوانی لەویادا، بوونە گیانلەبەری ڕاستی
مەمکە بەردینەکان گۆڕدرا و عاقڵی کچانەیان بوو بە مەستی
حورمەت بوو بە درۆیەکی کۆن و شەرەف بوو بە ئەفسانە
لەسەر خوانی مەیی و بەدەم لیکی عارەقەوە
بە ڕووتی سوژدەمان برد و هاوارمانکرد:
وای گوناه چ تەلیسمێکی گەورە و چ یاخیبوونێکی جوانە
خۆمان لە درەختەکان هەڵسوو، لەزەتمان کرد بە خێزان
کچەکان مەمکیان بە باران شت و
ئێمەش گیانمان بە گەڵارێزان
بەڵام وای چەندە کورتبوو، عومری یاخیبوونی ئەوان
بە تەفرەی تەفرەبازێکی عاقڵ
بە نەخشەی نەخشەسازێکی هوشیار
وەرگەڕان لەم ئاینە و چوونەوە سەر سونەتی جاران
تەنها من بووم... سەرمێزی ئەو خەونە پڕ لە گوناهەم بەرنەدا
تەنها من... زاری هیچ قومارێک نەما لەناو دەستمدا بانەدا
تەنها من... خەونە پاکەکانی خۆم توڕدا بەرەو دەریا
کاتێک لەژێر باری سەنگینی ئەودا، کەوتمە سەرچۆک
دەنگی فریوێکی گەورە بەنازکی چپانی بەڕۆح و دڵما
وەرە ئەی منداڵی بێباک، ئەم خوانە جێبهێڵە و بگەڕێرەوە لەگەڵما
منیش بەچپەی فێڵبازێک... بەڵام ڕوخاو

بەچپەی یارییەک... بەڵام دۆڕاو...
ووتم: هەتا ئەمرم، بۆ گوناهە
بۆ دەرباری ڕەشی ئەوە سۆز و نزام
گەر مردیشم، با بڕۆم و ئەوەبێت پاداشت و سزام

## ٧

گوناهمکرد، مەرجان لە ڕوحما گەورەبوو، ژێرزمانم پڕ بوو لە مرواری،
لە سیما کزەی دۆزەخە دوورەکان هەڵیکرد و لە دڵما تابووت دەباری
کاتێک ئیفلیجی دڵدارییە ناکامەکان، دەم و زمانی بەستم
بێهودە، بە هەوا و خەونا تێپەڕیم
دەتووت ڕاوچییەکی مەستم
تێپەڕیم و گەرووم وەک شمشاڵ دەگریا
ژیانێکی بێهودە بوو، نە سەرکەووتم، نە ڕیسوا بووم لەبەردەمیا
ئاوی لێشاوە ڕەشەکان، لەگەڵ دارستانەکاندا ژەهریاندامێ و هەڵیانگرتم
وەک باڵندەیەکی بێزمان،
لێم ئەپرسی: ئەی لێشاوی قەترانی و شووم، بۆ کوێت بردم؟
لێم ئەپرسی: هاڵاوی چ گوناهێکە، زەوی پڕبووە لە لاشە؟
لێم ئەپرسی: بادەی چ گەردەلوولێک، بۆ ئازارەکانی من باشە؟
لێم ئەپرسی: بە ئەفیونی چ وشەیەک ڕزگاردەبم؟
بەچ ئازارێکی گەورە، لەم ئەشکەنجە ژەهراوییە، بێزار دەبم؟
لێم ئەپرسی:
دەرسی چ خۆشەویستییەک، دەرگام لێدەخاتە سەر پشت؟
بەوانەی چ پاکێتییەک، دەبم بە زێوانی سروشت؟

ئەو لێشاوە پیرۆزە، لە کوچەی شەوەزەنگێکدا، وەستا
هێند پیرۆزبوو کە خوا و ئەهریمەنیش، هەردووک لەبەری هەڵدەستان
قەتماغەی ئەو شەوەزەنگەی کردەوە و لایدا لە بەرچاوم
چی ببینم؟ کە هەوەرێک بووم، لە گەردەلوولا وەستابووم
لە ساتێکدا، بێبەشبووم لە تەلیسم و لە خەیاڵی وەحشییانە
ڕۆحم پڕبوو، لە شیعر و لە بارانی بەهەشتییانە
لە ساتێکدا، ورشەی تاڤگە و کراسی نوێی وەک گزنگم دی لەبەرما
چرای تازە لە دەمارەکانمدا داگیرسا و
گوڵاوی فریشتەکان چوون بە سەرما
لە ساتێکدا
سینەم پڕبوو لە شەیدایی باڵندەیەک، کە بەرەو بەهەشت بفڕێ
دەستم پڕبوو لە شەونمی ئەفیوناوی خەیاڵی نوێ
هەرچی ناکامیم هەیە، لە ساتێکدا بوو بوو بە (با)
منی غافل وامدەزانی ئا بەو ساتە بوومەتە خوا
بەڵام دواجار ئەو لێشاوە ترسناکە بەرەو لای دۆزەخێکی بردم
کە سەیرەلام چۆن نیگامکرد و نەمردم
دۆزەخێک بە ڕەشی نیگا و ڕەنگ و ڕووی بڵێسەکەیا
وەها دیاربوو، دەریایەک ڕۆح، دەگری لە گڕی سینەیا
دۆزەخێکی پیر و چەماوە و ئاگرین
کە هەزاران باڵندەی ڕەش، لە گلێنەیا هەڵدەفڕین
دۆزەخێک کەچی دیکە، پرشنگی نەهێشت لە چنگما
ئاورنگی لەسەر دڵ هەڵگرتوو، پشکۆی ئازاری ئەبەدی
وەک ئەفرەت چزان بە سنگما
کامەرانیم تامردن لە سینەیا بوو بەهەڵم
دۆزەخێک، مەتەڵی مەرگی نوسییەوە لەسەر دڵم

پێکێکی دامێ، پڕبوو لە ئازاری خەیاڵاوی
پێیگووتم: ئەی منداڵی بێباک، بۆ ئەم یارییە ڕەشە نەخوڵقاوی
وەرە یان ببە بە کۆیلەی خوا، یاخود شەیتان
ببە بە غوڵامی ئەهریمەن، یان بە بادەگێڕی یەزدان
با ڕزگار بێت لەو لێشاوە ترسناکەی فریویدایت
تۆ کە گاڵتەچی ئاویت و پاسەوانی بەر قاپی )با(یت
وتم: هەرگیزا و هەرگیز ئەی شەپۆل، من بە ئازادی خۆم گومڕام
تا دەمرم لە شەرابی خەستی شیعر دەخۆمەوە و
گەر مردیشم: با بڕۆم ، ئەوەبێت پاداشت و سزام

## ٨

گوناهمکرد و لە هەموو نووشستییە گەورەکاندا تێگەیشتم
کە ژیان مەتەڵێک بوو، بە ئاسانی هەڵمهێنا
یارییەک بوو، زۆر بەئاسانی بردمەوە
لە نەشئەی سەرکەوتنی خۆمدا، کلیلێکم لە دەستی خەیاڵ فڕاند
دەرگای هەموو تاریکییەکانی لێکردمەوە
وەک ئەمیرێکی یاخی هاتم و چی لەسەر مێزەکان بوو کۆمکردەوە
وەک داگیرکەرێک هاتم و لە شەقامە زەمهەریرییەکانی ڕۆحدا
چیم بەدڵ بوو گووتم: بۆ من
وەک ژنێکی دەوڵەمەند، چ وشەیەکم حەزلێکرد، کردمە بەرم
وەک گیرفان بڕێکی ئەمر
کڵاوی چ شیعرێک لار و پڕ لە جورئەت و تەفرەبوو کردمە سەرم
وەک میوانێکی ناوەخت کە هاتبێت

ئاهەنگێکی شاهانە بشێوێنێ و کەس پێشوازی لێنەکات
ئەمیرێک بووم (با) لە دوامەوە هاتبوو
مۆمێک بووم خۆر لە پشتمەوە دەسووتا
هاتبووم بۆ یارییەکی تازە، کە یاسا و نهێنییەکانی لە ڕۆحمابوو
یارییەکی کوشندەبوو، کە بەرلە من گیانی هەزاران نەفامی تیاخنکابوو
نە کتێبێکی ئاسمانیم پێبوو، نە هیچ تیۆرییەکی تازە
بەڵام نیگای نوێ و دڵی نوێم بۆ هێنان و گۆرانی ئەوتۆم بۆ گووتن:
کە بەر لە من نەبیسترابوو
هاتم، لەسەر خوانە ڕازاوەکەی ژیان
وەکو ئێوە پێکێکی شیرین فرکەم
هاتم، دڵم لە عەشق، نیگام لە ڕووتی، دەستم لە تەڵا پڕکەم
بەڵام هێندەی پوچی و ناسانی ئەو یارییەم کەوتە بەرچاو
تفم لێکرد، تفێکی ڕەشی وەک زوخاو
هێندەی دەستم لەو لەزەتە بێهودانەدا، گەڕامەوە
چەند بە زێڕ و جوانی و فێڵ فریوتاندام
بۆ هیچ تەفرەیەک ملکەچنەبووم و بۆ پەیامی هیچ لەزەتێک نەمامەوە
بە تەنیا لەو قومارخانە گەورەیەدا، مێزەکەی خۆم جیاکردەوە
هەر خۆم بە خۆمم دۆڕان و هەر خۆم لە خۆمم بردەوە
نە توانیم کەس فێربکەم و نە کەس توانی فێرمبکات

تەنها و هەمیشە تەنها، دەنگێکی خەیاڵاوی گووتی:
بڕۆ ئەی منداڵی بێباک
ئەوە بێت پاداشت و سزات
ئەوە بێت پاداشت و سزات

١٩٨٧

# ١

ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانە/ ناوەکان پڕبوون لە دەستی ژەهراوی و تیکەکان پڕ بوون لە گومان و خوێن/ پەنجەرەکان پڕ بوون لە باڵداری خەوتوو و شەونمی بەردین/ سوارچاکەکان لە دۆڵەکاندا خەوتبوون و پەڕەی یادداشتەکانیان، وەک ڕەفتەی بوکێکی کوژراو، بەجێمابوو/ هەور وەکو پاسارییە کوژراوەکان کەوتبووە سەرزەوی/ (با) وەکو ئەسپە پیرەکان لە کوچەکاندا دەشەلی/ تامی باران، تامی بادەمە پڕ لە خوێنەکان بوو/ (تێزاب) شەرابی ئەم خەڵوەتی هەتاوە بوو/ لەودیو دوکەڵە شینەکانەوە گریام و چاوم وەک لێوی کچە شەرمنەکان لێکنا.

خەوتم و خەوم بە ناوچەوانێکەوە بینی لە پۆلا کە گوللە نەتوانێت بیبڕێت/ خەوم بە دەستێکەوە بینی لە مس کە بەفر نەتوانێت بیتەزێنێ/ شەپۆلێکی زەردیش... وەک خوێنێکی ڕژاو لە پایز دا بە سەر دەستمدا دەڕۆیشت/ بایەکی ساردیش، وەک ماچی دەستگیرانە بێوەفاکان... وەک ماچی برادەرە دوژمنەکان، لە ڕووم نزیکدەبووەوە/ پیاوکوژەکان... پیاوکوژە برسییەکانی بەهار، لەودیو شکۆفەی درەختەکانەوە دەگەڕان/ سەیری ناوچاوانیان دەکردی و دەیانکوشتی/ سەیری بەری دەستیان دەکردی و دەیانکوشتی/ ترس وەکو ددانە ئاڵتونییەکان لە دڵما دەبریسکایەوە/ غونچەیەک بووم، نیوەم لە خوێندا و نیوەم لە بەر (با)/ خەم وەک گەنجینەیەک لە زیو... وەک نەیزەکێکی وێڵ لە گوژمی خوێنەکەمدا، دەبریسکایەوە/ کاتێک بەرپێم، وەکو بنکی چراکان... پڕ بوو لە مانگ و پەپوولەی کوژراو/ گەڵای زەردی وەرزە کۆنەکان، بە قژمەوە بوو/ سۆزی

دێرینەشم بۆ کامەرانی و ئازادی لە چاومدا بوو/ منداڵی بە دوومدا دەهات/ ئەو منداڵییە قژزەردەی کە هێشتا لە بەر جۆگەکاندا، بۆ ماسییەک دەگەڕا، ئاوزگی پڕ بێت لە زێڕ/ لە سەر سیلەی دیوارەکانەوە، سەیری تۆزی پێی ڕێبوار و عاشقان و پیاوکوژانی دەکرد/ پرچە زەردەکانیشی وەک دوو دەسک نێرگز هاتبوونە خوار/ لەو ڕۆژگارانەدا بوو/ چۆن جەردە دوای قافڵە شەکەتەکان دەکەوێت/ بە دوی ئەو باڵندانە کەوتم کە بە دەم خەوەوە دەفڕین/ چۆن (با) دوای کەشتییە ماندووەکان دەکەوێت/ دوای ئەو کچە قژزەردانە کەوتم کە لە جۆلانێکاندا دەخەوتن/ بەڵام درێغا... درێغ، تەنها کراسە ئاوریشمینەکانیانم بینییەوە لە ڕاڕەوەکاندا کەوتبوون/ مەمکیان، وەکو تۆپێکی سارد، لە چنگە بێڕەحمەکانی ئەواندا دەژاکا/ هەر وەکو گوڵی قرمزی، پاکیزی ئەوانیان ژاکاند/ منیش بە ناوچاوانێکەوە، کە بە پوولەکە و گوڵی بەدبەخت داپۆشیبوو سەیری ئەو تاوانانەم دەکرد، کە وەک تابووت ڕیزکرابوون/ سەیری ئەو ئاسمانانەم دەکرد، کە وەک قاسە داخرابوون/ وەک پڵنگێکی برسی دەمڕوانی/ وەک هەڵۆیەک لە لم و کۆترێک لە هەور، نەمدەتوانی بفڕم/ وەکو شمشێرێکی تەختە زرینگەم نەبوو/ چاوێک نەبوو لە درزی دەرگاکانەوە سەیرمبکات/ گەروویەک نەبوو، لە باڵەخانە دوورەکانەوە بانگمبکات/ وەک قەرەجە بێباکەکان، ڕۆیشتم و دەستم لە دیواری قەیفەی کۆشکە شینەکاندا/ بە دەم سرودی پڕ درۆو گۆرانی بێماناوە... جەنگەڵ و شارەکانم تەیکرد/ چۆن هێشوویەک تری، لە سەر کەپرەکان دەخەوێت/ لە سەر ئەو شیشانە خەوتم، کە بۆ عیشوەی تەلارە بەرزەکانیان دەبەست/ گوێمنەدایە هەیبەتی خەم، کە وەک دوپشک بە سەر سنگمدا دەگەڕا/ وەک گێژەڵۆکەیەک لە گەڵا ئابڵوقەیدام/ وەک جۆگەیەک بە چوار دەورمدا خولایەوە/ پێکەنین وەک تۆز لە لێوم بەرز دەبووەوە، وەک ئاو دەڕژا بەسەر سنگمدا/ وەک سۆزانییەک لە بەهارا بەختیار بووم/ وەک دارستانی پڕ لە باڵندەی

**تێر/ وەک ئاوی ئەو دەریاچانەی پڕە لە ماسی عاشق، خەمم نەبوو/ مۆمم لە سەر شانم هەڵکردبوو، بە شەقامە دوور و درێژەکاندا دەڕۆیشتم/ نە نافرەت سەیریدەکردم نە باڵندە/ لە کۆشک و باغچە و ژێر نوری چرا ڕەنگینەکان دەرکرابووم/ دەڕۆیشتم و ڕیشۆڵە برسییەکانی دەنووکیان لە ناو چاوانم دەدا/ کۆشم پڕبوو لە کەروێشکی خەوتوو/ بە سەر لاشەی لەشکرە بەزیوەکاندا چەمیمەوە و خوێن لە دڵم هاتەخوارێ/ لە هەر چوار دەوریشمەوە خۆرئاوا دەبوو، خاکیش لە ژێر پێمەوە خۆی ڕاپسکاند/ مەرگ لە بری خۆشەویستی بۆم پێکەنی/ بە لای کێڵگە و باڵندە تورەکاندا ڕۆیشتم و سڵاوم نەکرد/ بەلای ماسییە پیرەکاندا ڕەتبووم و سڵاوم نەکرد/ ڕۆژگارێک بوو/ درەختەکانیش تووشی گولی بوو بوون، باڵندەکان سووزەنەکیان گرتبوو/ لە بەر مێش کۆشکەکان نەدەبینرا و هاوڕێ دەموچاوی هاوڕێی نەدەناسییەوە/ مێروولە بە سەر گەردنی دەستگیران و مەچەکی باڵندەکاندا سەردەکەوت/ وشە لە سەر دەفتەرەکانم پلیشابووەوە/ خوێنی باڵندە چاوزێڕینەکان بە ڕوومەتمدا دەهاتەخوار/ ڕۆیشتم و لە کێڵگەکانی بەر تریفەدا، لە ژێر گەڵایەک توتنی گەورەدا خەوتم/ خەوتم و پێنووسێکی شەرمن و سەرمابردوو لە گیرفانەکانمدا دەگریا و دەچەقییە سەر دڵم/ دەچەقییە ئەو جێگا وێرانەیەی، نە قافڵەکان ڕێگا دەزانن، نە دیار/ دەچەقییە ئەو جێگا ساردەی/ گڕی ئاگرە بڵندەکان بەستوێتی و کلپە چلورەی پیا هاتۆتە خوار**

# ٢

ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانە/ درەختە ورشەدارەکانم بەجێهێشت و باڵندەکان لە پێش چاوم دەسووتان/ چۆن ئەژدیها لە درەختەکانەوە دەئاڵێن، خۆشەویستی لە قەدمەوە ئالابوو/ بانگم لەو پەپوولانە کرد، کە بە ناو ئاوەکاندا دەفڕین، بانگم لەو مردووانە دەکرد، لە ناو تابووتە سەوزەکاندا خەوتبوون/ ئەو پاساریانەم دوان، کە لە گومەزەکاندا هێلانەیانکردبوو... بەڵام کەس گوێی بۆ نەگرتم/ نەمتوانی گوللە کوشندە و ژەهراوییەکان پەشیمانبکەمەوە/ چڵی درەختەکانم ڕاوەشاند، چڵی درەختە مسەکان/ ویستم، خەنجەرە تورە و خوێناوییەکان هێمنبکەمەوە/ ئەو باڵدارانە ئارامبکەمەوە، کە لە برساندا دەگریان... بەڵام نەمتوانی/ هاوارم لەو پەنجەرانە کرد، کە کچە هەرزەکارە بێباوکەکان، مەمکیان نابوو بە شوشە ڕەشەکانیانەوە/ ئەو پەنجەرانەی بۆنی چەوری و مەرگ و خەونی لێوەدەهات/ بەڵام ئەوان لە ژوورە سارد و بێڕەحمەکانی خۆیاندا نەیانبیست/ هاوارم لەوانە کرد، لە بەر دەرگای خانۆچکە چکۆلەکان و لە ژێر چەتری پاسەکاندا، چاوەڕوانیاندەکرد/ چاوەڕوانی مەسیح نا، چاوەڕوانی تەرمی منداڵەکانیان/ چاوەڕوانی دەستگیران نا، چاوەڕوانی نامەی لێکجودایی/ چاوەڕوانی گوڵ نا، چاوەڕوانی سەبەتە سێوی خوێنین/ هاوارم لەو گوڵانە کرد، کە لە سەرمێزەکان توڕدرابوون و مەیخۆرە پیرەکان، دەیانگرتە یەکتری/ لە سەر کورسی باغچەکان بەجێمابوون و سۆزانییەکان لە سەری دادەنیشتن/ ئیدی بەسە با بڕۆن و ئەم زەوییە بەجێبهێڵن/ بانگم لەو عاشقانە کرد، کە لە نزیک جۆگەلەکانەوە دەگریان و لە گۆڕەکانیانەوە سەیری چراخانی شاریان دەکرد/ بڕۆن و

**نەگەڕێنەوە... بەڵام هەیهات... گوێیان لێنەگرتم/ بۆیە لە چاوەڕوانی بەلەمە سەر مەستەکاندا وەستام/ تا ئەم زۆنگاوە ڕۆژهەڵاتییانە بەجێبهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ دارستان/ بۆ ئەو جێگایەی نە ڕق دەناسرێتەوە و نە پێکەنین/ نە خۆشەویستی مانای هەیە، نە گریان/ ئەوەی هەیە و نییە، بێدەنگی کوشندەی دارستانەکانە... بێدەنگی کوشندەی دارستانەکان.**

# ٣

**ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانە... گووتم ماڵاوا ئەی هەڵۆ چاوشینەکان/ خواحافیز ئەی ئەو شارە خەمگینانەی لالەزار لە دیوارەکانتان ڕواوە/ ماڵاوا، ئەی پاسارییە خنکاوەکان/ ئەی ئەو شۆستانەی چۆن جێ سەر لە سەر بالیفە نەرمەکان جێدەمێنێت/ جێپێم، لە سەر بەردەکانت بەجێماوە/ دەڕۆم و بۆنی من لە گوڵەکانت دێت/ ڕەنگم لە سەر ناوێنەکانت، بەجێماوە/ دەڕۆم و ئەو کیژە خەمگینانەی، بە ئەسپە ماندووەکانیانەوە، بۆ دەستگیرانەکانیان دەگەڕێن... نامناسنەوە/ بە تەوێڵێکی مارۆوە، قژم دەهێنمە سەر ناوچاوانم و دەڕۆم/ تورەکەیەک تێشووی ژەهراوی دەدەم بە سەر شانمدا و دەڕۆم/ سەر بەرز ناکەمەوە... با شوشەی ئەو پەنجەرانە نەبینم، کە سێبەری ئافرەتە شۆخ و شەنگەکانی لێوەدیارە/ نامەوێت قەفەزی ئەو کەنارییە بچوکانە ببینم/ نامەوێت ئەو گوڵە نامۆیانە ببینم، کە وەک زەنگە هاروهاجەکان، لە گوڵدانەکانیاندا دێن و دەچن/ گووتم: سەیری ئەو مردوانە ناکەم، کە لە کەنار شۆستەکاندا، بەجێماون و لە سەر سنگیان نوسراوە بۆ دۆزەخ/ سەیری ئەو دارستانە کانزاییانە ناکەم، کە دڵدارانی مسین لە ژێریا یەکتر ماچدەکەن/ سەیری**

**ئەو پیاوانە ناکەم، بە چاوی جورئەت و خیانەتەوە/ شولکە زەردەکان ڕادەوەشێنن و یاری بە کڵاوەکانیان دەکەن/ من تەنیا ماڵاوایی دەزانم... ماڵاوا... ماڵاوا/ ئەی ئەو کیژانەی لە پاسەکاندا دەگریان و نیگا پڕ لە سۆزەکانی من ژێرینەکردنەوە/ ماڵاوا، ئەی ئەو پیاوانەی، سەیری نیگا زێرینەکانی منتان نەکرد/ کە مەرگی لە ناوچاوانتاندا دەخوێندەوە/ ئەفسوس... ئەفسوس، بۆ ئێوە ئەی ئەو کیژانەی سەرگەرمی هەڵکردنی چەترەکانتان بوون و سەیری ددانە ئاڵتونییەکانی منتان نەکرد، لە بارانە وەحشییەکان جیرڕدەبووەوە/ نەتانبینی، لە گورگە پیرەکان دەچم/ سەیری شقارتە داگیرساوەکان دەکەم و هەست بە ئازاری دارستانەکان دەکەم/ بە بۆن کچە پاک و بێگەردەکانی دارستان و هەورە ڕاستەقینەکانی دەریا دەناسمەوە/ بەڵام ئەفسوس... ئەفسوس، ڕانەوەستام و گووتم ماڵاوا/ ماڵاوا من سەرقافڵەچییەکی بەدم/ دەستەسرەکەم خستۆتە دەممەوە و چاوەڕوانم نێزەیەک بکەن بە جگەرمدا/ چاوەڕوانم... ددانە زێرینەکانم دەربهێنن یان لوولەیەک داینەمێت بنێنە گەرووەمەوە و بمکوژن/ پاڕامەوە و گووتم وەکو ماسییەکان مەمکوژن/ وەکو کۆتر و کچە بێنابڕووەکان مەمکوژن/ دڵم پڕبوو لە شەرم و ئەفسوس/ شەرم لە خوا و لە پاساری و لە نێرگس/ ئە فسوس لە کیژان و هاوەڵان و ساڵەکان/ گووتم، وەکو کەروێشکە برینداره‌کان مەمکوژن/ وەکو قارچکە سپییەکان مەمخۆن/ هەموو شتێکتان پێدەڵێم، لە ڕۆژگارێکدا من ڕووتبووم/ هەتا گەداکانیش، پاڵتۆی فەرویان لە بەرا بوو/ دەستم وەکو پێستی درەختەکان توێژی هەڵدەدا/ ڕومەتم بە هەتاوی ژەهراوی سووتا بوو/ پادشاکانی بەدبەختی دەیانبینیم و دەیانگووت ئەو لێوە زیوینە ناکامانەت لە کوێ بوو؟/ ئەو برژانگە زەردانەی ناموراديت بەچی هێنا؟/ منیش، ئەفسوس، حەزم لە ژیان دەکرد/ کیژۆڵە ئاوریشمینەکانم دەبینی و وەڕز بووم/ ئەو پیاوانەم دەبینی لە بۆرەک دروستکرابوون و پەشیمان بووم/ بیری کەنار جۆگەلە**

ڕەشەکانم دەکرد، تا لە ڕۆخە تەنها و زەردەکانیدا بێم و بچم/ دەمویست وەکو ئەو سەربازە عاشقانەی، پەپوولە ناهێڵێت بخەوێت/ لە نزیک تەبارە خوێناوییەکانەوە، ڕابکێشم و ڕیشم لەسەر سنگم بخشێت/ ڕیشێک پڕی بێت لە هەتاوی بەجێماو/ لە تۆزی تەختەسڕەکانی قوتابخانە، لە ماچی کوشندەی کچە خەمگینەکان/ سنگم هێشتا جێگازەکانی منداڵی دایکمی تیا بێت/ پڕبێت لە ختوکەی ڕۆژگارە دێرینەکان/ پڕبێت لە ترسی بێئەندازە لە باڵەخانەی بەرز و لە خۆشەویستی گەورە بۆ کۆتر و قومرییە باڵڕەشەکان/ پڕبێت لە ترسی گەورە لە تەنهایی، لە حەزی گەورە لە تەنهایی/ لە گریانی کوشندە و بەکوڵ، لە پێکەنینی ئەهریمەنانە و فێڵاوی.

٤

ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانەی... زەنگیانە بە چەترەکانمانەوە بوو/ خۆرە ترسنۆکەکان نە دەسووتان و مانگە شەرمنەکان هەڵنەدەهاتن/ لە ئەستێرەکان پاڕامەوە نەمرن/ لە ئاوە زیوینەکان و هەورە دڕکاوییەکان پاڕامەوە نەبارن/ لەو گومەزە تاریکانەدا، چرای خەیاڵی دەسووتا/ شکۆی جەردەکان لە دڵمدا بوو/ چەندجار شەونخونیم بە دیار هەورە نەخۆشەکانەوە کێشا/ من ئێشکچی قافڵە بەدەکان بووم/ ئێشکچی ئەو جەردانە بووم، بە قامچییەکانی دەستیانەوە، لە سەر ئەسپەکان خەوتبوون/ ئێشکچی ئەو ڕاوچییە دڕانە بووم/ چۆن پاسەوانەکان چرا دەگرن بە دەستەوە/ قەفەسە خوێناوییەکانیان گرتبوو بە دەستیانەوە/ بەو دارستانانەدا ڕۆیشتم و هەورەبروسکە درەختەکانی زامداردەکرد/ بەڵام گەڵا بچکۆڵەکان نە دەترسان و ڕەگە پیرەکان بیریاننەدەکردەوە/ «نیگام

**پڕبوو لە شاری نەدۆزراوە» / پڕبوو لەو پیاوانەی بە فیکە قسە لەگەڵ درەخت و با کێویەکاندا دەکەن/ پڕبوو لەو لمە زەردانەی، لە کەناریا زێڕیان دەدۆزیەوە/ بە ناو دارستانەکاندا ڕۆیشتم و ئەو کیژانەم بینی/ کە هەزار مەمکیان هەیە و هەزار لێو/ دەمویست ملیۆنێک پەنجەم هەبێت و ملیۆنێک چاو/ دەمویست هەزار پەپوولە بگرم و هەزار (با) بمهەژێنێ/ هەزار ئافرەت ماچبکەم و هەزار ئافرەت ماچمبکات/ چونکێ هەزار لێوم هەیە و هەزار گۆنا/ خەونم بینی پشتێنە ئاوریشمینەکان، بەسەر کەمەرمدا شۆڕبۆتەوە/ لە شەوە تاریکەکاندا، بە توندی فوو لە مۆمەکان دەکەم/ بە توندی گالێسکەکان، بە ناو گەردەلوولەکاندا بازۆدەدەم/ شێتانە قامچی لە ئەسپە سەرمەستەکان دەدەم/ خەوم بە ملیۆنێک ئادەمیزادەوە دیت، لە دارستانەکاندا بە پێوە دەمرن/ بینیم، منداڵە شوشەکان بەرد دەگرنە یەکتری/ ئەو پیاوانەی لە مۆم خولقان، لە نزیک ئاگرەکانەوە، دەتوێنەوە/ ئەو کیژانەی لە چەرمن، هەتاو هەڵیاندەقرچێنێ/ باڵندە سەهۆڵینەکان، لە دارستانەکان دەبنە هەڵم/ بینیم درەختەکان گۆرانی دەڵێن/ ئافرەتە هەڵهاتووەکان، لە زۆنگاوەکاندا دەخنکێن/ بینیم، سەربازەکان لە ژێر چادری خوێناویدا دەنوون و مێشوولە ژەهراوییەکان دەیانکوژێت/ ئەو گالێسکانەم بینی کە مردووەکان بازۆیاندەدا/ من ئێسکەکانم بینی قامچیان دەدا لە ئەسپە تووڕەکان/ چاویانم بینی هەڵمی دۆزەخی لێهەڵدەستا/ لە بری دڵ زەنگۆڵەیەک شێتانە لە سنگیاندا دەهاو دەچوو/ بینیم، پیاوە نامۆکان، هەڕەشە لە ئەستێرە و با و زۆردارەکان دەکەن/ دڵدارە نامۆکان دەگرین و فرمێسکەکانیان وەک ئەڵماس دەدرەوشێتەوە/ ئەو کچە بێباکانەم دیت، قژیان وەکو شاژنەکان دەکرد بە تاج/ زەردەخەنەکانیان پڕبوو لە فێڵ و خیانەت/ پێخەفی بوکێنیان لە پەڕی سپی تاووسە کوژراوەکان بوو/ مەسیحێکی غەمباریش لە نابەینی مەمکەکانیاندا سەمایدەکرد/**

بینیم هەموو ئەو ڕۆژگارانەم بینی وەکو دوکەڵ چۆن بە سەقفەکاندا دێتەخوارێ، گریان بە برژانگماندا هاتبووەخوارێ/ ئەو لەشکرە شکستانەم بینی، کە نە گوڵیان پێ بوو، نە ئازادی/ ئەو جەنگاوەرانەی، کە جگەرەیان لە ڕێبوارەکان قەرزدەکرد/ ئەو هەرزەکارانەی سەریان نابوو بە درەختەکانەوە و دەگریان/ ئەو پیاوە زامدارانەی، یەک یەکتریان دەخنکاند/ ئەو سەربازانەی، تەرمی هاوڕێ مردووەکانیان دەناشت و گۆرانیان دەگووت/ ئەو هەورە ڕەشپێستانەی، لاشەی ئادەمیزادەکانیان دەشت/ بینیم باڵدارەکان نێوچاوانی مردووەکان کون کون دەکەن/ بینیم ئەستێرەکان چاودادەخەن... پڵنگەکان چاودادەخەن/ خەنجەرەکانم بینی پەشیمان بوون/ ڕێگاکانم بینی پەشیمان بوون/ تفەنگەکانم بینی پەشیمان بوون/ ئەوەی کە پەشیمان نەبوو ئێمەبووین... لە بەلەمەکاندا جگەرەمان دەکێشا و دەڕۆیشتین/ بەسەر ئەسپە ماندوو و پیرەکانەوە تیکەکانمان دەجوو و دەڕۆیشتین/ پەشیمان نەبووین و دەڕۆیشتین/ پەشیمان نەبووین و دەڕۆیشتین.

## ٥

ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانە/ ئاسۆکان پڕبوون لە باڵندەی ترساو/ کۆڵانەکان پڕبوون لە ئافرەتی نوقمبوو لە تەما/ دەرگاکان تەنیا لە ڕووی پیاوکوژاندا کراوە بوو/ منیش وەکو پەپوولەکان لە دوورەوە/ سەیری گلۆپی گەشاوەی شارە ئەفسوناوییەکانم دەکرد/ وەکو پاساری لە سەر درەختە دوورەکانەوە دەمڕوانی/ دەمڕوانی و بێبەش بووم/ پێکەنینی کیژ و باڵندەکان، دەیانکوشتم/ تۆش لەو زەوییانەی من خەونم پێوەدەدیت، سەماتدەکرد/ لە مێژ بوو نیگا پڕ لە ترس و سۆزەکانی منت لەیادچووبووەوە/ لە مێژ

بوو، نەتدەزانی، مرۆڤێک ماوە لە دارستان، خۆشیدەوێت/ نەتدەزانی بە ئەستێرە و پەپوولەکانم گووتوە «تیاچووم»/ نەتدەزانی من لە پاستۆنی دیکتاتۆر و چاوانی تۆ ڕامکردووە/ بە خۆر و کیژە ڕەشپۆشەکانم دەگووت: «تیاچووم... تیاچووم»/ لە ژێر شەستە بارانەکاندا دەگریام/ بە شۆفێرە پیرەکانم دەگووت/ بەو دایکانەی لە بازاڕ دەهاتنەوە/ بەو کیژە قوتابییە چکۆلانە و بە ئافرەتی بەر دەرکی خەستەخانەکانم دەگووت «تیاچووم... من تیاچووم»/ بەڵام کەس نەیدەزانی، تەنیا تۆ بەو نیگا خوێناوی و پڕ لە سیحر و گاڵتەیەوە دەتزانی/ بەلەمە خەواڵوەکان نەیاندەزانی/ گوڵی ناو ئینجانەکانی باغچەی گشتی و کورسی کتێبخانەکان... نەیاندەزانی/ تەنها تۆ بەو چاوە پڕ لە گوناه و تەفرەیەوە دەتزانی/ ئیدی ناگەڕێمەوە بۆ جەنگ و هیچ ئافرەتێکیش تەماشای فرمێسکەکانم ناکات/ بەڵام دەتزانی، دونیا پڕێتی لە پەپوولە و زەوی پڕێتی لە دارستان/ تەنها تۆ دەتزانی لە دارستانەکان و لەتەک پەپوولەکاندا نەبێت، ئیدی ناژێم/ کۆشکە بەرزەکان و کۆڵانە تاریکەکان/ ئەو کیژانەی بەیانیان دەچنە سەر کار/ ئەو هاوڕێیانەی لە سەربازخانە دوورەکاندا نامەی دەستگیرانەکانیان دەخوێنندەوە، نەیاندەزانی/ دڵنیابوویت، کە ئیدی بەلەمەکان هەڵمناگرن و فڕۆکەکان سوارمناکەن و شۆفێرە چڵکنەکان گوێم لێناگرن/ بەڵام ڕووت لەو کیشوەرە دوورانە کرد، کە دەتزانی من نایگەمێ/ دەتزانی لە دارستان و لەتەک پەپوولەکانەوە پیردەبم/ دەتزانی لە چاوەڕوانی سەفەردا پیردەبم و گوڵ لە نابەینی پەنجەکانی پێمدا دەڕوێت/ پیردەبم و هەتاو لە نێوچاوانمدا ئاوا دەبێت/ پیردەبم و دەمرم، دەمرم و لە دۆزەخ لە کەنار پەنجەرەکانەوە دەڕوانم/ دەڕوانم و دڵم پڕە لە پەژارەت/ یەزدانیش دڵنەوایمدەداتەوە و نازانێت بۆچی دەگریم/ فریشتە و پێغەمبەرەکانیش دڵخۆشیمدەدەنەوە و نازانن بۆچی دەگریم... بۆچی دەگریم.

# ٦

**ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانەی/ خنکام و لێوێک نەبوو ماچمبکات/ خنکام و لە بری قژ گوڵی ئاوی لە سەر سەرم ڕوا/ لە بری دڵ، ماسی لە سینەمدا بوو/ گیرفانەکانم پڕبوو لە لمی دەریایی/ سەدەفێکی پڕ مرواریش لە سەر ناوچاوانم بوو، سەدەفێکی پڕ مرواری/ خنکام و کۆترەکان سەیریاندەکردم و دەگریان/ پەنجەرەکان سەیریاندەکردم و دەیانزانی دەمرم/ درەختەکان دەیانزانی دەمرم/ گووتم، ئەی ئەو پردە زێڕینانەی، بەر لە من سۆزانی و پیاوکوژەکانت پەڕانەوە، دەبمپەڕێنەوە بۆ ئەو بەر/ گووتم: ئەی ئەو بەلەمە بچکۆلە و قەشەنگانەی، کیژ و هاوڕێ خانینەکانمتان پەڕانەوە/ بمپەڕێننەوە بۆ ئەو بەر/ ئەی کەڵەکە چکۆلانەکان/ ماسیگرە پیرەکانتان پەڕانەوە، دە بمپەڕێننەوە/ بەڵام کەس گوێی لێنەگرتم/ بە ئەسپە ئاوییەکانم گووت: ئێوە شاژنە هەڵهاتووەکانتان برد... بمبەن/ بە مەلەوانە چاوشینەکانم گووت، ئێوە مرواریەکانتان فڕاند... بمفڕێنن/ بەڵام چۆن لە شەقام و قوتابخانە و ئاهەنگەکان، فەرامۆشتانکردم/ فەرامۆشتانکردم/ خنکام و قارچکە ئاوییەکان لە سەر ناوچاوانم ڕوان/ نیلۆفەر لە گەروومدا سەوز بوو/ شەپازلەی ئاوەکانم خوارد و شەپۆلەکان ئازاریاندام/ خنکام و چۆن عاشق بە ناو گوڵەکاندا دەڕوات/ بە نێو ئێسکی نەهەنگ و پاشماوەی کەشتییە نوقمبووەکاندا، تێپەڕیم/ خەزنە نەدۆزراوەکانم دیت/ بریسکەی زێڕە ونبووەکانم دیت/ ئەو مردووانەی لە ژێر ئاوەکاندا سەریان سپی بوو بوو/ ئاوم لە تاجی ئەمیرە خنکاوەکاندا خواردەوە/ بە پاستۆنی دەستی شا پیرەکان هەڕەشەم لە ماسییەکان کرد/ گیانەوەرێکی ئاوی**

بووم بە ڕیشووی ئاوریشمینەوە/ خنکاوێک بووم، پرد و کەشتییەکان فەرامۆشیانکردم/ لە ژێر هەتاوی هاویندا، پوولەکەکانم دەبریسکانەوە/ بۆنی گیا دەریاییەکان لە هەناسەم دەهات/ خوێنم پڕ بوو لە گەرای ماسی و دڵی قرشە تینووەکان لە سینەمدا بوو/ تورەیی شەپۆلەکانیش لە ژێر ئاوچانمدا دەنگیدەهات/ نهێنی تاریکستانەکانی ئاویش لە چاومدا دەبریسکایەوە/ بە ددانی مرواریییە، قسەم لەگەڵ فریشتە خەووتوەکاندا دەکرد/ بە خەنجەرێ لە ئێسکی نەهەنگەکان، هەڕەشەم لەو قومارچیانە کرد/ لەسەر سەکۆکانی بەندەر/ قوماریان لە سەر دەستگیرانەکانیان دەکرد/ خنکاوێک بووم... لەسەر شۆستەی لەنگەرەکانەوە/ خواحافیزیم لەو پەپولانە کرد، کە وەک کچ ماچیاندەکردم/ خواحافیزیم لە کۆتری دەریاکان کرد، کە وەک هاورێ لە تەکمەوە دەیانگماند/ خواحافیزیم لە قرژاڵە بە ڕەحمەکان کرد/ کە وەک منداڵ لە گیرفانەکانمدا دەگریان/ گووتم، مالاوا... ئەی هاورێ.../ مالاوا، ئەی دۆستە نەشمیلەکان.../ من منداڵێکی تاک و تەنها بووم لە دنیا/ تاک و تەنها.../ ئێستاکەش گەلێ درەنگە، خۆشەویستان، ،من سەفەرێکم لەبەرە و دەگەڕێمەوە بۆ دەریا... دەگەڕێمەوە بۆ دەریا.

## ٧

ئای لەو ڕۆژگارە خۆشانە/ کە ئازادی گەلێ دووربوو، دڵی من گەلێ پڕ هیوا/ مانگ وەکو مۆمێکی چکۆلانە داگیرسابوو/ خۆر وەکو فانۆسێکی زەرد دەسووتا/ خۆشەویستم، ئەو ڕۆژانەت لەیادنییە؟ کە خۆر هێندە کز بوو/ مێشوولە پەرێشان و خەمگینەکان، بە چواردەوریدا هەڵدەپەڕین/ بیرتە دەستمان خستە سەر پشکۆکانی هەتاو و گەرممان نەبوووەوە؟

دەممان نا بە تیشکەکانیەوە و تاریکستانەکانی دڵمان نەبینی؟/ دەبایە لە شەقامەکاندا، بە چرا دەستییەکانەوە، فرمێسک و تکەی مۆم... گوڵ و پەپوولەی کوژراو... هەنار و نارنجۆک... لە یەکتر جیابکەینەوە/ دەبایە بە لایتە دەستیەکانەوە، ڕووی دایکمان لە ڕووی سۆزانی، ڕووی خوشکەکانمان لە وێنەی سەر دیوار و سیمای باوکمان لە دالاشی بەجێماوی کێلگەکان جیابکەینەوە/ لەبیرتە؟ خۆشەویستم لەبیرتە/ ئەو ڕۆژە خۆشانەت لەبیرە/ بۆ ئەوەی ئاو و ژەهر لە یەکتر جیابکەینەوە، دەبایە بماننۆشایە/ بۆ ئەوەی خۆشەویستی و خیانەت لە یەکتر جیابکەینەوە، دەبایە دڵی مرۆڤمان لە سینە دەربهێنایە و وەک فنجان تێمان بڕوانیایە/ ئەو ڕۆژەی کۆترەکان بە قەد مێشوولە بوون و مێشوولەکان بە قەد کۆتر/ لە بری گوڵ، کیسەڵی خەوتوومان لەسەر پەنجەرەکان دەدی/ بە ناو ئەو دارستانانەدا ڕۆیشتین/ کە درەختەکانی لەسەر سەر وەستا بوون/ دەستمان لەو گوڵانەدا کە وەکو بەرد ڕەق بوون و وەکو پووشی پاوەنەکان بێبۆن/ دایە، لەبیرتە ئەو ڕۆژە خۆشانەت لەبیرە، کە دیکتاتۆرەکان تفیاندەکردە خواردنەکەمەوە/ مامۆستاکانم تفیاندەکردە نەمرەکانی قوتابخانە و شیعرە خەمگینەکانم/ بە پەنجەرەی پۆلەکانەوە بەسترامەوە/ لەبیرتە چ ڕۆژگارێکی خۆشی پڕ لە غەم بوو/ مردووەکان لەسەر شەقامەکان گۆڕیان بۆ خۆیان هەڵدەکەن/ دایکەکان ئێسکی کوڕە تاقانەکانیان تووڕدەدایە تەنەکەی خۆڵەکەوە/ ژنە گەنجەکان، گۆشتی مێردەکانیان دەدا بە سەگە برسییەکان/ برا، خوشکەکەی خۆی ڕووتدەکردەوە و دەیدا بە هاوڕێکانی/ ئەو ڕۆژگارە، من منداڵێکی چاوکاڵ بووم، لە بۆن و نیگای ئادەمیزاد بێزار/ باوکم ناوی ژەنراڵەکانی لە ناوی من چاکتر دەزانی/ سەرگەردان بووم، حەزمدەکرد مامۆستاکانم لە جەهەنەمدا بسووتێن/ لە وانەکانی قوتابخانەدا... گەرووم وشک بوو بۆ تۆزێک ئاو و ئازادی/ لە پۆلەکانی خوێندندا، عەوداڵی ڕاکردن بووم بە ژێر بارانەکانی پایزدا/ دەمویست

ئافرەتێک لە ڕێگاکاندا بمگرێ و پێمبڵێ: تۆم خۆشدەوێت/ هەموو ڕۆژێک دەچوومە قوتابخانە و تفێک بە نێو چاوانمەوە بوو، شەپازلەیەک لەسەر ڕوومەتم/ ئای لەو ڕۆژە خۆشانە، ئەی هاوڕێی پەرێشان/ وامان دەزانی گەر فوو بکەینە دەمی یەکتر/ سنگمان وەکو سینەی کچان بەرزدەبێتەوە/ حەزماندەکرد، ئافرەت بین تا مراوییە خەمگینەکان ئاو بدەین و متیلە سپییەکان هەڵخەین/ دەستمان پڕبوو لە گوڵ و هەناسەمان پڕ بوو لە خۆشەویستی/ لە بەردەم دادگاکاندا هاوارمانکرد/ ئێمە هاوڕێی هەموو سۆزانییەکانی جیهانین/ ئێمە برای هەموو وێڵگەرد و پیاوە نامۆکانی جیهانین/ لە سەر دیواری قوتابخانەکان نوسیمان/ نامانەوێت بزانین چۆن پارە ئەژمێرین/ وانەیەکمان پێبڵێن... فێری خۆشەویستیمان بکات/ زمانێکمان فێربکەن، بتوانین دڵی کچە خەمگینەکانی پێخۆشبکەین/ وانەیەکمان بدەنێ تا بتوانین لە شەقامەکاندا سەمابکەین/ ئاهەنگێکمان فێربکەن، لەژێر تیشکی ئەستێرەکاندا یەکتری پێبگرینە ئامێز/ سێو دابەشبکەین و پرتەقاڵ بکەینە دیاری/ قوتابخانەیەکمان بدەنێ، ماچ و خۆشەویستی تیا قەدەغە نەبێت/ قەدەغە نەبێت کچان بە جلکی کورتەوە سەمابکەن/ ڕووتی نەبێتە مایەی شەرمەزاری و لە ئامێزگرتن نەبێتە مایەی سزا/ گووتمان چەرچەفی ئاوریشممان بدەنێ/ با لەسەر شەقامەکان ڕایخەین و دوو دوو لە ژێر درەختەکاندا بخەوین/ گووتمان، گوڵاومان بدەنێ، با بۆنی چلکنی هاوڕێ خائینەکانمان لە یادبچێتەوە/ ماچی ڕاستەقینەمان بدەنێ، با ماچی ژەهراوی دەستگیرانە بێوەفاکانمان لە یادبچێتەوە/ دارستانی گەورە گەورەمان بدەنێ/ با لەسەر دەفتەری ئەم مردنە... بیانووی هەڵگیرسانی ئەم جەنگە بخۆێنینەوە/ بۆنی کۆترەکان لە سەر ئەم دەفتەری یاداشتە تۆمارکەین/ گمەی هێلانەکان لە سەر کتێبی کۆنی ئەم ڕواقی گەلاڕێزانە بنوسینەوە... تا سیمای ئەو دارانە فەرامۆشبکەین کە بە قەدەکانیانەوە بەستراینەوە/ ڕوباری

خوڕ و سازگارمان بدەنێ/ با تامی ئەو تاڵاوانە لەیادکەین، کە دایکە دڵڕەقەکان کردویانە بە گەرومانـدا/ گووتمـان، منداڵیمـان بدەنـەوە/ ئەسپە دارینەکانی جارانمـان بدەنـەوە/ مەمکەمژە و مـاچ و شەقشـەقە و گاگۆڵکێمـان بدەنـەوە/ گریانـی تەنهایـی نـاو بێشکەکانی بێکەسیمان بدەنـەوە/ گوڵـی زیوینـی سەر کڵاو قوچەکانمـان بدەنـەوە/ دۆعـای چڵکنـی سەر کراسە چەورەکانمـان بدەنـەوە/ هەموو شتێکمان بۆ ئێوە... تەنیـا... تەنیـا... یەک ڕۆژ، یەک ڕۆژی منداڵیمـان بدەنـەوە.

# ٨

ئـای لـەو ڕۆژگارە خۆشانە، گەمێیەک بـووم پـڕ لـە گەنم/ باڵنـدارە ئاوییـە وێڵـەکان، لێیانخـواردم/ کەشتییەکی تەنهـا بـووم، تارمایـی دەریاوانـە شـەکەتەکانم، سـواردەکرد/ ئـەو دەریاوانانـەی لـە لافـاوی گەردەلـوول و خیانەتـدا خنکابـوون/ کەشتییەک بـووم، تارمایـی ماسیگرێکی پیـر لەسـەر دڵـم پیاسـەیدەکرد/ تـۆڕە پەشیمانەکان، لەسـەر سنگم دەگریـان/ ماسییە کـوژراوەکان شـکاتیان لـەلا دەکـردم/ ڕۆیشـتم و لـە ناوەڕاسـتی دەریـا بەرینەکانـدا/ ئـەو دارسـتانانەم بینـی، لەسـەر ڕووی زیوینـی ئـاوەکان ڕوابـوون/ کەشتییەک بـووم، بـە نیگای مانـدوو، دەست و پێـی خەواڵـووەوە/ لەسـەر ڕووی ئـاوەکان گاگۆڵکێم دەکـرد/ پـەری دەریـاکان، نێوچاوانـی گـەرم و سـووتاویان ماچکـردم/ متیلـی چارۆکەکەیـان شـتم و ڕاڕەوە تاریکەکانیـان گسـکدام/ ئەستێرەکان چـرام بـوون و فریشـتەکان قیبلەنمـام/ چـاوم لێکنـاو بـە نـاو لرفـەی ئاوەکانـدا تێپەڕیـم/ وەک کوێـرەکان ڕۆیشـتم، تـا شـەپۆلە دڵنەرمەکان، دەستمبگرن/ لـە گلێنـە شـەرمنەکەمدا، ئـەو ماسیانەم شـاردەوە لـە ترسی نـاو هەڵهاتبـوون/ دولفینەکان پاسەوانی خەزنـە نەمرەکانم بوون/

**لەناو گەردەلوولی ڕەنگ و دیمەنە ئاوییەکاندا/ گلێنەم بە شادییەکی ئەزەلی کرایە/ گریام بۆ ئەوەی تاریکستانەکانی شادی ببینم/ تا ببینم لە قووڵترین جێگای خۆشیدا/ فریشکەی چ ترسێک خۆی حەشارداوە/ ئەو دوورگانەی وەک ئافرەت لە ناو ئاوەکاندا دانیشتبوون/ وەک پیرە داناکان سەیری ئاسۆیان دەکرد و بیریاندەکردەوە گووتیان: ئەی کەشتی ماندوو و بێقەرار، لە کەنارەکانمدا بنوو/ گووتیان: وەرە، ئەی ئەو منداڵەی مەمکەمژە ژەهراوییەکانت لە دەمدایە و بە دەم سەرابی ئۆقیانووسەکانەوە پێدەکەنی/ وەرە ئەی ئەو بێشکە وێڵەی، تینووێتی بیابانەکان لە گەرووتدایە/ کەشتی چەتەکان، دەستیان بۆ ڕاوەشاندم و گووتیان: ئەی بەلەمی پڕ لە خۆشەویستی، خەزنەکانی خۆتمان بدەرێ/ ڕەحمی نیگاکانی خۆتمان نیشانبدە/ ڕۆیشتم و ئەو چەتە برسییانەم بینی، کە چۆن نەخۆش لە ژێر درەختی بیمارستانەکاندا دەمرن/ لە بورجی کەشتییەکاندا مردبوون/ خوانی پڕ لە ئێسکی ماسیم بینی/ وەک سفرەی دوای کارەساتەکان جێمابوو/ ئەو پاسەوانانەی لە سەر سندوقە زێڕەکان برسێتی هەراسی لێبڕیبوون/ تێپەڕیم و بێهودە نیازم بوو، لە گۆمە موگناتیسییەکانی خەیاڵدا ونبم/ حۆرییە نازکەکانی سەراب بە لێوی ڕاستەقینە ماچمبکەن/ کیژە ئاوییەکانی خەیاڵ، بە مەچەکی ڕاستەقینە پێخەفی دەریایم نیشاندەن/ بە ناو لرفەی بێرەحمی ئاودا ڕۆیشتم و پەری خەمگینی سەر بەردی ئۆقیانووسەکان لێیانپرسیم/ ئەی کەشتی «بەختیار» کە بەو دڵە شادەوە بێباک چاوانت لێکناوە و دەڕۆیت/ ئەو ژن و پیاوە عاشقانەت لە یادە، لە سەر بەستەکانی تۆوە سەیری بەندەری ئاواتیان دەکرد/ ئەی بێرەحم، تۆ لە نیشتمانێ هەڵهاتێ/ ڕووبارەکانی تووشی سیل بوو بوون و کێڵگەکانی تاعوونیان گرتبوو/ لە بەندەرێک هەڵهاتی، کیژەکانی لە لۆکەبوون و پیاوانی لە بۆرەک/ بۆ لەو زەویانە نەوەستای، کە شادی بە جۆگەکانیدا ڕادەبورد/ گووتم:**

ئەی پەرییە خەمگینەکان/ من بە ناو حەقیقەت و خەیاڵاتیّ تێپەڕیم/ بەڵام ئەو عەردی نومێدە، لێرە نییە/ نە لە سەر زەوییە و نە لەو دیو زەوییەوە/ نە لە ئۆقیانووسەکاندایە و نە لەو دیو ئۆقیانووسەکانەوە/ بێهودە کێوەکانی ناو دەبڕم/ ڕۆژگارێک چارۆکەکەم وەک کراسی شایی پڕیتی لە وێنەی گوڵ/ ڕۆژگارێکیش وەک تەعزێبارەکان ڕەشپۆشم/ ڕۆیشتم و ئەو ئەستێرانەم دیت کە لە سەرمدا هەڵدەلەرزین/ ئەو نەخۆشانەم هەڵگرتەوە، لە خەستەخانەی بەندەرەکانەوە توڕیاندابوونە دەریاوە/ ئەو زیندانیانەم پەنادا، کە بە زنجیر و دیوارەکانەوە هەڵهاتبوون/ من کەشتی کارەساتی ئەم ڕۆژگارەم، خەوم بوو، ئازار نەهێڵم/ من کۆیلەم بەم خاک و ئەستێرەیەوە/ نە دەتوانم لێیهەڵبێم و نە دەتوانم بەجێیبێڵم.

# ٩

نای لەو ڕۆژگارە خۆشانەی/ لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا مەست بووم و لە پێخەفی خۆشەویستیدا/ لەگەڵ ئافرەتە داوێنپیسەکاندا نوێژمکرد/ بەیانیان گوڵەگەنمە خەوتووەکانم خەبەرکردەوە و وەک ئاغایەکی دڵڕەق کێڵگە نابووتەکانم سزادا/ لێوم دابووە دەست موعجیزەی ماچ و جەستەم دابووە دەست ئەفسونی خۆشەویستی/ دڵم بۆ ئەو نهێنیانە بوو والا نابێت/ ڕۆحم بۆ ئەو بایانە بوو کەس لە زمانیان تێناگات/ بەڵام کاتێک بەئاگاهاتمەوە/ دەبایە بە دەستکێشەوە دەست بۆ ئەو مەمکە ساردانە بەرم/ لە زەمهەریری زستانە دوورەکانەوە هاتبوون وەک ئەو سەربازانەی بە کێڵگە مین ڕێژکراوەکاندا دەڕۆن/ بەترسەوە دەستم بەسەر لەشە سپییەکاندا هێنا/ بەئاگاهاتمەوە و بینیم عاشقم/ بۆیە لەسەر سوچەکاندا داوای

**شوناسنامەی خۆشەویستیان لێکردم/ بینیم لە کۆشکێکدام بومەلەرزەکان وێرانیانکردووە/ لەبەر پەنجەرەیەکدام (با) خستۆێتیە گریان/ بینیم دڵی نیشتمانەکەم بە قولاپی ماسیگرەکانەوەیە و ناوچاوانی دارستانەکانی لە دووربینی تفەنگی ڕاوکەرەکاندایە/ بینیم، لە نیشتمانێکدام مۆرفینی داوە لە ماسی و هەورەکان تا لە بنکی دەریا و ئاسمانەکاندا بخەون/ بە بەرد سەری گوڵەکانی پانکردۆتەوە و خەنجەری چەقاندۆتە، دڵی نێرگس/ بینیم لە زەوییەکدام، زەهر دەرخواردی کەنارییەکان دەدا و گوڵی زێڕین دەدا لە بێشکەی خائینەکان/ لە وڵاتێکدام دەیەوێت چۆن هەور بە نیگای خوێنینەوە، لە ئاسۆ دوورەکاندا دەمرێت/ چۆن کۆتر بەگلێنەی پڕ لە خۆڵەمێشەوە لە ئاگرەکاندا دەسووتێ/ لە کەنارە دوورەکاندا بمرین و گلێنەمان پڕبێت لە لم/ نیشتمانێک بوو، چاوی بەستینەوە و لە کێڵگە مین ڕێژکراوەکاندا بەریداین/ دەستی بەستینەوە و بردینی بۆ زۆرانبازی/ زنجیری خستە پێمان و سەگە درەکانی خستە دوامان/ بۆیە ڕۆشتم، تا لە ژێر لمی بیابانەکاندا بۆ سێبەری پێغەمبەرەکان بگەڕێم/ یەخەیانبگرم و پێیانبڵێم، ئیدی تەواو ڕۆژگاری موعجیزە بەسەرچوو/ تا ئەو گۆچانە سیحرییە لە دەستی «موسی» بستێنم و بیدەم بە کوێرێک، کەسی نییە، لە جەنجاڵی بازاڕەکاندا دەستیبگرێت/ خاچەکەی مەسیح بدەمە دەست دارتاشێک، بیکاتە دارشەق بۆ ئەو سەربازانەی جەنگ هەردوو قاچی لێسەندن/ بە «موحەمەد» بڵێم کتێبەکانی کۆبکاتەوە و بێت گوێ لە فاڵچییەکان بگرێت/ پێیانبڵێم، ئەو ڕۆژگارانە بەسەرچوو، کە ژیانمان بە دەست خوا بوو/ ژیانمان ئێستاکێ بە دەست سەرکردە و دەوڵەمەند سۆزانییەکانە.**

**١٩٨٦**

# ١

ئەوان لە پرسەکاندا، دەست دەنێنە سەر دەست/ گەردەلوولە پیرەکانیش لە دارستان بە کەساسی دەگرین/ بە نێوچاوانێکی سپییەوە وەکو بللور/ بەنێو تیشک و ڕووناکییە خواکردەکاندا دەگەڕام/ دەمم پڕبوو لە کوفر، دەستم پڕبوو لە خیانەت/ هەموو ئەستێرەیەک کوشندەبوو، هەموو کازیوەیەکیش خوێناوی/ تریفە بە پێڵوە ڕەنگینەکانییەوە تاووس بوو/ جوانیش ڕەنگێک بوو ژەهراوی/ لە کەناره پڕ لە جادووەکانی خەودا/ کە دڵ پڕبوو لە دوکەڵی سپی سپی/ بەیانیش وەکو قوتویەکی پڕ لە زیڕ خودا سەرێدەکردەوە/ خوێن وەکو تۆوی مێخەک لە زمانم هەڵدەوەری/ جێگای هەموو وشەیەک برین بوو/ هەموو ڕوانینێکیش سزا/ کەچی بازنە شینەکانی گڕم بەجێنەهێشت/ مالاوام لە تیغە برسییەکانی مردن نەکرد/ بۆنەوەی پاک وەک ئەستێرەکان بژیم.

ئەی ئەو پیاوەی خۆت لە خوم و لیتەی ڕۆژگارە پیسەکان هەڵکێشاوە/ تا ئەم پیاوکوژانە نەتخۆن/ هێندە وەکو بێچووە پاسارییە برسییەکان دەمت بۆ ئاسمان هەڵبڕی/ زگت پڕبوو لە ڕەشەبا و تۆزی گەردەلوولە ناوەختەکان/ دڵت پڕبوو لە گڵی زەرد/ لەشکری خەواڵووی پادشا قژزەردەکان بەتەکتا تێپەڕین/ تکەی خوێن، وەکو تکەی شیرەکەی منداڵی بە لێویانەوە بوو/ کەژاوەی ئەمیرە چاوشینەکان تێپەڕین/ دەمت پڕبوو لە تیکەی سارد و لە ئاوی زۆنگاوە دوورەکان/ دەتگووت: چەند جوانە، برینێ بە نێوچاوانیەوەیەتی/ لەسەر ئەسپێکە، پاسارییەکان هێلانەیان لەسەر

پشتی کردووە/ لەو کیژانە دەڕوانێت، کە لە کێڵگەکاندا خەوتوون/ بەڵام نوێژی بۆ شکستی قارەمانە خەوتووەکان نەکرد/ وەک هەرزەکار، لەپێش دەم چاخانەکاندا/ ملی بۆ کەژاوەکان درێژنەکرد.
ئەی ئەو پیاوەی لە شەوی گوللەباراندا قاچت بە دیوارە لەرزۆکەکاندا دەکێشا/ تا ماویت، سێبەرێکی تەڵخی لە دەوری زۆنگاوی زیندان و قوتابخانەکان/ لە دەوری ئافرەتانی نەخۆش و درەختە هەڵقرچاوەکان.

## ٢

وەک چۆن پەنجە دەخرێتە سەر کتێبەکانی قوتابخانە/ بێباک، دڵم خستە سەر ئەم نێزە خوێناوییە/ خۆشەویستم، حەزم لە ئازارێکی پاییزییە/ حەزم لەو وەرزەیە کە درەختەکان لەژێر شەستەباراندا، دەڵێی سۆزانین لەژێر تاقگەکان/ لەو وەرزەدا (با) وەکو پیاوێکی غەریب، فیکەلێدەدات و هەرێزەکان دەجوڵێنێت/ ئەو ڕۆژانە، ئەم پیاوە کورتەباڵایە/ وەکو نامەیەکی دڵداری، وەکو بەڵگەنامەیەکی خیانەت، دەسووتێنرا/ خوێنیش بە گەردنییەوە دەتگووت ملوانکەی شاهانەیە/ ماچیش، وەکو گڕاوی بورکانەکان، لەلێوییەوە فوڵپیاندەدا/ بە ترسەوە نێوچاوانی خستە سەر مێزەکانی قوتابخانە و خەونیبینی/ دەیویست، چۆن تۆزی سەر جلی هاوڕێکانی دەتەکێنێت/ حەسرەت لەم دنیایە بتەکێنێت/ بەڵام بەرامبەر بە لەشکرە تورەکان/ بەرامبەر بە ئیمپراتۆرە چاو ئاگرە چەتوونەکان/ پێنج بەردی هەڵماقۆو چەپکێ گوڵەگەنمی زێڕینی پێبوو/ قەڵغانەکەشی بەرگی دەفتەرەکانی قوتابخانە و لبادی تەختەسڕە کۆنەکان بوو.

# ٣

خۆشەویستم/ کاتێک پەنجە وەکو تەرزی مێوە کێویلەکان درێژدەبێت/ ئیدی چیدیکە ناتوانین، تفەنگەکان بگرین/ ناتوانین دۆعا لە دوژمنانمان نەکەین و پەنجەمان شۆڕنەبێتەوە/ هێندە دەتوانین لە زیندانەکانماندا پەل بە دیوارەکاندا هەڵبدەین/ دەستم وەکو ملی باڵندەکان درێژدەکەم/ بەڵکو ڕێبوارێک بیگرێت/ هەزار ساڵە هاوڕێیەک نەیگرتووە/ چەند بە چەندە، لەبەر میحراب و ماڵە سۆزانییەکاندا چاوەڕوانە/ ئەوە دەستی درێژی بەر حانوتەکانی قوتابخانەیە/ ئەوە دەستی، نوشتاوەی ژێر زەبری جەلادەکانە/ کە نامەی دڕاوی دڵداری فڕێدەدایە ئەودیو دیوارەکانەوە/ لە شاییەکاندا سەرچۆپی هەڵدەسوڕان و لە تەعزێدا تەزبێحی دەخولاندەوە. نەماندەزانی ژیان/ ئەو شەمەندەفەرەی لە شیفۆنی سەوز دروستبووە/ لەسەر برسێتی و پاشماوەی فرمێسکەکانی خۆی دەڕوات... بۆ کوێ دەچێت؟/ دەچێتە گوندە دوورەکان کە زرکە کاڵەکی سەوز خلبۆتەوە ناو دۆڵەکان/ یان لەژێر هەتاوی چاوزەردی بیاباندا وەک باڵداری برۆ سووتاو/ جنێو بە هەورە دوورەکان دەدات/ خۆشەویستم لەوێ پێتدەڵێم ئەو هەورانە لە دەریاوە نەهاتوون/ ئەوە دوکەڵی جگەرەی سۆزانییەکانی شارە/ ئەوە پشیلەی سپی توڕدراوە بۆ ئاسمان/ لێمببورە، ئەوە خاکی خۆشەویستی ئێمەیە/ ئەی گەڕۆک وەکو چاوی بزۆکی سیخوڕەکان.

## ٤

خۆشەویستم/ وێنەی تفەنگە دێرینەکانم بۆ بنێرە/ ئەوەک وێنەی دڵدارانی بەر سێبەری درەختەکان/ وێنەی خەنجەری خوێناوی ناو برینم بۆ بنێرە/ ئەوەک وێنەی سەیرانگا و ترومبێلە درێژەکان/ وێنەی شوشەیەک ژەهر و لاشەیەکم بۆ بنێرە/ ئەوەک وێنەی کوڕی قژزەرد و کچە شەبقە بەسەرەکان/ تا دەمرم... لەبەردەم کانییە وشکەکاندا شەرمەزارم/ تا دەمرم دەست بە سنگەوە دەگرم بۆ تابووتی سواڵکەرەکان/ تا دەمرم... وەکو فریشتە دەڕوانمە سۆزانییەکان، سوێند بە مەمک و لێویان دەخۆم/ تا دەمرم... لەژێر زەبری ئەم خیانەتە پیرۆزەدا کە لە کۆگا و کۆشکە پڕ لەزەتەکانم کرد، دەنرکێنم/ دەنرکێنم و گۆرانی خوێناویشم، وەک جێپێی دز لە کێوە بەفرینەکاندا، بەرزبۆتەوە تا ئاسمان.

## ٥

ئەو گەردەلوولەی وەکو سۆزانییەکی پیر دەپرخێنێ/ وەکو منداڵێکی چلکن بەسەر جۆگەلەکاندا بازدەدات/ پڕێتی لە پەڕۆی دڕاوی داپیرە نەخۆشەکان/ پڕێتی لە نیگای سەوزی سەربازە چاوبەخەوەکان/ تۆ بۆ پەپوولە و نامەی دڕاوی پیاوکوژەکان دەگەڕێت/ بۆ فرمێسکی ژێر درەختەکان دەگەڕێت/ بۆ دەنگی پێی قافڵە ونبووەکان دەگەڕێت/ بڕوانە، لە چ سەعاتێکدا ئەم نائومێدییە وەکو کچە چەتوونەکان، دەنرکێنێت/ ئەم شیعرە بەرامبەرانە، وەکو چاوی عاشقەکان/ کەی لە

یەکتری گیردەبن/ ئەم زەوییە بێهۆشەی وەک دەرگا داخراوەکان/ بە دەست و پێ و سەر و سنگی خۆمان پیادەکێشین، کەی بێداردەبێتەوە/ پێیبڵێ، کەی وەکو کەروێشکەکان ڕادەچڵەکێت/ ئەگەر بێدارنابیتەوە/ وەکو تلۆرە بەردەکان، فرمێسکەکانم خلدەکەمەوە ناو دۆڵەکان/ ئەو پێکەنینەی لە گەرووە پڕ لە خوێنەکەمدا بۆ یادگار هەڵمگرتبوو، توڕیدەدەم/ جلکەکانم دەکەمەبەری دزە ڕووتەڵەکانی زستان/ خۆشەویستیش، با وەکو ئەسپێکی تووڕە/ لە دڵمدا بسوڕێتەوە و بە سەر پەرژین و دیوارەکاندا بازبدات/ منیش ویقاری شێتە داناکان لەبەردەکەم/ ئەگەر بێدارنابێتەوە با پێمبڵێت، چیبکەم، چیبکەم؟

٦

لە نهۆمە نزمەکاندا/ کە دز لە دەرگاوە دێت و دەچێت/ کە گوێت لە نرکەی نەخۆشە چاوڕەشەکانە/ هاوڕێم، ماچ پڕێتی لە ترس و لەزەتی مندالانە/ لە نهۆمە بەرزەکاندا/ کە وەرزەکان لە شوشەن و دەسکێشی ئاوریشم هەیە/ ماچ سارد و سڕ و بێمانایە/ وەک دەنگی گوللە دوورەکان... وەک هەرەسهێنانی بەردەلان/ ئەی دۆست، من سوێندم بە سنگی سۆزانییە هەژارەکان خوارد/ تۆ سوێندت بە ڕەنگی چرای کۆشکەکان/ من سوێندم بە متیلی چلکنی سەر جێگای نەخۆشەکان خوارد/ تۆ بە تاجی تەلاییی پادشاکان/ من جنێوم بە باغچەی گەورە و جلکی جواندا/ تۆ بە حەوشی چکۆلە و گەداکان / من لە بنکی زەمهەریری زستاندا بووم/ تۆ لە کۆشکە چەند قاتەکان/ من پاڵتۆ شڕەکەم بۆ خۆرئاوابوون بادەدا/ تۆ گوڵ و ماچت دەگرتە پیاوکوژەکان.

## ٧

لەو ڕۆژگارەدا، کە لە بری وێنەی یادگارەکان/ تفەنگ و خەنجەری مستوو زێڕین هەڵدەواسن/ مرۆڤ وەکو بەلەمە شکستەکان لەسەر شۆستەکان نوقمدەبێت/ فرمێسک وەکو تۆز وشکە/ وەکو چۆن دڕکی بچوک لە پەنجە دەردەهێنرێ/ خۆشەویستی لە دڵمدا دەردەهێنیم/ با بڕوات دزەنیگای هاوینانی سەربانەکان کۆبکاتەوە/ تف و کۆکە و جنێوی دایکەپیرەکان کۆبکاتەوە/ حەزی کچە سیازدە ساڵانەکان/ شەرەفی شکاو و فرمێسکی پیاوە پیرە ڕیش سپییەکان کۆبکاتەوە/ با ترسی ئەو غونچانەم بۆ بگێڕێتەوە کە لەژێر زەبری قامچیدا گەشانەوە/ با باسی ئەو هەورانە بکات/ کە بە زەبری تفی ئێمە بارین/ دەستی ئەو قارەمانانەم بۆ بخوێنێتەوە کە ئەشکەنجە خیانەتی پێکردن/ یا وەکو دەستی ئەو لە خواترسەی لە پەنجەرەی کۆشکە بەرزەکانەوە دەڕوانێ و دەپاڕێتەوە/ بگری و ستایشی میهرەبانی یەزدان بکات/ بگری و بە خودا بڵێت: وردە شوشە، لەسەر برۆمان نیشتووە/ پێمان لە خوڵی سووری دارستانەکاندا چەقیوە/ دەستمان لە زنجیردایە و بەدەم تلی ئازارەوە/ چەقۆ لە جێپێی لەشکرە شکستەکان و سێبەری باڵندە بەرزفڕەکان دەدەین.

## ٨

کەی گوڵەمێخەکەکان، پڕدەکات لە فرمێسک و دەڕوات/ کەی زین لە پشتی ئەسپەکان دادەگرێت و دەڕوات/ دڵڕەقیی وەک پەڕۆیەکی سوور بەستوە بە نێوچاوانییەوە/ خۆشەویستیشی وەکو تفەنگێکی شاردراوە لە دڵیدا هەڵگرتووە/ کەی دەڕوات/ چۆن قوتابی خۆی لە بن تەختەکاندا

وندەکات/ خۆی لە نابەینی پاشووی ئەسپەکاندا وندەکات/ وەکو کچانی ناو چیرۆک، لە شەوێکی گەردەلوولدا دێت و لە شەوێکی گەردەلوولدا دەڕوات/ چاوانی پڕن لە وێنەی پیاوکوژەکان/ دەستەکانی پڕن لە ئەنگوستیلەی دیاری سۆزانییەکان/ وەکو چۆن کچ وێنەی دەستگیرانەکانیان پیشانی یەکدی دەدەن/ چۆن هەرزەکار سۆزانی پیشان هەرزەکار دەدات/ دێت و چارەنوسی خۆیمان پیشاندەداتەوە/ بولبول و چڵی درەختەکان نایترسێنن، لە کونە پەپووەکان وەڕزنابێت/ کاتێک وشە وەکو خوێنێکی نامۆ لە دەمارە ساردەکانیدا دەگریا/ کاتێک تاشە سەهۆڵە خوێناوییەکان، لەسەر سینەی بوون... خۆشەویستە دێرینەکان بەجێیانهێشت/ وشە، ئەو مەرهەمە سوورە بوو/ کە وەک زمانی شەکەتی باڵندەکان لە برینەکانییەوە هاتبووەدەرێ/ لەسەر دوکەڵ و پەڕەی کتێبە زەردەکان/ وێنەی ئادەمیزادە برسییەکان و گیرفانە دڕاوەکانی کێشا بوو/ وێنەی ئەو پاسەوانانەی لە تاریکیدا جگەرە دادەگیرسێنن/ وێنەی ئەو هێلانانەی لەبری باڵندە پڕن لە پارەی دزراو/ وێنەی ئەو ئاسمانانەی لەبری ئەستێرە/ پڕن لە وێنەی پاکەت و فرمێسکی بەرمو حەوا توڕدراو.

## ٩

وەکو کۆترێک لە گیرفانی منداڵاندا بمرێت، دەمرین/ وەکو هەڵۆیەک لەژێر تایەی ترۆمبیلەکاندا بمرێت، دەمرین/ وەکو لادێیەکی چاوکاڵ بەسەر زەمبیلە پوشەکانەوە بمرێت، دەمرین/ هاوڕێم، وەکو کڵاوی ئەو دزانەی لەبەر پەنجەرەکاندا جێدەمێنێت، لەبەر پەنجەرەکانی چاوەڕوانیدا جێدەمێنین/ وەک ئەو پەپوولە مردوانەی/ لە نابەینی دەفتەرەکاندا جێدەمێنێت، جێدەمێنین/ وەک پەیکەری ئەسپێکی توڕە، دەستمان بەرزکردۆتەوە و گوللە وێڵەکان دەمانپێکن/ لەبری تف، گریان

لە لێومانەوە دێتەخوارێ/ بڕوامان وەکو ئالآی ولآتەکەمان با دەیهێنێت و با دەیبات/ بەو خوێنەی لە پۆلەکانی خوێندندا، بە منداڵی لە لووتمانەوە پڕژا/ گوڵمان لەسەر دەستەسڕە سپییەکان کێشا/ خەتی ڕاست و چەپمان بەسەر نێوچاوانی خۆماندا هێنا و گریاین/ وەک پشیلە، لە تونی ڕەشی دوکەڵکێشەکان بێتەدەرێ، لەو ڕۆژگارانە هاتینەدەرێ/ لە جەنجاڵی شەقامەکاندا/ بەدوای لیرە و درهەمە دێرینەکاندا دەستمان لە کەمەری پیرێژنە چەمیوەکان دەدا/ بەدوای زێڕ و ملوانکەی مرواریدا سەرمان بەسەر سینەی ئافرەتاندا شۆڕدەکردەوە/ لە هەنگاوی پیرەکاندا بەدوای ڕۆژانی سوارچاکی و ڕاوشکاردا گەڕاین/ لە سەیرانگاکاندا ئەڵقەی لەیادچووەوەی دەستی بێوەژنەکانمان دیتەوە/ بەو ئەڵقەیەوە گوناهیاندەکرد/ بەو ئەڵقەیەوە دەستیان بەسەر پیاوانی تردا دەهێنا/ چۆن پیاوە ئیفلیجەکان، پەنجەی پێیان دەجوڵێنن/ درەختە پیرەکانیش ڕەگەکانیان دەجولآند و حەزیان لە دەربازبوون دەکرد/ لە گۆڕستانەکان، سەرپۆشی ڕەشی کچە عاشقەکانمان بینی لەسەر گۆڕەکان بەجێمابوو/ دەمانزانی ئێمەش جێدەمێنین. لەژێر کورسی ترومبیلەکانی سەفەردا/ جانتای بەجێماومان بینییەوە، پڕبوو لە جلی ژنانە و بێزاریی و عەتری بۆنخۆش/ دەمانزانی ئێمەش، ڕۆژێک لەسەر کورسی چاخانەکان بە مردوویی جێدەمێنین/ ڕۆژێک لەبەر کتێبخانەکاندا بە مردوویی جێدەمێنین/ وەکو ئەو پاسارییە خنکاوانەی دەکەونە بەر جۆگەکان ئاو دەمان بات/ وەکو کەروێشکی کوژراو لە بنکی بەرچنەکاندا، دەکوژرێین و لە بنکی تابووتەکاندا، جنێو بە کۆشکە بەرزەکان دەدەین/ حەزماندەکرد بەو بڕوا ئاوریشمینەوە/ نەک لە پێشدەم پەنجەرە چڵکنەکاندا/ بەڵکو لە پێشدەم دارستانەکاندا بمرین و قریشکەی جەنگاوەرە تووڕەکان لە گەرووماندا بێت/ کاتێک وشە، وەکو ئەو کرمە سەوزانە لەسەر کاشی کۆشکەکان، دێن و دەچن/ بەسەر زمانماندا، دەهاو دەچوو/ دڵمان پڕببوو

لە بەفری خوێناوی زستان/ خەونمان، بەو ڕۆژگارانەوە دەبینی/ کە تۆزی سوارچاکەکان لە گەروومان‌دا بوو/ کە دەنگی پێی ئەسپەکان، پۆلە باڵندەی بیابانی ڕادەچڵەکان/ ئێستاش بریسکەی تفەنگەکانیان، لە ناوچاوانمان‌دا دەگری.

هاوڕێم... ئەوان خەونیان بە پەرداخی پڕ لە مرواریی‌یەوە دەبینی/ ئێمە شوشەی پڕ لە فرمێسکمان لایە/ ئەوان خەونیان بەو ڕۆژگارانەوە دەبینی کە پڕێتی لە هەلهەلە و تریقەی پادشایانە/ ئێمەش گەرووممان وەکو گەرووی ماسیی‌یە کوژراوەکان پڕە لە خوێن/ وەکو ئەو کوژراوانەی، دەکەون بەسەر لێواری پەنجەرەی باڵەخانەکاندا/ لە لێواری کارەساتەکاندا کەوتووین و جنێو وەکو پڵپڵە بە زمانمان‌دا هاتۆتەخوار/ لە ڕۆژگارە نائومێدەکان‌دا کاتێک لێومان وەکو گەڵای درەختەکان هەڵدەلەرزی، زمانمان وەکو دەستی کەفتەکاران پڕبوو لە ڕەگی پیری/ ددانمان وەکو لوولەی تفەنگەکان ژەنگاوی بوو/ بیرمان لە ماچ و چرپەی پڕ لە خۆشەویستی دەکردەوە/ ئەو ڕۆژانە، تفەنگ و تۆپە دێرینەکانمان بە باران دەشت/ خوێنمان دەکردە مەتارەکانەوە/ وەکو چۆن تفی خوێناوی لە توێی دەستەسڕەکاندا هەڵدەگیرێت/ دڵە خوێناوییەکانمان فڕێدابووە نێو ئەو جلکە خاکییانەوە/ حەزمان بە بارانێک دەکرد بەسەر گوناهەکانمان‌دا ببارێت و نیدی بە زیندووی سەربخەینە سەر تابووتەکانمان/ ئیدی دەست لە گوڵ نەدەین و بمرین/ بەڵام ئەفسوس، دەبێت لە ساتی مردنیشدا/ سەرلەنوێ دەستمان لەسەر تفەنگەکانمان بێت... نەبا جارێکی دیکە، دووبارە بمانکوژنەوە.

## ١٠

کاتێک لە شەقامە ساردەکاندا، ئەو خەنجەرانە دەفرۆشن/ کە تامی سینەی ئادەمیزادیان کردوە/ ئەو نێزانە دەفرۆشن کە لە ڕۆژانی جەنگ و برسێتیدا، منداڵی سەر بێشکەکان مژیویانن/ حەزدەکەم وەکو بروسکەکان بشریخێنم/ بەڵام کاتێک قوڕ و لیتەی باراناوەکان دەکەن بە ڕوومانندا/ باسی ناشیرینی دەموچاو و باڵامان دەکەن/ هەست بە شانازی دەکەم/ ئێمە تفدەکەینە سەر مەرمەڕی کۆشکەکان/ دەستە چەورەکانمان بە پەردە ئاوریشمییەکان دەسڕین/ بە پێڵاوە قوڕاوییەکانمانەوە، بەسەر فەرشە ڕەنگینەکاندا هەنگاو دەنێین/ بە نوکی پێڵاوەکانمان لە گوڵدانی زێڕین و تاجی پادشاکان هەڵدەدەین/ وێنەی دەموچاوە ناشیرینەکانمان لەپێش جامخانەکاندا بە گەورەیی هەڵدەواسین/ داینەمیت لە ژێر کۆشک و ترومبێلەکاندا دادەگیرسێنین/ ئازیزان، ئێمە پێویستە بە خوێن و حەقیقەت قسەبکەین/ پێویستە بە خەنجەر و شیعر بدوێین/ پێویستە، لە کەڵاوەکان بێینەدەرێ و وەکو کچان، شەرمنەکەین/ وەک منداڵە کۆتربازەکان بازبدەینە ئەودیو دیواری کۆشکەکان و لە پێخەفە نەرمەکانیاندا سەریانبڕین.

## ١١

خۆشەویستم. چەند بێوەفایت/ هەناسەی سوور و برۆ خوێناوییەکانی منت لەیاد نییە/ بەیداخی ئەو کەشتیانەت لەیاد نییە کە لە پایزدا دەمانسووتان و دەمانگووت/ ئیدی چیدیکە کۆچ ناکەین/ بۆ تۆ بوو ئەی

خۆشەویستم، بۆ تۆ/ وەکو سەرخۆشێک، سەمامدەکرد/ بۆ تۆ بوو لەژێر سێبەری منارەکاندا پارەم دەژمارد/ بۆ تۆ بوو، بۆ ئەو قژە ئاڵۆزکاوەی تۆ بوو، وەکو جەنگاوەرە دڵسۆزەکان بە پێی پەتی/ بەنێو زۆنگاو و پێدەشتە دڕکاوییەکاندا دەڕۆیشتم/ بە قاچ یاریم لەگەڵ ماسی و قرژاڵ و کیسەڵە پیرەکاندا دەکرد/ برسیتر لە گورگە هارەکانی زستان دەملوراند/ خۆشەویستم، ئێستاکەش بۆنی ئەو نێرگزانە لە ڕووم دێت، کە لەگەڵیاندا خەوتووم/ ئێستاش ئەو دڕکانەی لە بیابان چەقیونەتە جەستەمەوە لە ڕوومەت و نێوچاوانمدا ماونەتەوە/ ئێستاش ئەو ئاسکانە خەونم پێوەدەبینن/ کە لە دارستانەکان دەگریان و من فرمێسکەکانم بە پشتی دەستم بۆ سڕین/ ئەی تۆ، کەی خۆشتدەوێم... ئەی دڵڕەق/ ئەو ڕۆژانەی کە دەنگم وەکو دەنگی پۆلیسی بەر زیندانەکانی لێهات؟/ ڕەنگم وەکو ڕەنگی کەشتییەوانە پیرەکانی لێهات؟/ کە ناوی بەرد و جۆگەلە و دارستانەکانم لەیادچووەوە؟/ ئەو کاتەی بە زگەخشێ خۆم دەگەیەنمە تابووتەکەم/ ئەو کاتە خواش دەرگای دنیاکەی خۆیم لێدادەخات/ زەویش تەرمەکەم ناگرێتە خۆی/ ئاخ، ئەی خۆشەویستم/ ئەو دەمانەش، مەگەر تەنیا من بزانم/ چەند ئەستەمە، مرۆڤ لە دۆزەخیش دەربەدەربێت.

## ١٢

خۆشەویستم، لێوی خۆمانمان داخکرد، بۆ ئەوەی یەکتر ماچ نەکەین/ سەری پەنجەکانمان وەکو سەرتەرزی مێوەکان لێکردەوە/ تا دەست لە یەکتری نەدەین/ بیر لە چ عەشقێک بکەمەوە/ چۆن ژنە لادێیەکان مەمکە چرچەکانیان، بەسەر دەمی بیرەکاندا شۆڕدەکەنەوە/ وڵاتەکەم، لوولەی تفەنگەکەی شۆڕکردۆتەوە نێو دەمم/ بیر لە چ ڕاموسانێک

بکەمەوە و پەنجەم وەکو ئاغزە جگەرەکان کورتبۆتەوە/ زمانم وەکو زمانی پاسارییەکان تا بێت بچوک دەبێتەوە/ خەمگینم وەکو تاوسێکی سپی، خەمگینم وەکو کچێکی قژزەرد/ لەسەر ئەو پێپیلکانانەی کە پڕێتی لە تف و پاشماوەی با و پوشی وەریو، دادەنیشتین/ وەکو سەربازە قژڕەشە دوورخراوەکان لەژێر پردەکاندا خۆمان دەشت/ وەکو دیل لە قەڵا دێرینەکاندا/ سەرمان دەنا یە پەنجەرەکانەوە/ دەمانڕوانییە باڵندەکان و باسمان لە تەپوتۆزی جەنگە دێرینەکان و کارتی زەردی جەژنە پیرۆزەکان دەکرد/ بە دەستوخەتە، باریکە ڕەشەکەمان/ ناوی خۆمانمان لە نێوچاوان و گەردن و زگی یەکتری دەنوسی/ لە سەرما و نەخۆشی و دزە ناوەختەکان نەدەترساین/ چەقۆ ختۆکەی ناو زگمانی دەدا/ چۆن ناو لە بیرەکاندا دەیبەستێت/ دڵمان، وەکو دڵی باڵدارە کوژراوەکان بەستبووی/ گوڵاوی باغچەکانمان دەکرد بە برینەکانمانەوە/ لەم دنیا ڕەشپۆش و ڕەنگ زەردەدا/ لەو گوڵدانە بچوکانە دەچووین کە لەسەر تاقی ماڵە هەژارەکان دادەنرێت/ لە کاتی وەرزیشدا/ مستیلەمان فرێدەدایە بنی پەرداخەکان/ ئاوێنەمان بە چڵی درەختەکاندا هەڵدەواسی و لە تورەیی خۆمانمان دەڕوانی/ ئاواتمان بۆ ئەو ڕۆژانە دەخواست/ کە بابۆڵەی هێلکەمان لە بنکی تەختەکانی قوتابخانەدا دەشاردەوە قاوغی گوللەمان دەکرد بە ملوانکە

خۆشەویستم، حەزدەکەم وەکو ئەو سوارچاکانە بمرین/ کە لە هەردە هەزار بە هەزارەکانەوە بەردەبنەوە/ بمرین و جانتاکەی پشتمان پڕبێت لە نەخشەی خەزنە نەدۆزراوەکان/ پڕبێت لە گەڵای پایزی نیشتمان/ حەزدەکەم بەسەر ئەو ئەسپانەوە بمرین کە ناڵەکانیان لە ئاڵتونی تاجی شاژنەکانە/ بمرین و یەک دڵۆپ خوێنی بچوک بە ناوچاوانمانەوە بێت/ بمرین و پرچە سپییە درێژەکانمان لەسەر جەستە ڕەشەکانمان وەک ئەڵماس بدرەوشێتەوە/ گوڵ چۆن لە ڕۆژانی شەڕ و شوڕ و هاتوچۆ

قەدەغەکردنـدا/ لـە جامخانـەی دوکانداڕەکانـدا سیس دەبێـت/ پەنجەمـان بەسـەر ئەژنۆکانمانـەوە سیس بوویێـت/ بمریـن و شـەتڵە خوێناوییەکانـی دایکمـان لـە گیرفانمانـدا بێت/ دڵـی بچکۆلـەی خوشکەکانمان، لـە سنگماندا بێت/ دەممـان پڕبێت، لـە تکـەی فرمێسکی منداڵـی گریـاو/ بمریـن و گوێمـان پڕبێت لـە تکـە و نمـەی بارانـاو.

## ١٣

پیاوکوژەکان لـە زستانێکی دیکەدا، دووبـارە دەگەڕێنـەوە/ نـەک لـە کاغـەز و شوشـە خنجیلەکانـدا/ بەڵکـو لـە لوولـەی تفەنگەکانـدا تـۆوی مێخـەک دەهێننـەوە/ دووبـارە دەگەڕێنـەوە/ دەسکی تفەنگەکانیـان پڕێتـی لـە وێنـەی ماسی، بەری دەستیان پڕێتی لە ناونیشـانی زۆردارەکان/ وێنەی دەستگیرانە ڕووتەکانیـان لەسـەر کراسەکانیان کێشـاوە/ چۆن ڕم لەسـەر دڵ دەچەقێت/ لەبـەردەم ماڵەکانمانـدا دەچەقـن/ بنکـی هـەر ددانێکیـان دەریایـەک برسێتی تیایـە/ ژمـارەی تەلەفونـی سۆزانییەکانیان لەسـەر ناوچاوانیـان نوسیووە/ دەموچاویـان وەکـو ژێـر باڵـی باڵنـدەکان پڕێتـی لـە خاڵـی ڕەش/ وەک مێروولـە بـە دیـواری ئاپارتمـان و کۆشکەکاندا هەڵدەزنێن/ پەت لە کەمەری منـارەکان گیردەکـەن و مانگـی ئاڵتونـی گومـەزەکان بـۆ سـۆزانییە پیـرەکان فڕێـدەدەن/ دەگەڕێنـەوە و ڕەنگـی جانتاکانیـان لەژێـر بارانـدا کاڵبۆتـەوە/ دەیانبینیـن... فتیلـی نارنجۆکەکانیـان لـە مەچەکیانـەوە ئاڵانـدووە/ بۆنـی ئـازادی و تینوێتیـان لێهەڵدەستێ/ لەسـەر مێـزە درێـژە گرانبەهـاکان دادەنیشـن/ لـە مەسینەی ورشـەدار و پەرداخـی کریستـاڵدا دەخۆنـەوە/ ئەوان لەبـری بـۆدرە، تۆزوخۆڵـی نیشتمانیان دەکـرد بـە منداڵەکانیانـەوە/ بـە ددان ناوکـی منداڵەکانیـان دەبـڕی/ لـە شـەوی زاوایەتیـدا، فرمێسکی

خۆشی لە چاویاندا بوو/ بە خەنجەر گرێی نافەکی خانمانیان دەکردەوە/ دەگەڕێنەوە و گیرفانیان پڕێتی لە لۆکە و دەستەسڕی خوێناوی/ بەلام چۆن ئاوێنە لە بوومەلەرزەکاندا درزدەبات، دڵیان لە حەسرەتدا شکاوە/ چۆن پیاوانی نامۆ لە شەستەبارانەکاندا/ لەژێر سیلەکاندا دەوەستن/ لەبەردەم نائومێدیدا دەوەستن و چاویان لەو پاشەڕۆژە بڕیوە کە وەکو ڕابوردووی پیاوکوژەکان پڕێتی لە خەنجەر و گوللە.

## ١٤

دەڕۆم و جێپەنجەم لەسەر قورئانە تۆزاوییەکان بەجێماوە/ دەڕۆم و چۆن بت لە شەوان لە پەرستگا دوورەکاندا جێدەمێنێت/ سێبەرەکەم لە زیندانەکاندا بەجێماوە/ دڵم وەکو زەنگێکی خوێناوی بە خوێنی باڵندەکان/ لەو شەوگارە درێژانەدا لێدەدات/ وەکو ئەو پیرەمێردانەی لە تابوتەکانیاندا بەئاگادێنەوە و بە سەرسامی دادەنیشن/ لە نێو بەلەمە شکستەکاندا دادەنیشم/ بە قامچی درێژی جەلادەکانەوە/ وەڕزم لەوەی فەرمان بۆ دۆلفینەکان دەرکەم بە دەورمدا سەمابکەن/ وەڕزم لەوەی بەم قامچییە خوێناوییە/ ڕەوە ماسییەکان، بەرەو کەنار ئاڕاستەکەم/ بێبڕستترم لەوەی ئەو باڵندانە دەربکەم، کە دەنووک لەسەر دڵم دەدەن/ چۆن تەختە ڕەشەکانی جاران خانە خانە دابەشدەکرا/ ئاوا دڵم لەنێوان پیاوخراپاندا دابەشبووە/ چۆن نیشتیمانمان ئێستا لەنێوان گوناهبارانەدا دابەشبووە/ دڵم لەنێوان گریان و پێکەنیندا دابەشبووە.

١٩٨٤

# ١

**کەی گۆڕی هاوڕێکانمان هەڵدەدەینەوە/ بۆنی زستانە دێرینەکان دەکەین/ سێبەری قامچییە شینەکان دەبینینەوە/ دەمانەوێت... ماچی کچە چاو شینەکان لەسەر گۆنایان بدزین و بینێین بە ڕوومەتمانەوە/ دەمانەوێت... مێخەکی سەر گۆڕەکانیان بدزین و لە باغچەکاندا بیرووێنین/ خەنجەری بەجێماوی دەستیان دەربێنین و توڕیدەینە ڕووبارەکانەوە/ تارماییییە زەردەکەی ئەهریمەن، ڕابگرین و سەبارەت بە گوناهەکانیان پرسیاربکەین/ لەو فریشتانە بپرسین، کە وەکو کیژە بێخەمەکان/ لە دالانەکانی مردندا دێن و دەڕۆن/ تا بپرسین چەندجار خیانەتیان لێکردوین و چەندجار لەسەر جێگای دەستگیرانەکانمان خەوتوون/ چەند جار لەسەر گۆڕەکانمان پێکەنیون/ چەند جار لەگەڵ دڵدارەکانمان ڕۆیشتون/ کەی گۆڕی دۆستەکانمان هەڵدەینەوە پڕ بە تارماییەکانیاندا بکەین/ لە شەوی ڕووتی و کڕێوەدا/ گلێنە سپییەکانیان بفڕێنین و قژە زەردەکانیان... بە گوارە و ئەنگوستیلە بگۆڕینەوە/ لێیانبپرسین، کەی بێداردەبنەوە؟/ چیرۆکی برسێتی ساڵە چلکنەکانیان بۆ باسبکەین/ ئەو شیعرانەیان بۆ بخوێنینەوە کە لەسەر دەستی خەنجەر و دەمی شمشێر و لوولەی تفەنگەکان نوسراون/ ئەو گۆرانییانەیان بۆ بڵێین پیاوە زمانبڕاوەکان گووتوویانن/ باسی جوانی دەموچاوی کیژۆڵەکانیان بۆ بکەین/ باسی بۆنی چلکنی جلەکانمان/ تا بڵێین خوێ لەسەر تاتەشۆرەکان ڕژاوە و مار لە تابووتەکاندا پەیکیخواردوە/ پێیانبڵێین، نامانەوێت بمرین/ چونکی نێو گۆڕ، وەک ژووری نوتێلە چلکنەکان پڕە لە سۆزانی و غەم/ وەکو یاری**

منداڵانی قوتابخانە پڕە لە جنێو/ پڕە لە گڤەی با و سێبەری باڵندەی مردوو/ پڕە لەو زەنگانەی لە ناکاو بێدارماندەکەنەوە/ لەو جادوگەرانەی گڕ لە دەمیانەوە دێتەدەرێ/ نامانەوێت بمرین... دەمانەوێت تەپوتۆزی نێو ئێسکەکانمان پاکبکەینەوە/ بە دەستەسڕەکەی منداڵی لکەی برسێتی لە هەناومان بسڕین/ چۆن بە نوکی چەقۆ گوللە لە دڵ دەردەهێنرێت، ترس لە ڕۆحمان دەربهێنین/ دوای ئەو خانمانە بکەوین/ کە وێنەی برا کوژراوەکانیان لە ملیاندایە، بازنی دۆستە دەوڵەمەندەکانیان لە دەستیاندایە/ نامانەوێت بمرین... دەمانەوێت گوڵی ڕەش بە یەخە سپییەکانماندا بدروین/ چونکە هێشتا خوێنی ڕەشی دوێنێ بەسەر پاکی ئەمڕۆمانەوەیە/ سەیرکەن ئێستاش دەستگیرانە چکۆلەکانمان، لەژێر کورسییەکاندا دەخەون/ پاپۆڕە خوێناوییەکانمان پاشەوپاش بەرەو قووڵایی دەریاکان دەگەڕێنەوە/ شەمەندەفەرە تورەکانمان بە خێرایی بەرەو سەردەمە دێرینەکان سەری خۆیان هەڵدەگرن.

## ٢

کەی هاوڕێ مردووەکانمان بێداردەبنەوە/ ئەو هاوڕێیانەی دەموچاویان لە گوڵی تەڕی جۆگەلەکاندا نوقمدەکرد/ لەسەر شۆستەکان دەوەستان، دەتگووت گەردنە بەرزەکانیان بە تیغ سپاردوە/ نێوچاوانیان بەو نێزانە سپاردوە کە بارانیان لێدەتکا/ خوێنێکی گەرمی سپی بە دەمارەکانیاندا دەگەڕا و دەڕژایە ژێر کێلگەکانەوە/ دەخەوتن و قژە خاوەکەیان لەسەر بەردەکان پەخشدەبووەوە/ مانگ چۆن لە گۆمە مەنگەکاندا دەردەکەوێت، لە نێوچاوانیاندا دەدرەوشایەوە/ ڕوناکی و تاریکی وەکو پەپوولە لەسەر لێویان هەڵدەفڕین/ ئەو لێوانەی تامی تیشک و تاریکیان کردبوو/

دەیانزانی با لەکوێوە هەڵدەکات و بەفر لە چ ساتێکدا دەبارێت/ پێیاکیش گوڵێکی سوور بوو، لە گیرفانیاندا ڕوا بوو/ قەرەجی ئاورنگاوی بوو، لە دارستانەکاندا بە ڕووتی ئاگریدەکردەوە/ فرمێسکیان وەکو هەنگوینی ڕەش بەسەر گەڵای وشک و ئاوی جۆگەکاندا دەڕژا/ مورووەکانی مەچەکیان، ڕژابووە خوێنی نیچیرەکانەوە/ مەرگیش لەسەر درەختەکانەوە چاوەڕێیدەکردن/ بە دەنگێکی خوێناوی کز گۆرانیان دەگووت/ لەژێر درەختەکاندا خۆیان وشکدەکردەوە و دەگریان/ مۆمیان لەسەر هەموو چڵەکانی دارستان دادەگیرسان و دەگریان/ هەورە ڕێبوارەکانیان دەژمارد و لەسەر مەمکی کیژۆڵە خەوتووەکان دەیاننوسی/ لەسەر ئەو لێوە ناسکانە دەیاننوسی کە فوو لە چراکان دەکەن/ نێوچاوانیان پڕبوو لە چڵک و برینی سەوز/ هێندە چاویان بە شوشەی دووربینەکانەوە نووساند بوو، برژانگەکانیان هەڵوەریبوو/ هێندە، لە درزی زیندانەکانەوە هەوایان هەڵمژیبوو لێویان شین هەڵگەڕابوو

هاوڕێکانمان/ ئەو هاوڕێیانەی گەڵا بەسەر شانیاندا دەبارێت/ کەی بێداردەبنەوە/ کەی دەستمان دەنێینە ژێر ڕوومەتیان و هەتاو وەک شلەیەکی زەرد دەڕژێتە چنگمانەوە/ کەی دەستمان دەنێینە بەر هەناسەکانیان و ئازار وەک هەڵمێکی ڕەش لەسەر پەنجەکانمان دەنیشێ/ ئەوان بوون بەدوای کچی دڵنەرم و دایکی کوژراوەکاندا دەستیان بە کیسەی بەختگرەوەکاندا دەکرد/ لەبری بوک، لە جەژنە گەورەکاندا/ بەرگی ڕەنگینیان دەکردە بەری درەختەکان و تەنهایی خۆیان پێدەکوشت/ لەژێر چرا کزە زەردەکاندا/ نەخشەی ئەم زەمینەیان واڵادەکرد/ بۆ نیشتیمانێک دەگەڕان لەبەر هەتاوەکەیدا بگرین و فرمێسکەکانیان نەبێتە هەڵم/ لەژێر درەختەکانیدا، فیشەک وەک گەنم هەڵنەدراییتەوە/ باڵی پەپوولە وەکو گوڵەباغە وەریوەکان نەڕژابێتە سەر زەوی/ نیشتمانێک کەس پێویستی بە ئاوێنە و جوانی نەبێت/ دیوار بوویێتە خەونێکی

**دێرین، زنجیر بوویێتە ئەفسانەیەکی نەبیستراو/ شەو چیرۆکی منداڵان و پاییز تەنیا لە دەفتەری یادگاری پیرەکاندا بێت**

## ٣

کەی دەگەڕێنەوە/ پەشیمانی کۆرپەیەکی مردووە لەسەر کۆشیان/ تفەنگێکی پیرە لەسەر ئەژنۆیان/ چاویانبڕیوەتە، پاشماوەی ئەو مۆمانەی لە شەوە تاریکەکاندا، لەسەر دەستیان هەڵیاندەکرد/ چاویانبڕیوەتە، ناخی پڕ لە تەمی مەرگ/ کە زمان تیا ڕەشبۆتەوە و نیوچاوان وەک هەسانی لێهاتووە/ بێوەفایش چرۆیەکی ڕەشە و لە بێشکەکەوە نراوەتە سەردڵیان/ دەگەڕێنەوە و وێنەی خوشکە بچکۆلەکانیان لە لێواری سەنگەرەکاندا بەجێماوە/ وەک گوڵی سیسی سەر کورسی باغچەکان/ کاسکێتەکانیان لەسەر بەستی پەردەکان جێدەهێڵن/ دێنەوە و چیرۆکی ئەو زۆنگاوانە باسدەکەن کە بەلاشەی باڵداری مردوو... خنکاوی سەرناوکەوتوو داپۆشراون/ دێنەوە و لە کوختێکی بەجێماودا دەمرن/ کە تێیدا شەونم لەسەر بەرگی کتێبەکان نیشتووە و پەرداخەکان پڕن لە پەپوولە پاییزە/ ناگەڕێنەوە ژێر گلۆپی زەردی شەقامەکان تا بای شەوگار... پەنجەکانیان بتەزێنێ و گوڵەباغ و کزەی پوشەڵان بدات بەسەر سنگیاندا/ ئەوان دەیانەوێت بژێن و خوێنی کۆترە کوژراوەکان بڕژێت بەسەر ڕوومەتیاندا/ لە جەنگە گەورەکاندا گیرفانەکانیان پڕبکەن لە تالانی... ئەڵقەی پەنجەی سەربازە کوژراوەکان داکەنن/ لەسەر تەپۆڵکەکان ڕابوەستن و سێبەریان بە ئەندازەی بیابان درێژبوبێتەوە/ دەگەڕێنەوە... تا پەنجە بنێنە خوێنی شەهیدەکانەوە/ لەژێر پەیکەری باغچەکاندا یادگاری ڕۆژە ساردوسڕەکان

بنوسن/ بەدەم ژیانەوە بگرین و پێبکەنن/ دەگەڕێنەوە و زستانان لەسەر کورسی باغچەکان دەنوون و دەستیان پڕدەبێت لە تەرزە/ قژیان تا دەگاتە زەوی درێژدەبێت/ دەنوون و بێدارنابنەوە/ وەرزە ڕەنگاوڕەنگەکان دەڕۆن... جەنگە خوێنینەکان دەڕۆن... سەردەمە بەفرینەکان دەڕۆن/ بەڵام ئەوان بێدارنابنەوە/ کۆیلەیەتی تێدەپەڕێت، ئازادی وەک یاری لێدێت/ بەڵام ئەفسوس هەتاکو کۆتایی گەردون/ جارێکی دی لەو خەوە ئەبەدییە هەڵناسنەوە...

# ٤

دێن و شۆڕش لە دەمارەکانیاندا وەک غونچە دەگەشێتەوە/ ئەوان ئەسپە پیرەکانیان کوشت و وێنەی چاویان لەسەر گەڵای شۆڕەبییەکان و بەری دەستیان دروستکرد/ ئەی عەشق، تۆش ئەستێرەیەکی زەرد بوویت/ لە کەنار جۆگەلەکاندا دەتبینین.../ کاتێک کچە قژدرێژە بێڕەحمەکان ڕوویان لێوەردەگێڕان، سەیری تۆیان دەکرد/ کاتێک لەسەر ئەو پردانە، خوێنی جەردە کوژراوەکانی پایزیان دەسڕییەوە/ تۆ... دارستانە چڕەکانت بیرخستنەوە/ لەوێ بۆنی باڕووتی بەجێماوی ڕاوکەرەکانیان کرد/ بۆنی ئەو ئافرەتە کێویلانەیان کرد، کە قژیان تاکو سەر ئەژنۆ درێژبووە/ بۆنی خوێنی ئەو مرۆڤە سەربڕاوانەیان کرد... سەرەوخوار بە چڵی درەختەکاندا هەڵواسرابوون/ لە شەوە ساردەکاندا هەستیانکرد/ دوو لێوی گەرم نییە نێوچاوانیان ماچبکات/ دوو لێوی ناسک لە خەویان بێدارناکاتەوە/ ئەوان تفەنگەکانیان بەسەر دەریا بەرینەکاندا تەقاند و داوایان لە کەشتییە دوورەکان کرد... بیانگەنێ/ بۆ دوورگەیەک

دەگەڕان... تریفە وەک تکەی ئاو لە درەختەکانیەوە بڕژێت/ وێنەی پەپوولە، لەسەر سنگی سپی باڵدارەکان کێشرابێت/ بۆنی خەمگینی زەردەپەڕ لە جۆگەکانەوە هەڵبستێ/ مێژوو لەوێ بەلەمێکی زەردبوو، پڕبوو لە کەناری کوژراو/ پڕبوو لەو کچۆڵانەی مەمکیان وەک گلۆپی بەندەرەکان، دەکوژانەوە و دادەگیرسان/ پڕبوو لەو شمشێرانەی، وەک دەم و لێوی خەوتووەکان مێش لە کێلانیان نیشتبوو/ زەوییەک، شادی و گریان تیا تێکەڵ بووبوو/ جوانی وەک ئاگر لە ڕەگەکانیدا دەگەڕا/ کینە وەک خەو لە چاویدا دەسوڕایەوە/ ئیدی لەوێ قەڵا ڕوخاوەکانی نیشتمان نابینینەوە/ بەلەمی تاکو تەنیای ماسیگرە خەمگینەکان نابینینەوە/ کچی نامۆی ناو شەمەندەفەرە خەوتووەکان نابینینەوە/ ئیدی، ئیدی، نیشتمان خۆی... نیشتمانی کوێرەوەری و خەمی گەورە نابینینەوە.

## ٥

ناگەڕێنەوە/ با شەستەباران بڕۆیان لەگەڵ خۆیدا ببات/ وەک زەرنەقوتەی بەجێماو لە هێلانە بەرزەکاندا/ بەفر بەسەریاندا ببارێت، باش نێوچاوانیان کونبکات / ناگەڕێنەوە/ لە سەرابیتە و سەردابە شێدارەکاندا وێنەی مانگ و ئەستێرە دروستبکەن و بڵێن ئەوە ئاسمانە/ باڵندەی مۆمیاکراو و گوڵی دەستکرد ڕیزبکەن و بڵێن ئەمە دارستانە/ دەڕۆن و نێوچاوانیان پڕێتی لەو دەلاقانەی (با) پێیدا دێت ودەچێت/ بارانێکی نەرم وەک هەویر بە دەست و پەنجەیانەوە نوساوە/ نە خوێن، نە شەراب، نە ئاگر لێیناکاتەوە/ تەرزە دەدات لەسەر سنگیان و ئاو لە چاویانەوە دێتەخوارێ/ کڵاوەکانیان پڕە لە پووش و بێچووە پاسارێ

مردوو/ کەروێشک لەژێر پاڵتۆکانیان سەر دەردێنێ. تەزبیحەکانیان لە ملی ئەسپەکاندایە/ دەنگی باڵندەکانی جەنگەڵ لە گەروویاندایە بەڵام خەوتوون و لێویان، وەکو پەنجەرەی کچە عاشقەکان داخراوە/ هیچ وشەیەک هیچ گوللەیەکی کوتوپڕ/ هیچ هاوارێکی ناکاوی نابەینی درەختەکان وریایانناکاتەوە/ ئەوان مردن و ئەستێرەیەک لەسەر گۆنایان داگیرسابوو/ مردن و دەرگایەکی بچکۆلە لە نێوچاوانیاندا بوو/ بەسەر ملیونەها فرسەخی پڕ لە شەونمدا دەیڕوانی/ مردن و درانە بەر گوللەی ڕەش... بەر بارانی تێزاب... بەر هەتاوی خوێنین/ ئەو باڵندانەی لە نێواران دەترسان بەسەر سەریاندا هەڵفڕین/ ئەو کۆترانەی لە ڕەنگی خوێنینی ئاسۆ دەسڵەمینەوە، گوێیان لە هاواریان گرت/ مردن و ئەو ئەسپانەی بۆ سوارێک دەگەڕان، بۆنیان بە لاشەکانیانەوە کرد/ مردن و ئەو کچانەی لێویان وەک زیو دەبریسکایەوە، سەریان نا بەدڵیانەوە/ بۆ ترپەیەک وێڵبوون لە نابەینی دەشتە سەوزەکاندا وەک زەنگ دەنگبداتەوە/ وەک باڵندە لە قەفەزە شوشەکاندا، سنگ بسوێت لە دیوارەکان/ مردن و لە تابوتێکی ئاسندا نێژران/ پەیکەرێک لە مۆمی ڕەنگاوڕەنگ لەسەر کێلەکانیان دانرابوو/ خونچەیەک لە مس نرابووە سەردڵیان/ بیری هەور و تەم و پایزیان دەکرد/ بیری شەقامە پڕ لە سۆزانییەکانیان دەکرد/ بیری ئەو چرایانەیان دەکرد کە لەژێر باراندا دەسووتان/ بیری ئەو دروشمانەیان دەکرد کە بە خوێن نوسیبوویان/ بەڵام کەس بیری ئەوانی نەکرد/ هیچ هەورێ، هیچ پایزێ، باسینەکردن/ هیچ سۆزانییەک یادگارێکی نەگێڕانەوە/ هیچ چرایەک پەی بە لاشەکەیان نەبرد/ هیچ دروشمێ، ئاواتی نەهێنانەدی.

# ٦

لەو شەمەندەفەرانەدا کە پڕن لە ترس و تاریکی/ پڕن لە دەستی ئەو پیاوکوژانەی وەک (با) لە پەنجەرەکانەوە دێن و دەچن/ دەڕۆن و لەسەرما سوور هەڵگەڕاون/ دڵیان وەک ئەڵماسێکی سوور... سینەی پڕکردوون لە نوور/ وەکو سنەوبەرە بەرزەکان حەزدەکەن هەندێک بخەون/ وەکو چارۆکەی کەشتییەکان، حەزدەکەن (با) بدات لە قژیان/ دەیانبینیت لە گێژەڵووکەکانی هەتاودا سەرگەردانن/ لە شەوی مردنیاندا مانگ خوێنی لێدەتکا/ غونچەکان... دڵیان بۆ ئەو خوێنە کردبووەوە/ پاسارییە برسییەکان... دەمیان بۆ ئەو خوێنە کردبووەوە/ لە شەوی مردنیاندا باڵی باڵندە کوژراوەکان لە گیرفانیانەوە هاتبووەدەرێ/ بۆنی درەختە پیرەکانیان لێهەڵدەستا/ لەبری ماچ، تەور چاوەڕوانیدەکردن/ حەزیاندەکرد بڕۆن و نەگەڕێنەوە/ بڕۆن و ئەو کچانە بدۆزنەوە/ کە لەبری مەمک دوو چاوی دیکە لەسەر سنگیانە/ بڕۆن و سوار ئەو شەمەندەفەرانە ببن کە دڵۆپە باران، وەک هەرمێ بە سەرابیتەکانیاندا هاتۆتە خوار/ کە کۆتری پەشیمان لەسەر پەنجەرەکانیان نیشتووە/ فریشتەی ڕووت لە فارگۆنەکانیاندا خەوتووە/ بڕۆن و ئەو دایکانە بدۆزنەوە کە لەژێر هەتاوی کێڵگەکاندا وشکبوونەتەوە/ ئەو باوکانە بدۆزنەوە کە چاویان وەکو چاوی ئەسپە پیرەکان، پڕن لە ئاو/ بڕۆن و ئەو ئەستێرانەش پڕبکەن لە کۆشک و تاوان/ لەسەر ئەو لمە پاکیزانە بخەون/ چۆن پیسکە لیرەکانی دەژمێرێت/ لەژێر ئەو درەختە بێگوناهانەدا خەتاکانیان بژمێرن/ پیسییەکانیان بچینن، بە گوێی ئەو ڕوبارە شەرمنانەدا/ لەبەردەم ئاوێنە بێگەردەکاندا، خیانەتەکانیان

بابدەن/ تاوانەکانیان وەکو دەسکەگوڵ ڕابوەشێنن و خراپەکانیان بدەن لە یەخەیان/ دەستگیرانەکانیان لەسەر خەنجەرەکان و شیعرە گڵاوەکانیان/ لەسەر کاغەزی جگەرە و بوتڵی شەرابەکانیان... مارەبکەن/ جێژوانیشیان ژێر سێبەری قامچییەکان و سەردابی ئەشکەنجەدان بێت.

## ٧

ڕۆیشتن و کلیلی ئەو قاسانەیان ونکردبوو/ کە پڕبوون لەو یاقووتانەی، دەبایە گەردونیان لە خودا پێبکڕیبایەتەوە/ تەنیا باوەشێنێکی پووشیان پێبوو... مێشیان لە لێوە ئەستورەکانیان پێدەردەکرد/ لە قومارێکی شێتانەدا، منداڵی و ئەسپ و دەستگیرانەکانیان دۆڕان/ لەسەر مێزی قومارێکی ڕەش و لە یارییەکی کوێرانەدا/ گرەویان لەسەر پەنجەکانیان کرد و دۆڕاندیان/ گرەویان لەسەر نێوچاوانیان کرد و دۆڕاندیان/ گرەویان لەسەر برۆیان کرد و دۆڕاندیان/ هەموو شتێکیان دۆڕان، هەردوو دەست و هەردوو گوێچکە و هەردوو چاویان/ گریان لە شەبەقێکی سپییەوە لە سێبەرەکانیان دەهاتەخوار/ تارماییەک بوون... لە دەوری قومارخانەکان گریاندەخوارد/ بەخیلییان بەو ئادەمیزادانە دەبرد کە یەخەیان هەیە گوڵی لێبدەن/ پەنجەیان هەیە پارەی پێبگرن، لێویان هەیە جگەرە و مەمکی پێبمژن/ لەشیان هەیە جلی قەشەنگی بکەنەبەر/ ڕۆیشتن و سێبەرێکی ڕەش بوون... تەنیا سێبەرێکی ڕەش/ دەستەسڕەکانی منداڵیشیان دۆڕاندبوو/ وێنەیان لەسەر شوناسنامە کۆنەکانیش سڕابووەوە/ ناویشیان وەکو جەستەی مردووەکان... لە گۆڕەکاندا نوستبوو.

١٩٨٥

**ئەی ولاتم... ئەگەر فێرببومایە مار چۆن دەڕوات، وا دەڕۆیشتم/ دەمەوێت بە لەشە شێدارەکەت بگەم و لەناو برینەکانتدا پەپکەبخۆم/ لوولپێچێکم لە سەدەفەکەم بێزاربووم/ پیاوێکم دەست لە درەختەکان دەدەم و قسەدەکەم شەرمناکەم**

**کلیلی کلۆڵییەکان بەسەر سنگە ڕووتەکەمدا شۆڕبۆتەوە/ خەنجەرێک لەسەر گەردنمە و گوڵێکیش لەسەر لێومە/ پەنجەکانم دەلەرزێت و خوێن بە چاومدا دێتەخوارێ/ بەڵام بە دەنگێکی زوڵاڵەوە، بە دەنگێکی سافی وەک ئەی، قسەدەکەم/ ئەی ولاتم... هەناسەکانم بەستوێتی و گەرووم بۆتە پەرداخێکی پڕ لە بەفر/ دەڕوانم، بەرد و ئادەمیزادەکانم بۆ لەیەک جیاناکرێنەوە/ ئەم دەمامکە ڕەنگاوڕەنگانە وێڵیانکردووم**
**ناتوانم، بەم جۆرە بژیم**
**بۆیە دەبێت، ئەم لەمپەرانە ببڕم و**
**شانازی بە یاخیبوونمەوە بکەم.**

* * *

**ئەی ولاتم... لەنابەینی پەنجەکانی تۆدا، گەورەبووم**
**قەڵەمێکی بچکۆلەبووم... لە گیرفانەکانی تۆوە هاتمەدەرێ**
**سەرما شکستیکردبووم... کۆڵانە و کۆڵان دەگەڕام**
**بەڵام نەتدەبینم... ئەو مردووەت نەدەبینی کە دەمی پڕبوو لە بەفر**
**فرمێسکەکانیشی وەکو تکەی مۆم، بەڕوومەتییەوە بەستبووی... نەتدەبینیم**

چەند بەسەر دەست و داوێنتدا شکامەوە/ بە ددان بە ڕەشەباکانتدا نووسام فرێمنەدەن/ بەڵام وەکو جلکێکی تەنک بە تەنافێکی بەرزەوە با بردمی و گوێت پێنەدام/ لە دڵیشمدا هەورێکی لێڵ پیاسەیدەکرد/ هەورێک... ڕەنگیَ چلکی کیشوەرە دوورەکانی گرتبوو/ ئاە و سکاڵای کۆڵانە تاریکەکانی دەباران
لە فرمێسکی بەندیخانە و عارەقی دەستی شۆفێرەکان دروستبووبوو
خەونی بە خاکێکی شینەوە دەبینی... شین وەک جێگای مشتەکۆڵە/ خەونی بەو ئافرەتانەوە دەبینی کە لە ڕۆژانی تاعوون و قاتوقڕیدا / قاچیان دەکەنە حەوا و نەوەیەک لە کەڵەمێردان دەخەنەوە/ ئەی وڵاتم، تۆ دەیناسیت... ئەو هەورە لێڵە دەناسیت

چەندجار دەربەدەرتکردوە
بە گەردەلوول و سەرما و گەرما هەر چوار دەورت لێتەنیوە
چەندجار زمانت دەرهێناوە
وشەی ماف و خۆشەویستیت لە زاریدا بژارکردوە
چەندجار بەفرت لە ڕێگاکەیدا باراندوە تا بزانیی بۆکویَ دەچێت
ئافرەت و منداڵان و هاوڕیَ دڵسۆزەکانیت لەسەر ڕێگایدا لاداوە تا بگری و بەختیاری نەبینێت
ئەی وڵاتم، تۆ دەیناسیت
ئەو هەورە لێڵە دەناسیت
گەلێک ستەمی کێشاوە و گەلێکیشت ئازاردراوە
هەورێکی وەڕز و تینووبوو، دەیوویست دەست لە کەمەری کچان و قاچ لە زینی ئەسپ گیربکات/ لە خوا دەپاڕایەوە و ئارامی بەخۆی نەدەگرت/ دەیویست چۆن عاشق پەلاماری لێوی دەستگیرانەکەی دەدات/ پەلاماری ئەو کۆشکە بەرزانە بدات و بیانداتە بەر بروسکە/ دەیویست... چۆن

**عاشق کەمەری دەستگیرانەکەی بۆ ماچی لاردەکاتەوە/ نیشتیمان بۆ ماچێک لاربکاتەوە**
**دەیویست... چۆن عاشق سەر جەستەی دەستگیرانەکەی دەکەوێت، سەر جەستەی ئەو ستەمە بالآبەرزانە بکەوێت.**

* * *

**ئەوانەی ئێستاکە تفەنگ بەڕوومانندا هەڵدەبڕن**
**لە سالۆن و کتێبخانەکاندا... جگەرەمان لێقەدەغەدەکەن**
**ناهێڵن بچینە ئاهەنگ و سینەماکان**
**هەر ئەوانە بوون کە جاران گوڵ و بوکەشوشەیان پێبوو**
**منیش ئێستا، ئەو گوڵ و بوکەشوشانەم دەوێت**
**لە منالێمدا... ژوورەکان زنجیکی ئێجگار گەورەبوون**
**ئێستاش سەگە دڕەکانی ئەودیوی تەلبەندە گەورەکانم لەپێش چاوە**
**ئەی وڵاتم... دەترسم... ئێجگار دەترسم**
**تێر بمنێ بەسینەتەوە**
**ئەم باروت و سوراو و وەرزییە وەک ئەسید دەڕژێت بەسەرمدا و دڵم پڕبووە لە گریان**
**نازانم زێرابەکان پاک و بێگەردترن یان ئەم بازاڕانە**
**کێچ و ئەسپێی زیندانەکان... ماری پیری سەر غەزنەکان**
**بەڕەحم و بەوەفاترن یان ئەم دەلآڵ و سووخۆرانە.**
**کە لێمدەنواڕن... دەڵێی دڵم دەجوون و تفیدەکەنەوە سەر شۆستەکان.**
**بەلآم کەچی ئەوانن ئێستاکە(ئەی ڕەقیب)ـەکانت دەخوێنن**
**ئەوانن نەخشەی بازاڕ و شەقام و چارەنوست دەکێشن**
**ئێمەش وەکو سوالکەرێکی چلکن**

سووک و باریک لە دەرگاکەی پشتەوە بە پاڵ کراوینەدەرێ

* * *

ئەی وڵاتم
من ئاواتی بێ سەرەوبەرم نییە
»داوای ئەستێرەی شین و کەڵەشێری ئاڵتونم لێنەکردوویت«
نەمگووتووە...
وەکو منداڵێکی شەرمن، دەستم بگرە و بمبە بەر تاڤگەکانت
نەمگووتووە... بمبە بۆ هاوینەهەوارەکانت
ئەو هاوینەهەوارانەی
لەسەر بەرگی ڤاوغەشقارتەکان نەبێت، نایانبینم
من چیم، من ڕێبواری هەمیشەیی گەڕەکە هەژارەکانم
وەکو ژنێکی لاوازی عەبابەسەر بە فەخرەوە
سەفەرتاسی بۆ نەخۆش و گوناهبارەکانت دەبەم
تیکەکەی خۆم، وەکو جەژنانە لەنێوان منداڵە هەتیوەکانتدا دابەشدەکەم.
بەڵام سینییەک توتن و دەفتەرێک پەڕەسیگارم بەرێ
با خەمی خۆمی پێدەرکەم.
تەنەکە و باگردێنەکەی جارانم بدەرەوە
با سەرمی لەسەر بتاشم
من وەکو ئافرەتێک بەژانەوە
هەمیشە ددان لە دەستەسڕەکەم گیردەکەم و هاواردەکەم
خەونم لە دراوسێکانمان هەراسانکردووە
بەسیە ئیدی... با هێندە تەماشای ژن و کچە جوانەکانت نەکەم
با هێندە بە چاودێرەکانی شارەوانی و پۆلیسەکانی هاتوچۆ پێنەکەنم

من وەکو نوسەرانی دیکە،
داوای پەلکەزێڕینە و خەونی پەمەیم لێنەکردویت
من لە ڕۆژانی سەرمادا حەزم لە بەتانییەکی توکنە
لە ساتەکانی وەڕزیشدا عەودالّی هەوایەکی پاکم
ئاخ، ئەگەر ژوورێکی گڵ و ئەگەر چرایەکی زەردت پێدەبەخشیم
تا ماوم دەبوومە پاسەوانی ئەو شەقامە خامۆشانەت
دەبوومە ئەو پیرێژنەی لەسەر بەرماڵ دۆعای بۆدەکردیت.
دەبوومە ئەو سۆزانییە پیرەی کە چەورە و گەنجە لچقرتاوەکان پێیفێردەبن
ئەو سۆزانییەی کاتێک لەژێر کوڕێکی چواردەساڵدا دەنرکێنێ
دۆعا بۆ سەرفرازی نیشتمانەکەی دەکات
لە ڕۆژانی شۆڕش و ڕاپەڕیندا، لە پێش دەم زۆردارەکاندا
بەشاتەشات، چەمکی عەباکەی بادەدات.

❊ ❊ ❊

«ئەمشەو دەبێت وەکو ئەسپێک لە دارستان
سەر بەرەو ڕووی خوا هەڵبڕم»
ئیتر بەسە وەکو منداڵ سەرم نانێمە ناو کۆشم
وەکو مناڵ لەبەر ئاوێنەیەکی ڕووندا قژە تەڕە خەماوییەکەم داناهێنم
ناهێڵم کەس پێمبڵێت بۆ دەستەکانت وا گچکەن
وەک چۆن شەوان کچە ترسنۆکە عاشقەکان
لە دەرگا دەچن بەودیوا
بەدزییەوە ئەم کلۆڵییەم جێدەهێڵم
دێمە لاتان و مەتارە شینەکەی مناڵیم لەملمدا بەجێماوە
لەگەڵ پادشا و ئەمیرە قژزەردەکاندا، قسەناکەم

**کەس نییە دەستمبگرێت و بمباتەوە ژێر دەوارێکی سەوز**
**منێک ئێستاش نوسینەوەی وانەکانی قوتابخانەم لەسەرماوە**
**مەهێڵە قایشەکەم بکەمەوە و بە شکۆیەکی شاهانەوە**
**لەسەر ئەو خوانە ڕەنگینانە دابنیشم**
**منێک ئێستاش موفەڕکەکەی منداڵی لە مەچەکمدایە**
**مەهێڵە... وەکو کوڕە قژزەردە چاونەترسەکان**
**بۆ کچان، سەر ڕێگاکان بگرم**
**دەلێمگەڕێ، لەو کێوانە**
**لەو کێوانەی کە هەرگیز کەس نایانگاتێ**
**وەک هەڵۆیەکی خەمگینی ڕاوەستاو لە سەر کەللەسەرێک**
**بێدەنگ بە دیار باغە کوژراوەکانتەوە دەوەستم**
**تا قژم دەبێتە هێلانەی پاسارییەکان**
**تا کۆترێک لەسەر شانم نۆقرەدەگرێت**
**لەسەر بەردێک ئارامدەگرم**
**بەڵام بەر لەوەی بڕۆمەوە**
**ئەی ئەو کچەی خۆشمویستیت**
**ئەوە فرمێسکەکانم بیکەرە جانتاکەتەوە**
**ئەوە جلەکانیشم لەبەر مزگەوتەکاندا بیبەشەوە**
**ئەوە چەقۆکەشم بە دڵی باڵندەکانی گەڕەکدا هەڵیواسە و**
**لە ونبوون و بێ سەروشوێنیم مەپرسەوە**

* * *

**جارجارە دێمەوە لات... ئەوە چارەنوسمە**
**وەکو عاشقێکی سەرچڵ بەسەر دیوارەکاندا بازدەدەم**

**بێدەنگی و کپی باغچە نامترسێنێ**
**دێم و کونەپەپوویەک لەسەر شانمە و**
**شەمشەمەکوێرەکانیش دەوریانگرتووم**
**وەک چۆن باری بارهەڵگرە درێژەکان دادەگیرێ**
**لەپێش دەمی ماڵەکەتدا ئازار و خەمم دادەگرم**
**دەڵێم... شووتکرد**
**شووت بەو گەنجە کاکۆڵزێرە ڕیشپڕە چاوشینە کرد**
**ئەی من، من کە بۆنی جۆگە و مێرووی دارستانەکانم لێدێت**
**من کە دڵم وەک پاوەن دەسووتێت**
**من کە لابوور و دەفتەر و قەڵەمە بچکۆلانەکانی گیرفانم بەجێهێشت**
**من کە وەکو قوتابییەکی تەمەڵ، لەکاتی تاقیکردنەوەدا لەژێرەوە لێمدەڕوانیت**
**سەرم دادەنەواند و دەمبینیت**
**کە گوللە دەیبێژام و ئەی ڕەقیبم دەگووت**
**بیرم لە چاوە خەواڵووەکانی تۆ دەکردەوە**
**دەمزانی بە کراسێکی شینەوە چا لێدەنێت**
**دەی کە خۆت دەستی بەزەییت ئاوا کورتە**
**بە وڵاتەکەم بڵێ...**
**با هێندە دڵم نەشکێنێ**
**بەو شۆفێرانە بڵێ**
**کە وەکو تۆپ لە سەرەتای یاریدا**
**هێدی هێدی... ئەم شارەو شارم پێدەکەن**
**پێیان بڵێ... با دڵنەوایی غەریبیم بەنەوانێ**
**وەرەو بچپێنە بەگوێی ئەم نیشتمانە دڵڕەقەدا**
**و بە پەنجە باریکەکانت، نیشانەمکە.**

بڵێ ئەوەتانێ... ئەو گرۆزەی قاری لە خوا و من و نیشتمانەکەی گرتووە
منیش بێدەنگ، وەک بەردێک لە بەندەنەکاندا
وەک پەیکەرێک لە دالانی کۆشکەکاندا ڕادەوەستم
پێی بڵێ:«ئەی وڵاتم»
ئەوە کوڕەکەتە... ئەو کوڕەی وەکو ئەسپێکی لات
لەناو خەمدا گەورەبووە
چاوی لە دەستی ئاسنگەرەکانت بڕیبوو
تا نێزەیەک بۆ دڵی دروستبکەن
گەرووی خۆی دەردەهێنا و وەکو بۆری چرایەکی دوکەڵاوی دەیسڕی
تا قسەت بۆ بکات.
حەزیدەکرد
تیر بێنێیت بە سینەتەوە... کەچی تۆ دەربەدەرتکرد
بۆیە ئێستا گومڕاو وێڵە لەو دەشتانە.
کە باڵندەیەکت دەبینێ ڕادەبورێ
فانیلە دڕاوەکەی هەڵدەبڕێ و هاواردەکات
لێرەکانەم... لێرەکانە
ئەی وڵاتم...لەگەڵ بەفری زیادە و گەڵای پایزدا... بمخەرە مەزاتەوە
ئاگریم و تورەنابم لەگەڵ شتە دێرینەکانتدا بمفرۆشە
پەلمبگرە و بمدەرە دەست قەرەجییەک
یان بمخەرە پشت گالیسکەکەت
هەرکاتێک وەڕزبوویت
بمدەرە بەر قامچی
کە تینووت بوو... ئەوە دەستم
دەمارەکانم ببڕە و لە خوێنەکەم بخۆرەوە

*   *   *

**ئەی نیشتمان، ئەی بێڕەحم**
**ئەو پەنجانە... هەمان ئەو پەنجانەیە**
**کە لە دالانە ساردەکاندا دەفتەری وەرزییم پێدەگرت**
**بە چاو، بە دڵ، بە قوڕی پێڵاوەکانم شیعرم پێدەنوسییەوە**
**بەو چەقۆ گەورەیە**
**کە خوێنی گیا و بەرد و باڵندەکانی پێوەبوو**
**لەسەر کورسی قوتابخانەکان**
**لەسەر دەفتەرەکانی زانکۆم**
**لەسەر پاشەڵی ئەسپ و گوێدرێژەکان**
**لەپێش ئەو کچە تووڕانەی کە ناز بەسەر خواشدا دەکەن**
**لێم دەنوسی:**
**«ئەم بازاڕ و ئەستێرانە لابەرە... وەرزەکان ئاوەژووبکەرەوە... ڕەنگی گەڵا و ئاو و ئاسمان بگۆڕە»**
**هیچت نەکرد**
**دەتزانی حەز لە باخچە گشتییەکان و چیمەنی ناو ماڵان ناکەم**
**ڕێگای دارستانەکانت لێگرتم**
**دەتزانی حەز لە ڕەنگی حەوزی مزگەوت و بیری ماڵە هەژارەکان ناکەم**
**ڕێگای چەم و دەریا گەورەکانت لێگرتم**
**من گومڕام و ڕزگارمکە**
**وەک چۆن باڵدار، لە حوکمی تەقە دەردەکەیت**
**جاسوسی تفەنگەکان بگرە و ڕزگارمکە**

* * *

خوایە گومڕام/ من حەز لەم کیژە خرپنە ڕوومەت سوورە چاوشینانە ناکەم ڕقم لە کێژانی زانکۆ و قوتابخانە و ئۆفیسەکان دەبێتەوە/ قەرەجییەکی ڕووتم دەوێت/ پێستەکەی باران بیشوواتو جلکەکەی گەڵای درەخت و پێستی مەڕەکێوی بێت/ کۆچەرییەک نەزانێت خوا و ئاسمان مانای چی/ شمشێر و باڕووت و تانک مانای چی/ کچێکم دەوێت... لە ڕۆژانی سەرمادا/ پەنجە تەزیووەکانم بنێتە نێوان هەردوو دەستی و بە هەناسەکانی گەرمیانبکاتەوە و بڵێ مەگری/ لە گیا و ئێسکی باڵندە مردووەکان، دەرمان بۆ زامەکانی لەشم بکات/ لە شەمەندەفەر و فڕۆکە و کەشتی و بازاڕە کەشخەکاندا بۆی ناگەڕێم/ دەچم بۆ گوندی بێدەنگ و ئەشکەوتی کپ/ دەچم بۆ بەندیخانەکانی سەر سنوور/ بێدەنگ نابەینی درز و ژێر گەڵای دەوەنەکان و تەویلە و دارستانەکانی بۆ دەگەڕێم/ هەنگوین و گوێز و سرکەیی دەبەمە دیاری/ خەڵاتی پاسەوانەکان دەکەم/ تا دەرگای بەندیخانەکانم بۆ دەکەنەوە/ ئای ژن لەوێ ونەو نەناس/ لەو سێوانە دەچێت، کە دەڕزێ و فڕێدەدرێ/ بەو دارستانە دەچێ کە دوکەڵی سووتانی خۆی دەیخنکێنێ/ جوانی لەوێ وەکو ڕەنگی پەنجەرە کۆنەکان... ژەنگاوییە.../ وەک کتێبی قوتابخانە سەری ساڵان... شەوقی نییە/ دڵ وەکو جلی منداڵە چەتوونەکانە، شڕوشیتاڵی نەماوە/ غەم لەسەر ڕانی سیسیان زریکەی دێت/ لەزەت لێوی وەکو لچی قوڵەڕەشان ئاوساندووە/ ئای ژن لەوێ، وەکو زەردەواڵە بە برینی شەهیدەوە... درن و بێباک/ بەڵام خوایە، خۆ من گومڕام/ چاوم بە هیچدا هەڵنایە/ وەکو پیرێک وەهام... بیەوێت نیشانە دوورەکان بشکێنێ/ وەکو پیرێک بیەوێت بەبێ گۆچان بەسەر مردندا سەرکەوێت.



ئەی ولاتم: بیست و سێ ساڵە بۆنی خاک و مرۆڤ و لیتە و عارەقەکەی تۆ دەچێت بەسەرمدا و وەڕزنەبووم/ بیست و سێ ساڵە/ چاوەنوارم شەوێکی کپ، کچ و کوڕێکی شۆخ و شەنگ بێنەخواریێ و بۆ دوورگەیێکی سەوز هەڵمگرن/ نەهاتیت و گلەیشم لێنەکردی/ تۆش پێم دەڵێیت... خۆفرۆش و خیانەتکارم... دڵم لە بەردە بۆ خەمت... بێ ئازارم.../ من هەتا تۆزێ سەر لەشی چەقەڵەکانیشت دەپەرستم/ هەتا تنۆکە بارانی سەر دەستی منداڵەکانیشت دەپەرستم/ بەڵام بڵێم چی... گەر ڕقم لەو پیاوە تەنگ ئەستور و گومڕایانە بێت، ئەو پیاوانەی شەوی دەجار خەنجەر لە دڵی جوانی دەدەن/ ڕۆژێ دە جار کچانی ئۆفیس و نێو پاس و بەر گۆگان هەڵدەمژن/ لەدوای هەموو خامۆشبوونی لەزەتێکیشەوە/ کاتێک زریزەی پانتۆڵەکانیان دادەخەن/ باسی شەڕی چینایەتی و بەرەی گەورەی سۆشیالیزم دەکەن/ خوایە چی بکەم... ڕقم لەو کچ و کوڕ و مامۆستا گێلانەیە/ کە وەکو شەمشەمەکوێرە لە داڵان و حەوشەکانی زانکۆدا دێن و دەچن/ ڕقم لە مشک و سەرباز و گۆڤاری بێ جنێوە/ ڕقم لە ماشێنی تازە و چاوێلکەی چێوە زێڕین و خاوەن چێشتخانە و کۆگا و کاسێتفرۆشەکانە/ ئەی نیشتیمان... ئەو دەستانەم خۆشدەوێت/ کە وێنەی دڵ و تیرێکیان تیا کراوە/ ئەو کەپوانەم خۆشدەوێت، کە ئەلقەیان تێخراوە/ حەزنەکەم لە گوندێ بژێم... لەو دوورانە/ بەیانیان پیرێژنێکی چاو بە خەو هەڵمسێنێ/ کە بانگ لە کچەکەی دەکات/ هۆی نێرێ... نیرگەلێ... نێرگسێ، هەستە مەشکەکەت بژەنە و کۆڵوانەکەت بکەرە مل وا بەیانە.



ئەی نیشتمان/ لە ڕۆژانی قات و قڕیدا بیر لە باران دەکەمەوە/ من بیر لەو دونیا بێدەنگەی تۆ دەکەمەوە/ ئەو دونیایەی شەوگارانی وەکو چەقۆ... وەکو هاوار لە کۆڵانە بێدەنگەکانی نیوەشەودا دەناڵێنێ/ ئەو جەستانە... جەستەی ئەو پیرێژنە گریاوەی لە مەرقەدی شێخ و لە ماڵی هەتیوەکاندا دەناڵێنێ/ منیش هەڵۆیەکی پیرم... پشیلەیەکی مۆمیاکراوم/ جاڵجاڵۆکەیەکم لە سندوقێکدا/ قالۆنچەیەکم لە پێڵاوێکی کۆندا/ ئەویش تیشکی خەونە تەلاییەکەی تۆیە/ زرنگەی دەنگە زیوینەکەی تۆیە/ بریسکەی چاوە بڕۆنزییەکانی تۆیە/ مستێ ئاوم بدەرێ/ هەتا ماوم دەستی چەوری کرێکارەکانت دەشۆم/ تیکەیەکم پێبدە/ لەگەڵ منداڵە برسییەکانت دەیخۆم/ جوتێ چاوی شین و قژێکی زەردم بدەرێ، حەز لە کچە ڕەشتاڵە لاوازەکانت دەکەم، وەکو ڕاوکەرە پیرەکان/ کڵاشەکەم دەخەمە ژێر سەرم و دەنووم/ دەنووم تا پێغەمبەرەکان زیندوودەبنەوە و کتێبی نوێمان بۆ دێنن/ دەنووم تا پیرۆمیسۆس ئاگرە دزراوەکەی دەگێڕێتەوە/ دەنووم تا نەرسیس لە ئاو دێتەوەدەرێ.../ ئەی وڵاتم دەنووم... تا ئەم کوڕە نەفام و ڕیشن و بەدلشاوانە تاقیاندەبڕێ/ تا ئەم کچە خڕوخۆڵە پاشەڵپیسە دڵڕەقانە تاقیاندەبڕێت
خوایە... خوایە... دەنووم تا هەتاهەتایە.

* * *

هەندێ جار وا هەستدەکەم/ وەک موشەک لە شەوەزەنگدا/ وەک کچ لە ترومبیلی سەفەردا زەق و دیارم/ هەندێ جاریش وا هەستدەکەم/ وەک قورئان لە ماڵی سۆزانیدا/ وەک کاتژمێر لە دۆزەخدا بێکار و فەرامۆشکراوم/ خوایە کەی بێت لەم زێرابە ڕەش و لیخن و پیسەوە/ جارێکی تر یەکێکی تر لەدایکبێت/ لە کتێبخانە و شەقام و بەر

سینەماکاندا بۆم بگەڕێت/ یادی ڕۆژگارەکانم بکات/ ئاواتبخوازێ و حەزبکات/ ئەو کورە چاوکاڵە بچکۆلانەیە سەرلەنوێ زیندوویێتەوە/ بێت گۆڕەکەم هەڵبداتەوەو ئێسقانەکانم بژمێرێت/ کەلەسەرەکەم بگرێت بە دەستییەوە و بیلاوێنێ/ مەگەر بە تەنها ئەوکاتە/ ئا، ئەو منالە بێباکە/ لەم تاریکییە دەرمبکات/ ئەی ولاتم... گوناحی من چییە/ ئەگەر دز و شۆفیز و لانەواز و ژنە مەمک چرچەکانتم خۆشبوێت/ ئەو پیرەمێردانەم خۆشبوێت کە فرمێسکی خۆیان دەفرۆشن/ ئەو کچە بچکۆلانەیەم خۆشبوێت/ کە وەک کچی گەورەپیاوان/ حەزیان لە کراسی سوور و جلی مەخمەڵ و قەیفەیە/ حەزیان لە بۆنی عەتر و پەنجەی ئەستوری لاوخاس و لەزەتی ئەودیو پەردەیە.

ئەی ولاتم/ کوێر باڵداری پێنا پێکرێت و منیش کوێرم/ بەلام کوێریش دەزانێت/ کۆشکی سەد نهۆم و کۆڵیتی وێرانە مانای چی/ دەزانێت... شمشێرێکی لە ئارەزووی شاژن درێژتر و گەردنێکی لە پیاوەتی شا باریکتر، مانای چی

دەزانێت مانای چی

بیست و سێ ساڵ لەسەر دەستت بەناو بەفردا بڕۆیت/ بیست و سێ ساڵ، بە کامی دڵ قەپاڵ لە هەرمێیەک نەگریت/ بە دید و هوڕ لە ماشێنێکی سەوزدا شەقامەکان جەنجاڵنەکەیت/ ئەی ولاتم/ ئەم پلەکە پێچاوپێچانە فرێدە/ با پزیشک و دانسازەکان لەو باڵەخانە و جێگە چەپ و کۆلانە خەمگینانە بێنەدەرێ/ با بەندیخانەکان لەم شەقامانەدا بکەینەوە/ هەر دیلەی بە کالیپتوسێکی سەوزەوە دەبەستینەوە/ وەرە ئەی ولاتم، حەزێکی دوور و درێژ/ وەکو دوکەڵکێشی کارگە گەورەکان دروستدەکەین/ وەکو سمۆرە چۆن لەسەر دار دادەنیشێت... دادەنیشین/ تۆ چاوێلکەیەکی ڕەش و بریقەدارت لە چاودایە و پێدەکەنی/ منیش ئارەزوو

لەناو زگمدا وەکو دوکەڵ لە شوشەیەکی باریکدا... دێت و دەچێت/ ئەی وڵاتم... من ئالێرانە و تۆ لەوێ/ بمانەوێ و نەمانەوێت... خۆشەویستی یەکمان دەوێت/ تۆ پیاوێکی سمێڵ زەرد و چاوکاڵ و بازوو ئەستوریت / منیش کچێکی لاواز و بێنەوام/ خۆم بە گەردنتدا هەڵدەواسم... دەڵێم بمبە... بمفڕێنە/ بمخەرە سەر هەردوو شانت.../ ئەی نیشتمان... حەزەکەشمان هەتا بێت گەورەتر دەبێت/ دەڵێم... بمنێرە پشتی ئەسپە سورە کێوییەکەت / وەکو تاڵانی بمبە بۆ کوڕانی خێڵەکەت/ منیش پرچە ڕەشەکانم/ بەسەر سینەی تۆپزیمدا، هاتۆتەخوار / تا لەزەتی هەرچی لە خوا ترسی دنیایە دەیتەقێنم، عیشوەدەکەم/ تا بە لەزەت چاوی یاسا و شەریعەتە ئاسمانییەکان کوێردەکەم، عیشوەدەکەم/ دەی ئەی وڵاتم... بمرفێنە... بمرفێنە/ بە ڕووتی لە پێش دەمی سەرۆک و جەنگاوەرە ئازاکانتدا سەمادەکەم... ئەگەر نەمبەیت... دوا پەردەی شەرم و شکۆ دەدرێنم / دەبمەوە بە کچە چاونەترسەکانی ناو دارستان / دەڕۆم و دەبم بە هاوەڵی ئەسپ و گورگە بریندارەکان / دەبم بە دەستگیرانی سەگ و نێرە ورچە چەتوونەکان.

* * *

هیوا و خەونەکانم کۆن بوون... کۆن!/ وەکو ئەو چیتە سورانەی لە لادێ مازووی تێدەکەن/ چەند بەچەندە، چاوەنواڕی ئەو ڕۆژانەم، کە ئەم خەڵکە سادە و هێمنە توڕەببن/ چاکەتە سەوزەکەم و کاسکێتە ئەستێرە دارەکەم، بۆ ئەو کاتە هەڵگرتبوو/ بەهۆی ئەو ئاواتانەوە دەموێرا جنێو بە شاژن و ئەکتەرە چاو شینەکان بدەم/ بەڵام ئێستا لە حەسرەتدا، لەبری ڕوومەتی سووری هاوڕێکانم/ گڵۆپە تۆزاوییەکان، پاکدەکەمەوە/ لە برسا ددان لە درەخت و پایە و کورسی کتێبخانەکان گیردەکەم/

**لە تینوانـدا دەسـتی عارەقـاوی خـۆم دەلێسـمەوە/ سـوێنددەخۆم کـە خـەون و گریـان و ئازارەکانـم هەموویـان دەکەمـەوە زگـم، وەکـو ژنێکـی دووگیـان دەڕۆم/ وەکـو دایکـی شـەهیدەکان، وێنەکـەی خـۆم دەکەمـە ملـم و هەمـوو ڕۆژانێکی هەینـی/ چەپکێک گوڵ لەسـەر کورسییەکەی خـۆم دادەنێم/ لەسـەر کورسییەکەم دەنووسم/ ئالێرەدا ئـەو پیـاوە مرد، کـە خەونـی بـە گۆڕینـی دنیـا و ئازادییـەوە دەبینـی/ ئالێـرەدا ئـەو پیـاوە مـرد/ لـە سـەردەمێکدا قایمتریـن شـەرەف بـە دوو پولـی قەڵـب دەکـڕدرا/ لێوەکانـی ماچیـان لـە خۆیـان حەرامکـرد/ ئالێـرەدا ئـەو پیـاوە مـرد کـە ژیانـی خـۆی دەدا بـەو کەسـەی خەمـی بیسـت سـەدە لـە چاوانیـدا بسـڕێتەوە.**

* * *

**ئەی نیشـتیمان/ وەکو کراسـی ڕەنگاوڕەنگی کۆگاکان/ وەکو عەرەبانە سـەوزەی سـەر شۆسـتەکان خـەون و ئاواتەکانـم ڕێکدەخـەم/ وەکـو چەتـە چاوشینەکان دەیاننێـم بـە نیشـانەوە و دەیانشـکێنم/ لـە مێـژە... لـە کـۆڕی سـەفا و ڕابواردنـدا وەکـو گۆچانـی دەسـتی سـەماکەرە خرپنـەکان، هەڵیانـدەسوڕێنم/ هـەر وەکـو جلکـی بوکێنـی هەڵمگرتـن، وەکـو پـارە لـە چـاوی بەخیلـەوە خۆشمویسـتن/ دەفتـەری بچکۆلـەم بـۆ کـردن.../ لەگـەڵ پرسیاری مەکتـەب و گوڵەبـەڕۆژە و نامـەی دڕاوی دڵداریـدا، قەدمکـردن/ لـە نیوەشـەواندا کاتێـک گـورگ دەیلوورانـد و تـاقتاقکـەرە دەنگیدەهـات/ چراکـەم کـز هەڵدەکـرد و تێـر بەسـەریاندا دەگریـام/ ئـەوان بوونـە مایـەی شـەرمەزاریم/ دەڕۆم و لـە دوامـەوە وەک جـێ ماچـی خیانەتـکاران، شـوێن جێدێڵـن/ دەڕۆم و ئـەی نیشـتمان، حەسـرەتی تـۆ لـە دڵمـدا بۆتـە بـەڵا، بۆتـە دانولەکـەی منداڵـی/ لـەم دەسـتمەوە دەیکەمـە ئـەو دەسـتمەوە و دەیسـووتێنێ/ لـەم گیرفانمـەوە دەیکەمـە ئـەو گیرفانمـەوە و دەیسـوتێنێ.**



**ئەی وڵاتم/ زەمبیلەی گریانەکانم هەڵدەگرم/ لەبەر قوتابخانە وێستگەی پاسەکاندا دەیفرۆشم/ ئەی بەچی بژیم؟/ ئەی نیشتمان گەر ئومێدێکم دەسکەوێت/ لە دەستگیرانێک توندتر دەیگوژم بە خۆمەوە/ دەڕوانم و خەم بەر گەرووی گرتووە/ تازە بێهودەیە و خنکام/ هەزاران جار دەم بنێیت بەدەممەوە و ماچی ژیان ماچبکەیت، سوودی نییە/ چیبکەم، دز چۆن لە یەکەم هەڵوێستەیدا بۆ جەلادەکەی پێدەکەنێت/ بۆت پێکەنیم و گوێت پێنەدام/ پەنجەم خستە ژێر چەناگەم و ڕوانیمە برۆ ئەستورەکانت و لێتتەنواڕیم/ وەکو منداڵێکی ترساو/ لەژێر دارەکاندا نینۆکی خۆم دەخوارد و دەمڕوانی و نەتدەبینیم/ وەکو شۆفێرێکی چڵکن/ لەژێر ترومبێلەکاندا دەنوستم و خەونم بە تۆوە دەبینی/ کاتێک وەکو پاشایەکی ڕیسواکراو، بە سوار ئەسپێکی پیرەوە لەو گوندانە، دەمڕوانییە ئەودیو سنوور/ کاغەزی شیعرەکانم وەکو دووربین لوولدەکرد و لەو دونیا سەوزەم دەڕوانی، تۆم دەبینی/ کوللەم دەخستە گیرفانم و چوالەم دەدزی/ ئەی وڵاتم، لە بەری ڕەنجی تۆم دەخوارد/ باوەڕبکە لەو دەشتە چۆڵوهۆڵانە گوێم لە تەقەی ئاسنگەرەکانت بوو/ گوێم لە دیدەی ماشێنە چڵکنەکانت بوو/ وەکو گەورە کچێکی ناسک/ قژم دەخستە پشت گوێم و دەموچاوە تەڕەکەم، بەرامبەر خۆر ڕادەگرت/ بیرم لە تۆ دەکردەوە/ بیرم لە کچ و منالە بێ دایک و باوکەکانت دەکردەوە/ بیرم لە زەنگی ژەنگاوی قوتابخانە و ژنە مامۆستا قەڵەوەکانت دەکردەوە/ بیرم لە دەستەسڕی ناوچاوانی نانەواکانت و مەقەستی خوێناوی دەستی سستەرەکانت دەکردەوە/ حەزم لێدەکردن حەزم لە کچەکانت دەکرد/ کاتێک بەدەم پێکەنین و قریوەوە لەم بەری شەقامەکانەوە دەپەڕینەوە بۆ ئەویەر/**

**کاتێک دوای دەرنەچوون... دەگریان/ کاتێک بە چپەچپ، باسی دڵداری و کوڕیان دەکرد/ حەزم لێدەکردن و برسێتی قەپاڵی لێدەگرتم/ نائومێدیش وەکو چاکەتی پیاوە بۆشناخەکان بەسەرشانمدا هاتبووەخوار/ وەکو چۆن قوتابییە غەریبەکان/ بەیانیان زوو لفکە و سابوون هەڵدەگرن و بۆ خۆشتن دەردەپەڕن/ دەچوومە کتێبخانەکان/ بەو زگە برسییەوە... سەیری کڵاو و جلکی جوانی ناو کۆگاکانم دەکرد/ بەو زگە برسییەوە... دەمڕوانییە کچان لە دوکانی زەرەنگەرەکاندا/ دەمڕوانییە بەختی شوومی خۆم، لەسەر پەڕەی کتێب و لە پشتی ڕۆژنامەکاندا.**

* * *

**هەندێ جار وەکو پیاوێک لە دەنگی هەورەبروسکەکان ڕاچەنی بێت... گێژ و وڕم/ هەندێ جاریش وەکو پیاوێک لە حەسرەت و توڕەییدا پەرداخ بە ناوچاوانی بشکێنێ، هەموو دەمارەکانم لێدەدات / هەزار کیشوەر لە دوکەڵ لە گەرومدایە/ فرمێسکەکانم لە چاومدا وشکبوونەتەوە و وەکو پووش هەڵدەوەرن/ ناوچاوانم ئەم ناوچەوانەی لە دیواری کلێسە کۆنەکان دەکات/ پڕێتی لە وێنەی خاچ و هەور و ژنی ڕووت ڕووت/ ئەم زمانە چرچە دێزەم/ کە هەردەڵێی سەردەستی پاڵتۆی سواڵکەرەکانە/ ڕەقبۆتەوەوە گەلێکم نازاردەدات/ چەند جار ووتم... ئیدی چی دی قسەناکەم/ بەڵام ئەو وەکو خەنجەری لێهاتووە و دەمم پێدەکاتەوە/ ئەی وڵاتم ڕاستی دەڵێم... خەونەکانم ڕەنگی دەموچاوی دزە لاتوپوتەکانی گرتووە/ ڕەنگی دەموچاوی ئەو کچە عەبابەسەرە ڕەشتاڵانەی گرتووە کە لە پاسدا لابەلا سەیرماندەکەن/ ڕەنگی دەموچاوی ئەو پیاوە سدارە بەسەرانەی گرتووە/ کە دە کیژی ناشیرینیان هەیە و هەر دەیان مەمکیان وەکو مەترەلۆز تەقەدەکەن/ ئەی وڵاتم خەونەکانم ڕەش و لێڵن/ وەکو خەونی پیرە**

**کچێکی چل ساڵە/ وەکو خەونی پیرێژنێکی کۆماوە لە سێدارەی کورەکەی بڕوانێت/ ئەی وڵاتم... دان بە هەموو گوناهەکانی خۆمدا دەنێم لەبری ئەوەی حەز لە وەسفی باڵەخانە یان ئافرەتە ڕووتە قشتیلەکان بکەم/ حەز لە وەسفی زیندان و شۆڕەبییە سیسەکان دەکەم/ لەبری ئەوەی حەز لە باسی دەستکێشی ئاوریشم و قژی عەتراوی بکەم/ حەز لە باسی پەنجەی قرتاو و قژی ئارداوی دەکەم/ ددان بە گوناهەکانمدا دەنێم... ئەگەر نینۆکم وەکو فرمێسکەکانم درێژبوونایە/ چاوی زۆرداره نزیک و دوورەکانم دەردەهێنا/ ئەگەر قاچەکانم بە بەرتەقای ئازارەکانم درێژبوونایە/ بە خاکی تاریکیی ئەواندا تێنەدەپەڕیم/ ئەی نیشتیمان دان بە گوناهی خۆمدا دەنێم... من بۆهیمییەت و چینایەتیم تێکەڵاوکرد... خەبات و قەلەندەریم پێکەوە گرێدا... پیاسەو سەربەستی، بێئیشی و ئازادیم کرد بەیەکێک.**

* * *

**ئەی نیشتمان/ تۆبەدەکەم و چەپکێک وەنەوشەی خوێنینت بۆ دەنێرم/ بێبڕستم و وڕم/ هەردوو دەستم وەکو بەندۆڵە گەورەکان دێن و دەچن/ وەکو باڵندەیەک لە وەرزی مردنیدا... هەڵدەکورمێم/ پەنجەم لەنێو دەممدایە... چاو دەنێم بە دووربینەکانی منداڵیمەوە/ بەڵکو ڕۆژگارە دێرینەکانم... بەڵکو سەرەتای ئەم بەدبەختییە ببینمەوە/ ئەو منداڵییەی وەکو ئاو لەبەرم دەڕوات/ ئەو منداڵییەی وەکو گوللە وێڵەکان دەمپێکێت و تورمدەدات/ ڕابوردوو وەک گوڵێکی زەرد بە ناوچەوانمەوە شۆڕبۆتەوە/ منداڵی وەکو خەنجەرێک لە ئێسک و ددانی نەهەنگەکان چەقیوەتە سەر دڵم/ ئەی نیشتیمان، ئەو ڕۆژانی سەرسەختی و بەدلفاوییە چییان لێهات/ ئەو ڕۆژانەی بستێ بووم و لە فلیمە جەنجاڵەکاندا دوو کورسیم**

**لەملاولای خۆمەوە دەگرت و جگەرەم دەکێشا/ چۆن لەنێوان ئەم کتێب و وێڵبوون و گریانەدا توانەوە، چیان لێهات بۆ وەک تازە بوکێک تەمەڵ و خاو و خلیچک بوون/ ئەی خوایە... منداڵیم هەمووی ئەشکەنجە بوو/ بەڵام گەلێک لەم ڕۆژە سارد و بێڕەحمانەی ئێستاکە خۆشتر بوو/ ئێستا وەکو تۆپێک لە قەدپاڵێکدا... تلۆردەبمەوە/ وەکو سوچەڕێک لەژێر باراندا دەگریم/ هێندە تەنهام... بە ئەسپێک دەچم لە دارستان/ هیچ شتێک، هیچ هێزێک، ئەم شورای تەنهاییەم ناشکێنێ/ ترسیش وەکو پیاوێکی سیس لەودیو دەرگاوە دەمبینێ و شالاوم بۆ دەهێنێت/ عەشقیشم/ وەکو قاڵیچەکۆنەکان کاڵبۆتەوەو وەک دەستەسڕێکی تەنک دەستە خوێناوییەکانمی پێدەسڕم.**

* * *

**ئەی وڵاتم... تەنیا من ڕاستیت پێدەڵێم/ دەرمبکە، نینۆک و قژ و پەنجە و زمانم لێبستێنەوە/ بەڵام مردووەکانیشت خەون بە ڕابواردن و سەر جێکردنەوە دەبینن/ کچەکانت هەموو شەوێ وەکو غەرغەرە بە خوێناو بکەن/ لەژێر زوقمی لەزەت و باری تەنهاییدا سەربادەدەن/ ئەم شتە سەیرانەمان لێداماڵە/ وەکە چۆن دڵ و ڕەحمت لێسەندوینەتەوە/ ئەم دووربینەشمان لێبستێنە/ کە سەرمان پێدەکات بەژێر جلکی خەڵکیدا/ با بەس بینێین بە چاومانەوە و لە ئافرەت و پیاوە دوورو نزیکەکان بڕوانین/ بەهۆی ئەم چیلکە و گەڵایەوە، بوینەتە دڕندە و مشەخۆر/ ناتوانین قسە لەگەڵ یەکدا بکەین و دەست بە سەر سینە و دڵی یەکتردا بهێنین/ مەمنێ بە سینەتەوە/ ئەم سۆزە ساختە و دڵدارییە بێهودانە مانای چی؟/ پێویستیم بە عەشقێک هەیە/ عەشقێک بمهێنێتە لەرزە و لەژێر باراندا و لەسەر ئەو شەقامانە بمخاتە گریان/ بەڵام چۆن عاشق**

ببین و خەومان لێهەراسان بووە/ بەهۆی ئەوەوە ڕقمان لە ناویشە/ ڕقمان لە فرمێسکە کە دەڕژێتە سەر پەڕەی دەفتەرەکانمان/ ناتوانم... هەست بە گوناهباری و زۆرداری خۆم دەکەم/ لە حەسرەتدا مشت دەدەم بەسەر سینەمدا و چەقۆ بە زمانم تیژ دەکەمەوە.



دەلێمگەڕێ، با بگەڕێمەوە منداڵیم/ بەدوای جلکی کۆن و سمێڵی دەستکرد و تەباشیرە بچکۆلانەکانمدا دەگەڕێم/ بە دوای ئەو جێگایانەدا دەگەڕێم کە سەنگ و بەردم تیا کردوون/ بە دوای فرمێسک و جنێوەکانمدا دەگەڕێم/ بە دوای ئەو شوڵکە تەڕانەدا دەگەڕێم، کە دارکاریانکردووم.
کارتەکانی قوتابخانە دەدۆزمەوە و دەیدەمەوە بەو بەڕێوەبەرە پیرانە... با پارەکەم بدەنەوە/ ئەو پارەیەی بە منداڵی لێیانسەندووم/ ئەو داپیرانە دەدۆزمەوە کە لە بێشکەوە کچانی خۆیان دابوومێ/ بە شەق و تووڕەییەوە دەچمە ژووری و دەڵێم نامەوێت... ئەو گورگە لەشبرسی و پڕ لە ئالۆژانەم ناوێت/ ئەمجارە، حەکیمی هیچ تایەفەیەک، تووڕەییم دانامرکێنێتەوە/ تۆش، ئەی وڵاتە سپڵە و بێوەفاکە/ لە خۆتەوە هەڵمەدەرێ و قسەمەکە/ خۆ لە ناوریشم دروستتنەکردووم... لەسەرە پارچە کودەری و چەرمی جانتا شڕەکان و کەفی سەر مەنجەڵە ڕەش ڕەشەکان... دروستتکردم/ خۆ لە تەلآت نەگرتووم، بە کوللە و سیسارکەی تۆپیوو و ئاوڵە ڕازاندوتمەوە/ ئێستاش کە تووڕەبووم و ئابڕوتدەبەم/ دەتەوێت ئارامبکەیتەوە/ بەڵام تا ماوم قاچ لەم زەمینە دەخشێنم و دەگریم/ هەموو ڕۆژێک دەمپشکنی... دەست لە دڵ و ئێسک و نابەینی پەنجەکانم دەدەیت/ ئەی نیشتیمان... تاکە نهێنیەکم هەبوو/ ئەویشت پێڕەوانەبینیم و لێتسەندمەوە/ ئەی بێ خۆشەویستی تۆ چیبکەم/ بێ

خۆشەویستی تۆ... پیاوێکم لە لاستیک... باڵدارێکم لە موشەما.../ بۆ خۆشەویستی تۆ... دەستێکم بەسەر دڵەوە دەلەرزێت/ ئەی نیشتمان... سوێندبێت کە وای لێهات، دەبێ پەرداخەکەم بنێم بە دەمی برینی شەهیدەکانتەوە/ دەبێ دەستەسڕەکەم پڕکەم لە لچ و گوێی مردووەکانت/ جانتاکەم پڕبکەم لە جنێو و قسەی سووک و سووکایەتی پێکردنت و چاو بەگریان/ بچمە ڕیزی دوژمنەکانت، بچمە ڕیزی دیکتاتۆرە بێڕەحم و خوێنمژەکانت.



ئەی نیشتمان/ لە ڕۆژانی شەڕ و بێڕەحمیدا/ وەکو تفەنگ، خەونەکانمان دەکردە شان/ وەکو قوتیلەیەکی ڕەش لەژێر تیشکە کزەکەیدا هەڵدەکورماین/ خەون خەنجەرێکی زێڕینبوو/ لەبەردەم کتێبخانە و وێستگەی پاسەکاندا... دەمانکرد بەبەر پشتێنەکەماندا/ خەم... کڵاوقوچەیەکی بچوک بوو/ لە بێشکەوە کرابووە سەرمان/ گەردانەیەکی ئاڵتون بوو/ لە کاتی خۆشەویستی و ژنهێناندا یەخەی پێدەگرتین/ دەچووین بۆ جەنگ، بە نامە بۆماندەهات/ دەچووین بۆ شارە دوورەکان/ لەنێوان قەدی جلک و ژێر یەخەی کراسەکاندا لەناو گیرفانە بچکۆلەکانماندا، داماندەنا/ لە مەخفەر و بەندیخانەکاندا جێماندەهێشت/ لە بیمارستانەکاندا دەرزی خەوتنمان لێدەدا/ بۆ سبەی بەدواماندا دەهاتەوە/ ئەی وڵاتم وەکو «شا» سوار ئەو گالیسکانە دەبم/ بە دەستی چەپ جڵەو دەگرم، دەستی ڕاستیشم هەڵدەبڕم/ خەم ئەو ژنە چاوشینە باڵابەرزەیە/ لە تەکمەوە دانیشتووە/ ئەو ئەمیرە بڕۆ پەیوەستانەیە/ لەسەر ئەم گالیسکەی پوشە، ئەم گالێسکەی دڕک و داڵە... هەڵنیشتووە.

ئەی نیشتیمان... ئەوە خەمەو ئافرەت نییە/ منی پادشاش... لەجیاتی

بازیبەند دەست لەناوی زێرابەکان هەڵدەکێشم/ لەجیاتی سیپاڵی بە شکۆی شاهەنشایی/ پاڵتۆ دزراوەکەی ئەکاکی ئەکاکیڤیچ دەدۆزمەوەوە لە شەوانی زریان و بەفربارانـدا لەبەریدەکەم/ لە حەسرەت ترس و برسێتی، وەکو دیلێکی هەڵهاتوو بە ئەستێرەکاندا ڕادەکەم.

* * *

بۆ بەرگ بپۆشم/ خەڵک شانازی بە جلکەکانیانەوە دەکەن/ با من شانازی بە برینەکانمەوە بکەم/ خەڵکی بەدوای ئاراستەی با و کاتی گەردەلوولدا دەگەڕێن/ من بەدوای ئاراستەی گریانەکانی تۆدا دەگەڕێم/ بۆ ڕۆژانی شۆڕش و یاخیبوون بوو/ پەڕە پەڕە کتێبەکانم هەڵدەدایەوە/ لە فاڵچی و دەستگرەوەکانم دەپرسی/ هێندە وەڕزبووم زمانم لە چیا و دارستانەکان دەردەهێنا/ کڵاشم دەگرتە تاڤگەکان/ دەمگووت... خوایە... ئەی ئەوەی گوڵ و پەنجە... خەنجەر و دڵت دروستکرد/ ئەی ئەوەی مەترسی و دیوارت بە من ناساند/ ئەوەتا... لەسەر پشت ڕادەکشێم/ هەردوو پێم دەکەمە ئاسمان.../ کوا قامچی و حەیزەرانەکانت... کوا مامۆستا دڵڕەق و بێبەزەییەکانت/ کوا باوکە مەچەک ئەستور و دارکارییە مزرەکانت/ بۆ بەختی من ئەم ئافرەتە دەمشڕ و کچە بێڕەحمانە وا نیان بوون... من پێویستیم بە سزایە، سزایەک بمهێنێتە لەرزە/ پێویستیم بە پەتێکە هەر چوار وەرزە لەبەر چاوما بێت و بچێت/ پێویستیم بە خەنجەرێکە لەسەر دڵم ڕاگیرابێت پێویستیم بە زنجیرێکی خوێناوییە لە دەست و قاچمەوە ئاڵابێت/ ئەم پەنجە سپی و کورتانە، ئەم گوێیە سوورە نابووتە/ گەر لە ڕۆژێکی باراندا گورگ قەپاڵی لێنەگرێت... بۆچی چاکە؟/ ئەم چوارپەلە، ئەم ترومپا شکاوەی ناوی دڵە/ لەگەڵ ئالیکدا بۆ نایدەیت بە ئەسپەکان/ من بۆ چیمە... ئەم خەیاڵانەم بۆ چییە/ کە بە مسقاڵ دەمپێوێت و تنۆک

تنۆک دەیکەیتە هەناومەوە/ ئەم فرمێسکانەم بۆ چییە لەناو دێڕی کتێب و لەگەڵ کارەساتەکاندا پێمدەبەخشیت/ بۆ خەوبینین... بۆ ئاواتخواستن و خەمخواردن/ ئەم ژیانە... ئەم لاپەڕە سپیانەت پێبەخشیم؟/ نامەوێت... ئەوە دەفتەرە سپییەکانت بیبەرەوە/ ئەوە خوێنەکەت بیکەرە جەستەیەکی دیکەوە/ ئەوەتانێ، بەڵام دەشزانم... لاشەکەشم لە خۆم بەشکۆتر نابێت/ بێڕەحمانە فڕێیدەدەیتە بنکی زەلکاوەکان/ ئەی نیشتمان، لەیادتدەچێتەوە کە بەژێر باراندا دەڕۆیشتم و تەرزەی خوێناوی لێیدەدام/ بەڵام ئاسمان هەزار ئەوەندەی ئێستاکە بە ڕێز و خۆشەویستتر بوو لەلام/ منداڵێک بووم لە ڕوبار و ئەستێرەکان نەدەترسام/ بەڵام چەندە خوێنڕێژەکان بە گوللە و شریخەی تفەنگ/ دڵە بچکۆلەکەمیان ڕاچڵەکاند/ ئەوسا خوێنێکی گەرم گەرمتر لە سرودی ڕۆژانی شەڕ، بە دەمارەکانمدا دەگەڕا/ زەبروزەنگ و شەق و شولاق... کتێبە ڕووزەردەکانی قوتابخانە... هەڵیانوەراند/ دەمتوانی وەکو ئەسپێکی ڕەسەن ڕێگا دوور دوورەکان ببڕم/ وەکو بروسکەیەکی تووڕە لە شەوە بێدەنگەکاندا ئاگر بگرم/ وەکو هەڵچوونی یەکجارەی پۆلێ باڵدار/ لە یەکجاردا، شیعر بڵێم، خەمبخۆم و ئازاری دونیا هەڵبگرم/ بەڵام ئێستا چۆن کچ لە دەشتە چۆڵەکاندا/ ئاوڕ لە لاشەی دەستگیرانەکەی دەداتەوە/ ئاوڕ لەو ڕۆژگارە پڕ لە جورئەتانە دەدەمەوە/ چۆن کەشتی ئاوڕ لە بەندەرەکان دەداتەوە/ چۆن باڵندە لە ئاسمان و بەرزە بەرزانی دونیاوە لە دارستانی گڕگرتوو دەڕوانێت/ دەڕوانم و فرمێسکەکانم وەکو تۆپەڵە بەفر، لە چنگمدا گرمۆڵەکردووە/ دەڕوانم و ناوقەدی گێلاس و مار و توتڕکەکانم بە تووڕەییەوە گرتووە/ دەڕوانم و سەرم وەکو منداڵە ترسنۆکەکان بەرەو ڕووت بڵندکردۆتەوە و تکادەکەم:

بەس وەکو ئەو پیاوانەی لە داڵانە تاریکەکاندا بەفری سەر پاڵتۆکانیان دەتەکێنن، خەون و ئاواتەکانم بتەکێنە/ بەس وەکو ئەو سۆزانییانەی فوو لە جگەرەی دەستیان دەکەن، فوو لە عومر و ژیانم بکە.

* * *

لەمڕۆ بەدواوە بەبێدەنگ/ وەکو ئەو ئافرەتانەی کە لە درزی دەرگاوە سەیردەکەن... سەیرتدەکەم/ کچ چۆن لە بەردەمی ئاوێنەدا/ مەرهەمی سپی لە برین و پەڵەکانی دەموچاوی دەدات/ مەرهەمدەدەم لەو چاڵانەی کە موشەک و تۆپبارانی بێڕەحمانە دروستیانکرد/ مەرهەمدەدەم لەو پاوەنە سووتاوانەی کە ئێستاش ڕەش دەچنەوانێ/ ئەو ئەسپ و مشک و مارانەت دەپەرستم/ بەس نییە لە نێوان دەمارو برین و خوێناوەکەی تۆدا دەژین/ ئەو مۆمە سوورەشم خۆشدەوێت/ دەینێیت بە کیسەی نهێنییەکانتەوە/ ئەو تفەشم خۆشدەوێت کە پیرە پیاوێکی کەنەفتە جگەرەکەی پێلۆکدەکات/ ئەو پەنجانەشم خۆشدەوێن/ کە لە دوکانی سوخۆر و کوتاڵفرۆشە سپڵەکاندا/ بە شکستی بۆ پەڕەی قەرزەکەی خۆیان دەگەڕێن/ ئەو پەنجانەی لە کۆڵانە تاریکەکاندا بۆ تارمایی ڕۆژانی کۆن، بۆ پارەی ونبوو دەگەڕێن/ گۆڕستانەکانتم خۆشدەوێت/ لە عەشقا بوو شیعری سەر گۆڕی کوژراوەکانتم لەبەردەکرد/ وەرە لێمبپرسەرەوە... لە ڕیزی قوتابخانەدا دەرمبهێنە/ کە میوانێکی بەشکۆ هات/ چەپکێ گوڵم بدەرە دەست با ئەو شیعرانەی بۆ بڵێم/ بەڵام... دەزانم... دەستنادات/ لە کۆڕ و بەزمە گەورەکاندا... لەو ئاهەنگانەی کە سەرۆک و شالیارە زیتەڵەکان تیا بەشدارن/ لەو شەوە ڕەنگاوڕەنگانەدا کە ئافرەت مرواری دەکەنە گوێ و گەردانەی ئەڵماس لەملدەکەن/ من هەستم، شیعری تەعزێبارانەی دایکە پیرەکان بخوێنمەوە/ هەستم وەکو کچە برا کوژراوەکان، بۆ مەرگی گەلاکان شیوەنبکەم/ دەلێمگەڕێ... با هەر لەم کۆلێت و کوختە داڕوخاوانەدا بژیم/ نەهێلێت... لە جێگای ئاهەنگ و کەیفەکانت نزیکببمەوە، هەتا ئەگەر لە نزیک شاییەکی بچکۆلەی ماڵێکی گوندنشینەوە سوسەتکردم/

**وەرە، دەستمبگرە و بە قسە بمخلافێنە... خۆت دەمناسی چەند گرۆزم/ دەگریم و ژێر نابمەوە/ بەلام بە قسەمنەکەیت، بە پەند و ئامۆژگاری بملاوێنە... بە قسەی خۆش خافڵمکە/ تا شایی کۆتایی پێدێت/ بەزم و خۆشی، تەواودەبێت/ ئەوساش وەکو پیرە دارێک لە گردێکی ڕووتەڵدا... بەجێمبهێڵە با سەوزبم/ با بۆ زگە برسییەکانت گوێژێکی زەردی گوپن... تورەکەیەک بەڕوو بگرم.**

❊ ❊ ❊

**چەند بێڕەحمی/ لاشەکەمت لە نابەینی چنار و شۆڕەبیدا دۆزییەوە/ چۆن ئەسپی تۆپیو دەبەستن بە ماشێنێکەوە و فڕێیدەدەن، وا فڕێتدام/ هەفتە، خۆ قەمە خوێناوییەکان و گوللە و جنێوەکانت دادتنادەن/ من کە سەرداب و تونێل و قموچە نهێنیەکانتم بۆ دەسڕیت/ من کە تفی خۆم لە شوشە دەنا و هەڵمدەگرت بۆ ڕۆژی ڕاپەڕینەکانت/ هێندە بەبێدەنگ دەگریام/ هەتا فرمێسکەکانم بەدەست دەکردەوە چاوم/ ئەبا هەستبکەی کە دەگریم/ من ئەو کوڕەم کە قاچم لە لم و خۆڵەمێشی کوورەکانت دەخست/ بۆ ڕۆژانی شایی و سەما بەدوای مرواری و پشکۆدا دەگەڕام/ لەسەر تەنوور، بەرهەڵبێنێکم دەبەست و لەگەڵ ژنانی گەڕەکدا، نانم بۆ ماڵە شەهیدەکانت دەکردەوە/ لە کێڵگەکانتدا وەکو داڵاشێک دەوەستام/ ئەبا پاساری و باڵندەکان ڕەنجتبخۆن/ سوپاستدەکەم ئەی نیشتمان... ئەی بێڕەحم/ ئێستا پێمدەڵێیت، تەمێتدەکەم/ منێک لەوەتی هەم لە ماڵ و قوتابخانە و پۆلیسخانەکانتدا/ هەر پاشەڵم بۆ شوڵک و شەق پێڕووتدەکرێت، چۆن و بەچی تەمێمدەکەیت؟/ نا نیشتیمان... چەقۆکەش خۆم بۆت تیژدەکەمەوە... تاپڕەکەش خۆم بۆت دادەگرمەوە/ جلکەکانی خۆمت دەدەمێ بیکەرە پەتی سێدارە/ پرچی خۆمت دەدەمێ، بایدە و**

بیکەرە قامچی/ من بێباکم... من بووم بە شەو ئەو فیشەکانەم دەژمارد، کە دەنران بە دڵتەوە... بە ڕۆژ هەنگاوی کچەکانتم دەژمارد لەماڵەوە تاوەکو قوتابخانە/ وەکو زانایەکی ڕێشن چاوێلکەیەکم لەچاودەکرد/ چۆن کچان بەدیار خەیات و پینەچییەکانەوە دادەنیشن/ بەدیار پەڕە و کتێب و پێنووسەکانتەوە دادەنیشتم/ بیرم لەو عاشقە ناکامانە دەکردەوە/ کە هەرگیز ئەڵقە ناکەنە پەنجەیان/ بیرم لەو منداڵانە دەکردەوە، بەیانیان دەستبەتاڵ لە نانەواخانەکان دێنەوە/ بیرم لەوە دەکردەوە/ چەند بڵاوکراوەی نهێنی لەژێر قەفی پشتێنەکانتدا هەڵگیراوە/ چەند شۆڕشگێڕ لە وێستگەی پاسەکاندا چاوەڕوانی یەکتر دەکەن/ بەڵام ئەی نیشتمان، دەشمزانی/ ئەم هەور و چرۆ و کۆڵانانە بۆ من نین/ ئەو خانووبەرە گەورە و ماڵە خنجیلانانە بۆ من نین/ ئەم ئەسپە شینباو و نێرەکەو و سمۆرانە بۆ من نین/ سوێندی درۆ و جنێوەکانت بۆ منە/ زەردەخەنەی کچەکانت. دەستی دۆستانەی کوڕەکانت بۆ من نین/ لچ هەڵقورچان، چەمۆڵە لێگرتن، مشتەکۆڵە و شەقازلەکانت بۆ منە/ باغچە و قوتابخانە و سەیرانگاکانت بۆ من نین/ زێراب و کوخت و بەندیخانەکانت بۆ منە/ چۆن پەنجە بە دوگمەی زەنگدا دەنێیت/ ئاوا پەنجە بنێ بە نێوچاوانمدا/ وەکو چۆن سەری سندوقی یادگارەکانت لادەدەیت، سەرم لادە/ بە دەمارە تاریکەکانمدا بڕوانە/ وەکو پاسەوانی کۆشکێکی کۆن، وەکو کلیل بەدەستی سەردابی بەندیخانەکان/ یەکە... یەکە... چراکانت بۆ هەڵدەکەم/ مەشخەڵی قەد دیوارەکانت بۆ دادەگیرسێنم/ بنواڕە... چۆن گوڵاڵە سوورە هەر وەکو کێچ لەسەر مەرگم قونەدەکەن/ چۆن خەونەکانم وەکو شەکر لەسەر ئاگر دەسوتێن و ڕەش ڕەش دەبن/ بڕوانە چۆن ناونیشان لەسەر دیواری بەندیخانەکان دەنووسرێت.../ چەند دادوبێداد، چەند هاوار و فریاد لەسەر دەمارەکانم هەڵکەنراون/ ئێستا دەبێت بە ڕێگای لیتاو و زۆنگاوەکانی دڵمدا بتبەم/ وەکو چۆن پیاوی خورت و نێر قژی کچە

عاشقەکەی دەگرێت و بە زەویدا ڕایدەکێشێت... ڕاتدەکێشم/ وەرە بزانە چەند پەنجەرەی شکاو لە دڵمدایە/ چەند ساڵە دیوار و سەرابیتەکەی بۆیە نەکراوەتەوە/ چۆن پڕبووە لە دڕک و کەرتەشی و قەوزەی لیخن/ چۆن پڕبووە لە بۆقی پیشاو و سیسارکەی کەوڵکراو/ چەند هەنگ و زەردەواڵەی کوژراو بە پەردە زەردەکانیەوەیەتی/ بڕوانە... چۆن خەنجەر لە جێگای تاواندا دەکەوێت/ حەز و ئارەزووەکانم بە کراسی ڕەشی شیتاڵ شیتاڵەوە کەوتوون/ هاوەڵەکانم... وەکو وێنەی مرۆڤ لە دەفتەرەکانی منداڵیمدا/ هەر چێوەکەیان ماوەتەوە/ ڕیخۆڵەکانم... وەکو مارمارۆکەیان لە هەویر لێهاتووە/ جگەرم ڕەنگێکی سووری ڕژاوە/ سییەکانیشم بوونەتە دوو مووتاپی پڕ لە فیشەک/ بەڵام هەزار هێندەی ترم لێبێت/ بشبمە گەرد، تۆم خۆشدەوێت/ ئەوە پەنجەکانمە/ چۆن گەڵا دەنرێتە نێوان دەفتەرەوە/ بمنێرە نابەینی وەرزەکانتەوە/ ئەوە دەستم وەکو تێڵایەکی چڵکن/ لافیتەکانتی پیاداکووتە/ ئەوە پێستەکەم وەکو کاغەزێکی بلوور/ نامەی لەسەر بنوسە و قەدیکە/ یان وەکو پێستی پڵنگێکی کوژراو بیکەرەوە/ کاتێک گەڕاینەوە بۆ ئەو ڕۆژگارە دوورانەی لە تەشتدا خۆماندەشت/ بیکەرە پەردە بۆ کچە عازەبەکانت/ بیکەرە خاولی بۆ منداڵە بچکۆلەکانت/ بیکەرە دەستەسڕی بچوک بچوک، بۆ فرمێسکی چاوی کورە بێنەواکانت.

* * *

دەنگووت/ وەکو ئەسپێک، تا بنهەنگڵ/ پێی لە ناو لمدا چەقیبێت/ نابزوێم و لەسەر زگ خۆم ڕادەکێشم/ بەڵام نمەک بەحەرام نیم... ڕاستی دەڵێم/ ئەو هەڵۆ پیرانەت سەودای فڕینیان پێدامەوە/ ئەو پاسارییە بچکۆلانەت فێری قونەیان کردمەوە/ وەکو سەگێک لەو هەردانە دوای هەڵهاتووەکان

**کەوتبێت/ بۆن بە جۆگە و دارستانەکانتەوە دەکەم/ وەکو بزنێک بیەوێت گەڵا بەرزەکان بخوات/ هەڵدەستمە سەرپێ و بۆنی سینەت دەکەم/ بۆ ئەی نیشتیمانم... بۆ؟/ بۆنەکەت بە لێواری مزگەوت و چاخانەکاندا ڕژاوە/ چۆن بریندار... تکەی خوێنەکەی خۆی/ لەسەر بەفر جێدەهێڵێت/ بۆنی خۆت لەم ژێر پرد و سەرشەقامانە جێهێشتووە/ بۆنەکەت وەکو فرمێسک، ڕژاوەتە سەر سوراو و دەستەسڕ و ڕیشی ماشوبرنجی کەناسەکان/ بەڵام من لەژێر پێست و ئەسفەلت دا بۆی ناگەڕێم/ لەژێر برینی شەهیدەکانتەوە، بۆیدەگەڕێم/ بۆنی شێداری دارستانەکانم ناوێت بۆنی کرۆک و ڕەگە تینووەکانم دەوێت/ بۆنی پێست و لەشە سپی و سۆڵەکانتم ناوێت... ئەو لەشانەی کە شەو و ڕۆژ لە بانوێی عەتردا مەلەدەکەن/ بۆنی ئەو خەمەم دەوێت کە وەک کەروێشکە کێویلە خۆی دەکێشێت بە قەفەزەی سینگماندا/ بۆنی ئەو مەمکانەم دەوێت/ کە بە دەرزی لکاون بە سینەوانێ/ بۆنی ئەو مەمکانەم دەوێت کە بە هەرچی هێزە دەیگوشین، بۆ تۆزێک شیر و لێبنایەت/ بۆنی ئەو ڕانە مەرمەڕییە پەمەییانە حەزلێناکەم/ بۆنی ئەو ڕانانەم بدەرێ کە بۆنی زۆنگاو سەرەنوێلک و سەرتەنووریان گرتووە/ بۆنی ئەو پێیانەی قلیش هەلاهەلایکردوون/ بۆنی چرچی ئەو بێوەژنەم پێبدە/ کە بیست ساڵە لەزەت وەکو ئەژدیهایەک لە ناوەوە دەیگەزێت و هاوارناکات/ بۆنی ئەو بێوەژنە لاوازانەی، بیست ساڵە، بەیانیان لە پاسێکی کۆندا، ملی کارگە ئەگرنەبەر/ بیست ساڵە، ئێواران لە پاسێکی کۆندا، ملی ژوورە کلۆڵەکانیان دەگرنە بەر/ بۆنی قاورمە و هێزە ڕۆنەکەی جارانم بدەرەوە/ بۆنی باروتی داداشی چەتەکانم بدەرەوە/ بۆنی ئەو بوغردەم بدەرەوە/ کە لە شەوانی بەراتدا... دەمانسووتان/ هەمووی دەکەمە قەپاغی گوللەتۆپێکەوە و سەر لە نوێ بەسەر شار و ئۆردوگا و قوتابخانەکاندا دەیتەقێنم/ تا بۆنی ڕەزالەتی ژیان کاسیاندەکات/ تا بۆنی ئەم دۆزەخە و زەمهەریرە ژیانیان بیردەخاتەوە/ ئەگەر کەسیش**

**گوێی پێینەدا/ ئەوا دوو داری عود دەچەقێنمە نێو گوێچکەم، هەتا ماوم بێباک بە زێراب و لیتاو و زۆنگاوەکانتدا دێم و دەچم/ بیر نە لە ژیان، نە لە گریان نە لە مووچەی مانگانە ناکەمەوە.**

* * *

**وەکو کۆرپەیەکی زۆڵ، لە تەنیشت بەرمیلی خۆڵڕێژەکانەوە، دایاننام/ وەکو جلکی مەلەوانێکی خنکاو لەو کەنارە دوور دوورانە بێنازکەوتم/ ئەی وڵاتم ئەی قەرەجی بێسەروشوێن/ حەزمدەکرد ئازاد بژیم/ ئەوان وەکو دەستەسڕ لە چەکمەجە و چاوی دۆڵابەکاندا هەڵیانگرتم/ شیتاڵ و پەڕۆی کۆنیان لێوەپێچام، یاریان پێدەکردم/ وەڕزبووم و وەکو گورگێکی بریندار لە ئەشکەوتدا/ سەرم خستۆتە سەر دەستم/ وەڕزبووم و برسێتی بێزاریکردوم/ وەڕزبووم و دڵم پڕە لە خراپەت/ تۆ بوویت وشە ناسکەکانت لێقەدەغەکردم/ ئەو وشانەی وەکو گۆچانی کوێر دنیام پێدەناسییەوە/ چۆن گوڵ چەپکدەکرێ و دەخرێتە ناو گوڵدانەوە/ چەپک چەپک لەم سەر دەفتەرانە دەمنوسینەوەو کامەران بووم/ وەکو تەزبیح دەمهۆنینەوە و بە زمان یاریم پێدەکردن/ تۆ نیشتمانم خۆت بڵێ/ چەند ڕەنجمدا... چەند ساڵانم بێهودە ڕۆی تا فێریان بووم/ بەڵام ئێستا دەبێت/ وەکو هەرمێیەکی نەگەییو توڕیاندەمە ژێر دارەکان/ وەکو کوپەڵەیەکی زێڕ/ لەو ئەشکەوتە دووردوورانە بیکەم بە ژێر بەردێکەوە/ با نەتوانن جارێکی تر هەڵفڕن و بێنەوانێ/ با لێمگەڕێن و وەک زەردەواڵەکان دەورمنەدەن/ ئیتر بەسە... ئەی وشەی ڕزیویی سەر دەفتەر و کتێبەکان/ شادی و ڕۆژانی سەرگەرمیم زۆر لە کیسچوو بەهۆتەوە.../ ئیتر بەسە تازە زمانم توڕداوە و قسەشم لەبیرچۆتەوە**



**ئەی نیشتمان/ بەر لەوەی بڕۆم و بمرم لێتدەپرسم/ ئەم پیاو و ئافرەتە ڕەشپۆش و ڕەنگزەردانە ڕۆڵەی تۆن؟/ ئەی ئەو پیاوو ئافرەتانەی جلی ئاڵوواڵاو بریقەداریان لەبەردایە، هەر ڕۆڵەی تۆن؟!/ ئەگەر وایە، دەبێت شیشی درێژی ئەو ئاڵا چلکنەت بگرم بە دەستمەوەو وەکو چیلکەیەکی شکاو لە جەنگەڵدا، توڕیدەم/ بەڵام ناتوانیت وەڵامبدەیتەوە... ئەی نیشتیمان، تۆ ناتوانیت... دە دووربینێکم پێبدە منالێم نیشانبداتەوە/ ڕێگای کچانی قوتابخانە و دوو کۆتر تەریوەکەم ببینمەوە/ وەرە دەستبدە لە قژم، ئێستاش دڵۆپە بارانی ئەو ڕۆژانەی تیادا ماوە/ وەرە دەستبدە لە دڵم، ئێستاش ترسی ئەو ڕۆژانەی تیادا ماوە/ کە باوکم لە پەنجەرەوە تەقەیدەکرد و دوژمنەکانیشی نەوتیان بە ژوورەکاندا دەکرد/ ئێستاش ترسی ئەو ڕۆژانەم لە دڵدایە، ناو بردمی و مەلەوانە باریکەلە چاوشینەکە دەربهێنام/ ئێستاش ترسی ئەو ڕۆژانەم لە دڵدایە/ بەفر دەستوپێمی بەست و باوکم و هاوەڵەکانی لە ژوورێکی دوکەڵاوی و تەموژا لە مەرگەوە دەریانهێنام/ ئەی نیشتمان/ دەڵێی شۆفێرێکی خەواڵوویت/ لە ئاستی حەسرەت و خەممدا باوێشکدەدەیت/ بەچی ترسی ئەو ڕۆژانە لە دڵمدا دەسڕیتەوە/ بەچی وەرزی سەر مێزەکانی زانکۆ و بێتاقەتی پۆلەکانی خوێندن و باوێشکی ناو پرسەکان لە دڵمدا دەسڕیتەوە... بەچی؟**



**ئەو وەرزییە دەناسیت/ ئەو وەرزییەی وەکو سەیرانکەرێکی قژخاوی بادیهەوا بەتەنیشت درەخت و تاقگەکاندا تێپەڕدەبێت/ ئەو وەرزییەی کە لەسەر کورسی چایخانەکان بەیانیان چاوەڕێماندەکات/ بەهۆی ئەوەوەیە... بیر**

لە فتیلی داگیرساوی داینەمیت دەکەمەوە لەژێر کۆشکە بەرزەکاندا/ بیر لەو جنێوانە دەکەمەوە کە وەکو پوش وپەڵاش لە دەشتەکانی هاویندا لە زمانمدا گۆپکەدەکەن/ ئەی نیشتمان، شیعرەکانم، وەکو دۆسیەی پۆلیسخانەکانی لێهاتووە/ پڕیێتی لە وێنەی پیاوکوژان و دزی یاخی/ ئەوە چارەنوسمانە... چارەنوسی ئەو پیاوانەی کە خەم وەکو »با« بۆ دواوە دەیانفڕێنێ/ ئەو پیاوانەی لە ڕۆژگارە دوورەکان و لە ژوورە تاریکەکاندا بەسەر تەشتێکدا ملیان شۆڕدەکردەوە و سەریان دەشت/ بیرماننناکەیت کە لەژێر جێگاکاندا دەگریاین و وەڕزییش وەکو ڕم دەچەقییە سەر دڵمان/ چۆن بمانگرتبایە، لەشمان هەزار دەرگای نهێنی تیابوو... لەژێر پێستماندا، لە نابەینی پێڵوەکانماندا لە گیرفانە بچکۆلەکانی ناو سینەماندا/ خۆی دەشاردەوە/ وەرە سەیری دەست و پەنجەی کچەکانت بکە/ کاتێک کە جلکی بوکێنی هەڵدەگرن، بزانە چەندە وەڕزن/ وەرە سەیری دەستی کوڕەکانت بکە، کاتێک لە پێش دەم ئاوێنەدا پشتێنەکانیان دەبەستن/ بزانە چەندە وەڕزن/ وەرە ئەی نیشتمان/ با پێکەوە بگەڕێین و وەڕزیت نیشانبدەمەوە/ چۆن دوو دڵدار لە شەقامێکی جەنجاڵدا دەناسمەوە/ وا لە سەروسیماکاندا دەیناسمەوە/ چۆن گوێم لە دەنگی ئافرەتێکە لە باڵەخانەیەکی بەرزەوە هاواربکات/ لە نابەینی دەنگی تریقە و قاقاوە گوێم لێیەتی/ بەلام بێسوودە و ناگیرێت/ ئەگەر بگیرابایە چۆن لە داڵان و ژوورە خەمگینەکاندا دوای پاسارییەکان دەکەوین دوایدەکەوتم/ بەلام بێسوودە و ناگیرێت... بێسوودە/ لەسەر ئەو چەرچەفە شینەی بە ئەتەمینی زەرد و وەڕزیی خوشکەکانم چنراوە/ لەژێر درەختەکاندا لێیدەخەوم/ لەبری پەڕ، سەرینەکەم پڕیێتی لە گەڵای پایز/ پڕیێتی لە سەرەسۆدە و پەڕەی دڕاوی شیعر/ ئا لەویادا دەمرم و لەشم وەکو جلی بۆیاخچییەکان پڕدەبێت لە برینی ڕەنگاوڕەنگ/ ئیتر یادی ئەو میللەتە برسییەت ناکەم/ کە لەبەر دوکانی بەقاڵ و نانەوا و چێشتخانەکاندا

چاوەڕوانن/ یادی ئەو کتێبانە ناکەم/ کە هێندە تەماشامکردن، پشتم بەسەریاندا چەمییەوە/ وەکو سەرکردە خائینەکان دەمرم/ وەکو دزێک هاوەڵەکەی پێکابێتی، سووک و ڕیسوایانە دەمرم/ هێندە وەک کەو سەرم لە قەفەزەکەم دەرهێنا و ڕوانیمە کۆشکە بەرزەکان/ ئەو کۆشکانەی شەرمیان لە چاوە هەوەستبازەکانم نەکرد... تا تورەبوویت/ باشە... با نەمرم/ ئیتر سەیری شەقامە پێخاوسەکان دەکەم/ ئیتر چاو لە سەرابیتە داڕوخاوەکان دەبڕم/ ئیتر نایەمە بەر کۆگاکان و دوکانی سەرسوچەکان دەگرم/ بەڵام چۆن دوکانداران لەسەر پشتی زەرفەکانیان، پارە کۆدەکەنەوە/ ئازارەکانم کۆدەکەمەوە و بۆتدەنێرم/ ئازارە ژەهراویەکانمت بۆ دەنێرم... فرمێسکەکانمت بۆ دەنێرم/ کە هەر دڵۆپێکی سەدان شکستی تیا نوسراوە/ خەونەکانم وەکو نەخشەکانی قوتابخانە وەکو فەرشی هەڵگیراو لە هاویندا/ لوولدەکەم و بە پەیامنێرێکی بێبەرگ و برسی و ڕووتەڵدا بۆت دەنێرم/ لە ژوورسەری پادشاکانتەوە هەڵیانواسە/ لە ئەنتیکەخانەکاندا هەڵیانگرە و لێیبنووسە، ئەمانە خەمی منداڵێکن لە ڕۆژهەلات.

* * *

پەنجەکانم پڕێتی لە وشە و مستیلە و تورەیی/ بێباکم... شقارتە بە پێڵاوەکانم دادەگیرسێنم/ من پادشایەکی بریندارم، خوێنەکەم بەسەر مەرمەڕی کۆشکەکاندا هاتۆتەخوار/ نەخشە و مۆرە شاهانەکانم هەڵدەگرم و دەڕۆم/ دۆسیە و پەڕەی خیانەتەکانم هەڵدەگرم و دەڕۆم/ پێڵاوەکانم باشترین سەرینی شاهانەن/ جبەکەم بدەنە سۆزانییەکی شارەزا/ شمشێر و خەنجەرەکانم بدەنە مۆزەخانەکان/ دەستگیرانەکانم بنێرنە تیاترۆخانەکان/ زوڵمیان دەرهەق مەکەن/ لەشیان پێخەفی شاهانە بوو/ دەی وێنەکەم لەو

دیوارانە داگرن و پارچەپارچەیکەن/ بچوکترین عەرەبانەی لاکۆلانان لە کەژاوەکەم پیرۆزترە/ منیش بڕیاری خۆم داوە/ لەگەڵتاندا، دادەبەزمە سەرجادەکان... لەگەڵتاندا، دەستدەکەم بە خۆپیشاندان/ ئەمە چ ئاهەنگێکە... بێدەنگی دارستانەکان گوڵ ئاوارەدەکات/ بێدەنگی ئاسمان ئەستێرەکان خاپووردەکات/ بێدەنگی حەقیقەت باڵندەکان دەکوژێت.

١٩٨٣

# کاتێک دابەشدەبم

کاتێک دابەشدەبم، دەستێکم لەژێر ئەم درەختانەدا دەگری... دەستێکم دەچێت بۆ دۆعای ژێر باران... هەناسەیەکم دەچێت بۆ باغەکانی خودا... هەناسەیەکم دەچێت بۆ گەردەلوول و ڕەشەبا... دڵێکم دەبێتە زێوان لە نەیساپور... دڵێکم دەبێتە عاشق لەسەر سەنگی سەبوور.

کاتێک دابەشدەبم، لە نێوان خۆم و خۆمدا وەفایەک نامێنێتەوە
لە نێوان خۆم و خۆمدا گرێیەک... پردێک... سەلامێک نامێنێتەوە.

کاتێک دابەشدەبم، هەر دڵۆپێکم دەچێتە نیگایەکەوە، هەر دەستێکم دەچێتە جەستەی دەریایەکەوە، هەر وشەیەکم دەچێتە ناو هاواری شەوێکەوە، لە هەر جێگایەک نور شکا، پارچەکانی منی تیام، لە هەر جێگایەک ئاو مرد، لە خنکانیدا منی تیام. من کاتێک دابەشدەبم، دەچمە ناو بروسکەوە... دەچمە ناو گڕە کۆنەکان... دەچمە ناو خوێندنی بولبول... دەچمە ناو یاقووتی فرمێسک، مەرجانی غەم، ئەڵماسی زام. من بەسەر ئاینەکاندا دابەشدەبم، بەسەر خوداوەندە کۆنەکاندا، بەسەر زیاد لە نوێژێک و زیاد لە زەکاتێکدا دابەشدەبم، بەسەر یەقین و نایەقیندا، بەسەر دڵی زاهیدەکان و زەندیقەکاندا دابەشدەبم...
من بەسەر دەوڵەتەکاندا دابەشدەبم، بەسەر دەرباری پاشا و ماڵی ئەمیرەکاندا، بەسەر پیلانی وەزیر و خوێنی سوڵتانەکاندا، بەسەر تەزبێحی والی و خەندەی حوکمدارەکاندا، بەسەر شانی کۆیلە و زنجیرەکانی

زیندان و ددانی شاسوارەکاندا دابەشدەبم، بەسەر جەنگەکاندا، بەسەر کەلاکی بۆگەنی یاخییەکاندا، بەسەر ڕاوشکاری ئەمیر و بەسەر برینی نێچیرەکاندا دابەشدەبم
بەسەر ژوورکاندا دابەشدەبم، بەسەر پەنجەرەکاندا... بەسەر درەخت و باڵندەو گوڵەکاندا دابەشدەبم

بەدبینم و خۆم ئاوێتەی خۆشبینی دەکەم
ڕەشم و خۆم تێکەڵ ڕەنگینی دەکەم
تاڵم و خۆم تێکەڵ شیرینی دەکەم

بەسەر ڕوناکی سۆفییەکاندا دابەشدەبم، بەسەر تاریکی نابیناکاندا، بەسەر مۆمی داگیرساوی گوماندا، بەسەر کڕنووشی خەڵوەت و شنەی جەنگەڵەکاندا دابەشدەبم.
دە تۆش وەرەو لەگەڵما بەسەر درەختەکاندا دابەشبە
وەرەو لەگەڵما بەسەر باڵندەکاندا دابەشبە
وەرە من و تۆ لەناو یەکدا دابەشبین
وەرەو خوێنی خۆت بەسەر زامی مندا دابەشکە
وەرەو زامی خۆت بەسەر خوێنی مندا دابەشکە
باڕوناک بێت خوێنی تۆ بە دەردی من
با ڕوناک بێت دەردی تۆ بە خوێنی من

# کاتێک لە پاییزدا ونەبیت

گەر لە پایزدا لە نێوان دوو پاساریدا ونبوویت...
تۆ کە هەموو دڵت پرشنگی کریستاڵە، کاتێک لە نێوان ئاو، ئەفسانەو دەنگی زوڵاڵی جەنگەڵەکاندا ونبوویت، کاتێک لەنێوان ئەم حەرف و ئەو حەرفدا زمانی خۆت ونکرد... بچۆرە ئەم تونێلەوە کە بە باستیلی خورافەت تا ئەو سەر کردوتە بە گەلا... بچۆرە ناو ئەو شەوەو کە بە ئەستێرەی خورافەت تا ئەوسەر کردوتە بە تیشک. بزانە ئەمە کوکوختی دوا دەنگە، تائەوسەر بە دواتدا دەفڕێت... دەنگێک بە شمشاڵی خورافەت تا ئەوسەر کردوتە بە گۆرانی.

خودا لەعنەتت لێکات... گەر هەر وشەیەک دەینوسیت لە قووڵپی خوێنتەوە نەیەت
خودا لەعنەتت لێکات... گەر هەر گورانییەک دەیلێیت لە زامی گەرووتەوە نەیەت
خودا لەعنەتت لێکات... گەر هەر ڕێگایەک دەیگریت لە مەستیتەوە نەیەت
یەکێک لە زیندانی میتافیزیکیانەی خۆیدا، دەیەوێت لە دڵی پاییزدا بۆ تۆوی مردنی خۆی بگەڕێت، لە شەرمی میتافیزیکییانەی خۆیدا سەر بۆ گەلاڕێزان دادەنەوێنێت، بەلام ئەوەتا پاییز شار پڕدەکات لە پەیامی نەخوێندراوەی باڵندەکان... شار پڕدەکات لە ئیمامی لە خەزاندا خنکاو... شار پڕدەکات لە کۆتری لە گەلادا مردوو... تۆ بچۆرە ئەو کتێبە سەوزەوە

کە بە پێنوسی خورافەت تانەوسەر کردوتە بە باغ، بچۆرە ئەو خولیا ڕەشەوە کە بە بەردی خورافەت تا ئەوسەر کردووتە بە ماڵ.
خودا لەعنەتت لێکات... گەر هەر گەڵایەک دەیوەرێنیت، لەوسەر نەیهێنیتەوە ژیان
خودا لە عنەتت لێکات... گەر هەر خەیاڵێک دەیکوژیت، لەوسەر نەیکەیتەوە بە حەقیقەت
خودا لەعنەتت لێکات... گەر هەر خونچەیەک دەیژاکێنیت لەوسەر نەیکەیتەوە بە گوڵ
پاییز، تیری خۆی دەهاوێتە تیشک، ڕمی خۆی دەچەقێنێتە بەیانی... نیوەڕۆ تێشووی پڕدەبێت لە گەڵای زامدار... تۆ بە چەقۆیەکەوە پاسەوانی درەختەکانی خۆت دەکەیت... دەچێتە سەر ڕۆخە دوورەکان، لەم دیو حوکمی زەمانەوە قسە لەگەڵ پایزدا دەکەیت... لەو دیو ژاکانەوە بەگوڵی خورافەت دڵی خۆت دەشاریتەوە... لەو دیو پەژموردەگییەوە بە ئاوی خورافەت چیمەنی خۆت ئاودەدەیت.
خودا لە عنەتت لێکات... ئەوەی نایدەیتە پاییز، لەوسەر بیدەیتەوە بە دونیا
خودا لەعنەتت لێکات... ئەوەی خستە سەر ڕۆح، وەریگێڕیتەوە سەر جەستە
خودا لەعنەتت لێکات... ئەوەی کردت بە ڕەها، بیکەیتەوە بە نارەها

پاییز ئەوەیە شفرەکان بمرن و ئێمە نەیانخوێنینەوە،
ئەوەی ڕاستە نەکرێتەوە بە خەیاڵ
ئەوەی وێنەیە نەخرێتەوە سەر جەستە،
ئەوەی دوکەڵە نەبێتەوە بە ئاگر
ئەوەی تاراوگەیە نەبێتەوە بە ماڵ

# وەسێتی دیکتاتۆرێک بۆ منداڵان

زوو گەورەبن، زوو بچنە سەر مینبەرەکان، زوو فتوای کوشتنی ئەم سەردەمانە دەرکەن
بەهار بەسەوزی، باڵندەکان بە گڕەوە، خوداکان بە نورەوە بخۆن
تەورەکان بە خوێنەوە، زمانەکان بە قولاپەوە، لێوەکان بە تاعوونەوە ماچبکەن.
خێرا گەورەبن، خێرا بگەنە ئەو مەیدانانەی شەڕکەریان تیا نەماوە.
خێرا خودەی شکاوی جەهەنەمەکان لەسەرکەن، خێرا زەوی پڕکەن لە باغی باروت.
زوو دڵتان بەرزکەنەوە بۆ مەودای ئەو موشەکانەی لە پاشەڕۆژەوە دێن
گەرووتان پاکەنەوە بۆ ئەو تووتیانەی لە دەنگتاندا هێلانەدەکەن
سەرتان خاڵیکەنەوە بۆ ئەو دیکتاتۆرانەی بەیانی لە دایکدەبن
زوو پۆستاڵەکانتان بۆ ئەو ئەستێرانە ئامادەکەن کە داگیریاندەکەن
زوو ئاگر بۆ ئەو وشانە داگیرسێنن کە دەبێت بسووتێن
خێرا کلیلی جەهەنەم وەرگرن
خێرا تفەنگی ئەو ڕاوچیانە هەلگرن کە نێچیرەکانیان دەیانخۆن .
باز بۆ چاوەکانیان بکڕن... شەو بۆ ئەو خوێنەی کە بە کەڵبەکانیەوەیەتی
خێرا لە قیبلەکان وەرگەڕێن، خێرا لە قوربانییەکان تەبەڕابن، خێرا دەستنوێژەکانتان بە مردن بشکێنن. پەلەبکەن لە پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی مردندا. پەلەبکەن لە کورتکردنەوەی چیرۆکی ئەم شەونمانەدا. پەلەبکەن لە داگرتنی ئەستێرەکاندا بە فڕین لە چەرخ و فەلەکەکانەوە، دەستبەردەن بۆ گرتنی باڵندە لەسەر ئەسپەکانەوە.

**خۆر دروستکەن، تیشکەکانی لە ژێر چنگی ئێوەدا بێت. مانگ دابێنن بە مۆمەکانی ئێوە داگیرسێت. ئەستێرە دروستکەن بە فووی ئێوە بکوژێتەوە. پەلەبکەن لە گۆڕینی تامی ئاودا. پەلەبکەن لە هەڵگێڕانەوەی فڕینی کۆتردا. تا ئەندازەی سەربڕینی ساقییەکان، مەستیتان تیژکەنەوە.**

**تەماح لەو هێلانانە بکەن کە هێشتا هێلکەیان تیا نییە**
**تەماح لەو هەنگوینانە بکەن کە هێشتا بە هەڵاڵەکانەوەن**
**تەماح لەو ئەستێرانەبکەن کە هێشتا شەو هەڵینەهێناون**
**تەماح لەو ستایشانە بکەن کە بۆنیان بە حەرفەکانەوە نییە**
**تەماح لەو جەنگانە بکەن کە هێشتا میللەتەکانیان دروستنەبوون**

**تەماح لەو شەرەفانە بکەن کە هێشتا ئاسمان حەرامی نەکردوون**

**دەم لە سێو بەرمەدەن تا لە باغ پەشیماندەبێتەوە. دەم لە بولبول بەرمەدەن تا خیانەت لە بەیانی دەکات، کە دەستتان کردە فڕین، تادەرچوون لە دڵی زریانەکان مەنیشنەوە. جەنگ بۆ شەوێک، غەزا بۆ دورگەیەک، شەهوەت بۆ مەمکێک، مەزهەبی ترسنۆکەکانە. بزانن لە دوورترین سەدەفدا مرواریییەکی ئێوەی تیایە. لە دوورترین ئافرەتدا شەوێک بۆ ئێوە حەڵاڵە. لە بچوکترین مێووژدا بەشتان هەیە. لە هەموو تاوسێکدا پەڕێک بۆ ئێوەیە. پەلەبکەن لە دانانی قانونی هەڵگێڕانەوەی شەودا. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە دیوی ئەودیوی مانگ ببینن... کاتی ئەوە هاتووە لەسەر دیوە ساردەکەی خۆر یاریبکەن.**

# دەریا حاشامان لێدەکات

من ئەگەر ماڵتان لەگەڵدا بەشبکەم، هەموو سەدەفەکان دەبەن بۆ خۆتان
ئەگەر شەوتان لەگەڵدا بەشبکەم، بەشی مردنی بەلەمێک تاریکیم بۆ ناهێڵنەوە
ئەگەر بەیانیتان لەگەڵدا بەشبکەم، قومێک لە شیری سپیدەم بەرناکەوێت
ئیدی بۆ حاشا لە کەشتییەکانتان نەکەم کە خەیاڵی ئەورەس خوێناویکردووە؟
بزانن کە تورەیی هەور، برینی کەرامەتی منە
برینی هەموو خنکاوەکانی ئێوە
وەکو برینێک نییە کە بەردی کەنارەکان دەیکەنە گیانم.
گێژبوونی ئێوە بە شەپۆلەکان
کوا بە ئەندازەی گێژێتی منە بەسەیرکردنی ئەزەلی و پوچی ئاسمان؟
من هەزاران ساڵە دەست بەرزدەکەمەوە و دەستم بەر ئەستێرەیەک ناکەوێت
کەی بێهودەیی جەنگی من، بە بێهودەیی جەنگی پڕوپوچی تۆ دەپێورێت...
ئەی ئینسان؟ کەی ئەو سەرابانەی تۆ، بە گەورەیی ئەو سەرابانەی من دەپێورێت... ئەی ئینسان؟
گەڕان بەدوای نێچیرەکاندا

لەکوێن ئەو نێچیرە سپیانەی بە خوێنی چەقۆکانی خوداوە ڕایانکرد؟
گوڵەباغ هەستێنە لە خەو، تەنیا گوڵەباغی خەوتوو دەزانێت، ئەوان لە کوێن.

دەنووکی ئەم باڵندانە جگە لەهاواری ئاو هیچی تری تیا نییە... باڵندە کوا دەزانێت باسی نیچیرەکان بکات؟ تۆ ئەی ڕاوکەری ڕەش، ئەی ئەوەی هەموو شتێک دەکەیتە ئاو... کوان نێچیرەکانی من، کوان؟. ئەی بەد جنس، ئەی خراپتر لە گەردەلوول... ئەوە خوێنی کێیە، ڕۆژێک بە گیا و شەوێک بە پایز و بەیانییەک بە تەرزە و نیوەڕۆیەک بە ئاو دەیشاریتەوە؟. ئەوە سەدای چییە، شکۆفەی خوێنی خۆتی پیادەدیت؟ دەست بەرزکەرەوە ئەی ئاو، پشتبکەرە خودا، ئەی ئاو؟ لە گەشترین دڵۆپی تۆدا، دەیجور هەیە. لە سپیترین قومتدا، نور بەسەربڕاوی دەچێتە گەرووماندەوە. لە هەموو شڵپێک ئاودا، زیخی تاعوون، لمی پەتاکانی هاوین هەیە. بۆ دەڵێیت بێگوناهم و لە مەمکتا شیری کۆنی بەربەرییەکان هەیە... لە مەمکتا شیری دوێنێی حەشاشەکان هەیە؟ لۆرکی سپی ئەو زستانانەی هاوین تامیاندەکەین... شەونم هەیە کە بەیانی دەبارێت و بە شەو دەیخۆینەوە. بۆن هەیە کە بەیانی دەیناسین و ئێواران لە بیرماندەچێتەوە.

هەیهات... هەیهات ئەی ماسییەکان، ئێوە بەپێکەنینی ئەم زۆنگاوە، دەنگی چ ناڵینێک وندەکەن؟. بە شەکری بێدەنگیتان، هاواری چ بەیانییەک ڕووندەکەنەوە؟ هەیهات ئەی گەرداوەکان، بە فیشکەی ئەم سروە ڕەشانەی ئێوارێ، ئاراستەی کام ئاگر دەشێوێنن؟ لەکوێیە خوێنی دوێنێی نێچیرەکانی ئەمڕۆمان؟ لە کوێیە زامی دوێنێی زەردەخەنەکانی ئەم شەومان؟

ئەوەتا لە بەر نێچیری ڕاوکەرانی دی، ئاگری گەشاوەی نێچیرەکانی خۆم نابینم کە بە خوێنی چەقۆکانی خوداوە فڕین. بۆ زەوییەک، کە بەفری بەهار تەنیا لە بەر مۆمی پایزدا تەفسیردەکرێت. کە دڵی خاک تەنیا لەژێر ئاودا دەخوێنرێتەوە. کە نانی ڕۆژ تەنیا لە شەودا دەخورێت.

# تۆ ئەی دوژمن

**لەسەر دەستی تۆ خوێنی خۆم دەبینم. لەسەر خوێنی خۆم سایەی خودای تۆ دەبینم. دەست بۆ گەرووی من بەرە، لەسەر حەرفی من هاواری خۆت دەدۆزیتەوە. ئەو وشانەی لە دڵی تۆدا پێدەکەنن. هاوخوێنی ئەو وشانەن لە دڵی مندا دەگرین. ئەو هاوارانەی لە سینەی تۆدا دەمرن، دۆستی ئەو هاوارانەن لەسینەی مندا لە دایکدەبن. ئەو بروسکانەی لە سەری تۆدا چەخماخەدەدەن، لەسەر پەنجەکانی منەوە دێنە دەرێ. ئەو مۆمەی تۆ فووی لێدەکەیت لەڕۆحی مندا دەکوژێتەوە.**

**سەیری چاوانم بکە ئەی دوژمن، پڕە لە بێخەویی ماڵی تۆ**
**سەیری دەردم بکە پڕە لە ژانی یاسەمینەکانی تۆ.**

**من لەسەر بەرماڵی خۆم کوفری تۆ دەبینم. لەسەر کوفری خۆم یەقینی تۆ دەبینم، خوێنی من سێبەری نییە، خوێنی من بەرناگرێت، ئەگەر خوێنی من سێبەری هەبایە دڵی تۆ پڕدەبوو لە تارمایی، ئەگەر خوێنی من سەوز بایە لەشی تۆ دەبوو بە درەخت.**
**جەنگی من و تۆ فاسیلەی نێوان دوو پەپوولەیە کە لە دەوری کینەی خۆیان دەسووتێن.**
**جەنگی من و تۆ شەڕی دوو ناوێنەیە، لە ملاولای یەک جوانییەوە دەشکێن.**
**بەڵام هاتوهاواری ئێمە پەپوولەی ناو قۆزاغەکان... تۆوی ناکامڵی درەخت... میوەی نەگەیووی خەیاڵی کوشت.**
**ئەی دوژمن ئێمە دوو بۆشایین شەڕ لەسەر یەک جەستە دەکەین.**

دوو چرکەین شەڕ لەسەر یەک کات دەکەین.
وریابە ئەی دوژمن خەنجەر لە هەوا مەدە... بیدە لە من
خەبەرداربە ئەی دوژمن، تیر لە سێبەر مەگرە و بیگرە ڕۆح
لە خۆری من بترسە لە بەیانی خۆتدا
وەک چۆن من لە شەوی تۆ دەترسم لە شەوی خۆمدا
بولبولی تۆ... بولبولی من... شەو دەبێتە قیامەتی گۆرانی
نەمامی تۆ... نەمامی من... باغ دەبێتە مەحشەری غونچە
لە جەستەی من دەرمەچۆ ئەی دوژمن...
تۆ بە خوێنی منەوە موبارەکیت، من بە خوێنی تۆوە بەیانیان دەرگا لە هەتاو دەکەمەوە
لە تۆوە بە زەمانێکدا دەچمە زەمانێکی تر، لە دەرەختێکەوە درەختێکی تر دەخوێنمەوە

ئەی دوژمن من باغێکم هەر دەبێت بە نێومدا ڕابووریت
ئەی دوژمن من گیایەکم هەر دەبێت لێم بخوێت

هەردووک دوو تارماییـن، لەوسەری دەشتەکانەوە دێین، یەک دڵۆپ ئاو دەدۆزینـەوە
دوو تینوین لەوسەری مردنەوە دێین، یەک تکە ژیان دەدۆزینەوە
دوو ژیانین لەوسەری بێزارییەوە دێین. یەک ڕۆحکێشان دەدۆزینەوە
من و تۆ دوو خەنجەرین، دوو زام لە دوو زەمانەوە بە دوو خوێندا دەمانبات
شەڕی من و تۆ بە یەکگەیشتنی دوو مەرگە لە ناو دڵی یەک کۆتردا
بەیەکگەیشتنی دوو دەریایە لە ناو یەک شەونمدا
شەڕی من و تۆ، شەڕی نێوان دوو چەکوشە لەسەر ڕۆحی یەک خەنجەر

**شەڕی نێوان دوو درەختە لەسەر سێبەری یەک گەڵا**
**ئەی دوژمن، تۆ پردێکی لە نێوان من و مندا. من پردێکم لە نێوان خۆت و خۆتدا**
**تۆ قەڵغانی منی، کاتێک جەنگمان دەبێتە تێڕامان لە سیحری یەکتر**
**من سوپەری تۆم کاتێک ڕەشەبامان دەبێتە تێفکرین لە مانای یەکتر**

# یادگارەکانی پیرەمێردێک

**من هێند پیرم، شەوی لە دایکبوونی زەریام لە بیرە، لە بیرمە بەیانیان لە کوێوە ئەستێرە دەگەڕایەوە بۆ ماڵ. دەزانم مانگ لە چ کوچەیەکدا گەورەبوو. تۆزی ئەو کۆڵانەم لە یادە کە یەکەم باڵندەی تیا نیشتەوە. من پیرم، یەکەم مەرەکەبم لە بیرە کە لەسەر یەکەم کتێب ڕژا. میللەتانم لە بیرە، دڵیان سەرتاپا ستایشی یەکدی بوو. مرۆڤم لە یادە دەیگووت: من قەرزاری تۆم ئەی کۆتر... من کوڕی تۆم ئەی شیری سپی بەیانیان. من شەوم بینیوە، لە تۆزی ڕوخانی گوڵدا خنکاوە... من پەنیری ڕەش، پرتەقاڵی سپی، مۆزی ئەستێرەییم بینیوە. لە شەربەتی بە جێماوی شەڕ، لە شەرابی ڕژاوی پێغەمبەرانم خواردۆتەوە. من بتەکانم پەرستووە، لە سوڕی مردن و هەستانەوەی خوداکاندا بەشداربووم. وەرزگەلێک لە ڕیزی سەربازەکانی شەیتان و وەرزگەلێک جەنگاوەری فریشتەکان بووم. من بام لەگەڵ کۆیلەکاندا سوار کەشتی کردووە. هەورم کردووە بە کفنی کوژراوەکان، عەدەنم نیشانی ئاشووبەکان داوە، حۆریم بە دیلی ناردووە بۆ ئەستانە. دەنگی تۆپەکانم ئێستاش لە گوێی زەریادا دەزرینگێتەوە. فووی جەنگاوەرانم ئێستاش لە گەشانەوەی هەموو ئاگرێکدا هەیە. من پیرم... تانزیک ڕۆما برای هانیپال بووم، تا نزیک بابل دۆستی ئەسکەندەر**

و تا نزیک بەغداد سەرلەشکرێکی بچوکی گوردانە خوێنخۆرەکانی هۆلاکۆ بووم. تلیاکم بە کەشتی بردووە بۆ چین. لە هیند میسکم بە پورتوگالەکان فرۆشتووە. لە دەوروبەری غەرناتەدا، پاسەوانی باغچە بووم. لە شایی کچە پاشاکاندا لەگەڵ زریابدا گۆرانیم گووتوە. مەسینەی دەستنوێژم بۆ ئەمیر لە دەریاوە بردووە بۆ مەکە. لە زاگرۆسەوە تیرم گرتۆتە دەروێشەکانی ئەسفەهان. چووم بۆ خوتبەکانی هارون، چووم بۆ باغەکانی هەڵەموت، لە حەمامی قاجارییەکاندا خۆمشتووە. عەترم کردووە بە نوێنی بەرمەکییەکانەوە. شفرەم بۆ قرمتییەکان داناوە. قەڵغانم بۆ بابەک هەڵگرتووە. من پیرم... من بووم شمشێرەکانی تەیمورم دەشت. من بووم بەتانییەکانی قەیسەرم قەددەکرد. من بووم بەرماڵی خەلیفەکانم دەتەکاند.

من پیرم، تۆش پیریت، ئێوەش پیرن... من لەیادمە کە چی بووم، بەڵام تۆ لەیادت نییە. من لە یادمە کە شەوەزەنگ دروستیکردووم، بەڵام حاشاکردنی تۆ لە تاریکی، نمەک حەرامییە.

من لە یادمە کە منداڵی حەرامزادەی زوڵمەتم

تۆش لە یادتە، بەڵام خۆت بە سەیرکردنی هەتاوەوە غافڵدەکەیت

لە یادتە و بە یاریکردن لە گەڵ دەریادا خۆت دەکەیت بە خواجای گوڵەکان

لە یادتە و بە سەیرکردنی درەخت، ڕەچەڵەکی خۆت لە ئێمە و باڵندەکان وندەکەیت

لە یادتە و بە ئاشتکردنەوەی نور درۆ لەگەڵ کتێب و پاشا و قارەمانەکاندا دەکەیت.

# درۆی ئاگر

من کە دەسووتێم، ئیدی بۆ لە جەهەنەم بترسم
ئەوەی سەرتاپا برین بێت، خۆی لەشمشێر نادزێتەوە.
ئەی ئاگر، ئەی دۆستی هەموو دۆستەکان
تەنیا پیاوانی ترسنۆک پێویستییان بە بڵێسەکانی تۆیە بۆ سووتان.
ئێمە کە لە نور تێدەگەین، تاریکی ئێمە بە تۆ تەفسیرناکرێت، ئێمە کە خۆمان باوەشێنی ئاگری خۆمان دەکەین، بڵێسەی ئێمە بە بڵێسەی تۆ ناگەشێتەوە. سووتانی تۆ ناگاتە بەر دەروازەکانی ڕۆح، لرفەی تۆ تینی ناگاتە ئێسکەکان.
ئەی ئاگر...
من لەسەروو هەستەوە هێلانەم دروستکردووە،
لەسەروو ڕامانەوە باسم لە تێفکرین کردووە
لەسەروو خوداوە باسم لە مەزنی
لە سەروو مرۆڤەوە باسم لە ژیان کردووە.
من لە جنسی ئەو جەستانە نیم ئاگر بمسووتێنێت
لە جنسی ئەو کتێبانەنیم  سوتووەکانم نە خوێنرێنەوە
لە جنسی ئەو تابلۆیانە نیم خەڵوزەکەم پڕنەبێت لە ڕەنگ.
من وێرام دەست بۆ ئەو درەختانە بەرم کە لە سەرما داگیرسابوون. ئێوەش ئەی ئاگرکوژێنەوەکان، ئەی ئەوەی لەسەرەتای گەردونەوە تا ئەمڕۆ ئاودەکەن بە هیستریای باغەکاندا، ئاودەکەن بە وڕێنەی پەنجەرەکاندا، ئەو پەنگرانە دەکوژێننەوە کە لە سەری مەستەکاندایە، ئەو پزیسکانە خامۆشدەکەن کە لە چاوی قوربانییەکاندایە. ئەی ئاگرکوژەکان، ئەی

ئاگرخنکێنەکان، ئەی ڕاوکەرانی پشکۆ. من بۆ ئاگرێک دەگەڕێم کە بە دەستەکانی ئێوە ناگیرێت، باس لە بڵێسەیەک دەکەم کە لە خوێنەوە دێت، باس لە نورێک دەکەم هەتاو نایناسێت، باس لە تریفەیەک دەکەم تەنیا مانگەکانی ناو دڵ دەیبارێنن.
من لە ڕوناکییەک دەدوێم لە و دیو ئاگرەوە دەستپێدەکات
لە خۆڵەمێشێک دەدوێم پێش بڵێسەکان کەوتووە.
ئەوانەی بەم ئاگرانەش دەسووتێن، جەستە درۆزنەکانن.
ئەوانەی بەم ئاوانەش دەکوژێنەوە، باغە ڕیاکارەکانن.

# وڕێنەکانی گوڵێک لەسەرە مەرگدا

کاتێ خەونە تازەکان، بە ئاوازی خۆیان بێداریدەکەنەوە
دەڵێت : کوا هەڵاڵەی بابردووی ئاگرەکانی ناو سەرم؟
کوا دڵی بە ڕەشەبا نوسراوی سەر لاسکەکانم؟
تۆ ئەی خوێنی سپی من کە بە شەو دەڕژێیت و بەیانیان سارێژتدەکەم. ئەی گوناهی ئەمڕۆم کە سبەینێ لێت خۆشدەبم. ئەی شکۆفەی ئێستام کە شەو حاشات لێدەکەم. چەند بەهار دەبێت بژیم، تا پەنجەی باغەوان، لە پەنجەی مردن جیابکەمەوە؟
تۆ ئەی سێبەری دوێنێ کە ئەمڕۆ دەتدەم بە خۆمدا. ئەی پشووی ئێستا کە هەڵتدەگرم بۆ سبەی. ئەی بارانی پار کە ئێستا دەتدۆزمەوە. چەند شەو دەبێت نەنووم تا ڕەگەکانم لە چلۆچێوی ئەم پیاوە ئاگرینە دەربهێنم؟ من دەمەوێت کراسی خۆم لە خوێنی ئەم کۆترانە بشۆم. جێگای خۆم لە نێوان مردن و زەریادا بگۆڕم.

ئەوەتــا مـن هەمـوو شـتێک دەپێـوم: مەلەکـوت، درۆی سـایەقە سـپییەکان، پەشێوی دووبـارەی بـاران، وەرینـی هێشووەکانی ئاورنـگ، گەشانەوەی یەک لـە دوای یەکـی خـوداکان.

مـن هەمـوو شـتێک تەفسـیردەکەم: کتێبـی کەوتنەخـوارەوەی قوولنـگ، سەعاتی گوڵـە پیـرەکان، بەڵێنی سەوزی درەخـت، وەفـای خۆڵەمێشیی ئـاو. ئەوەتــا مـن بێدەنگنابـم: لـە زمانـی بـەدی پەپوولـە، لـە لەدایکبوونـی کۆترێـک بـە مردوویـی، لـە ئـاژاوەی خوێنـاوی باغـەوان، لـە لەباربردنـی شکۆفەیەک بـە فیـڵ، لـە حەڵاڵکردنـی هەنگوینێـک بـە حـەرام.
مـن لـە خـەو هەڵدەسـتم و دەڵێـم: تـۆ ئـەی ئاسمان، بـۆ وا بـە پڕتـاو شـوێنی خـۆت دەگـۆڕیت؟ بـۆ وەکـو زەوی لـە شـوێنی خـۆت ئارامناگریت؟ بـۆ هەنـدێ شـەو سـەرهەڵدەبڕم و ناتبینـم؟ ئـەی ئاسـمان تـۆ بەیانیـان بـۆ کـوێ دەچیت؟ هەنـدێ ئێـوارێ لـە کۆتـرەکان دەڕوانـم و تـۆ لەسـەر پشـتیان نابینـم... هەنـدێ شـەو نابەینـی گـەڵای گەردەلوولەکانـت بـۆ دەگـەڕێـم و ناتدۆزمـەوە... ئـەی ئاسـمان مـن بـە هـاواری قووڵنگەکانـدا، دەزانـم تـۆ لـەوێ نیـت. بە سـەدای ئـەو تەرزانـەدا کـە لـە مەلەکوتـدا دەزرینگێنـەوە، دەزانـم تـۆ لـەوێ نیـت. بـە چەمینـەوەی لەنـاکاوی درەختـە بەرزەکانـدا، هەستەکەم تـۆ کەوتویـت. تـۆ لێـرە نەبیـت، مـن شێتانە بێـدار دەبمـەوە و دەڵێم: کـوا نێرکـی پشکۆکانی نـاو سـەرم؟ بۆ گـەر ئاسمان دەستمنەگرێت، ڕەگـەکان دەستمناگرن\؟ ئەوەتـا... مـن لـە جەنگـی ئەمبـەرەو بـەری هێـرۆ و گوڵەباغـدا بێگونـاه دەکوژرێـم. نێـزەی خـودا بـۆ کوفـری شەسـتپەڕەکان بـەر دڵـی مـن دەکەوێـت. خوێـی دوێنـێ دەریاچـەکان بەسـەر زامـی ئـەم بەیانییەمدا دەڕژێـت. ئەوەتــا هاواردەکـەم: ئـەی کسـپەی پـار کـە دەبایـە
ئەمسـاڵ دەرمانتکـەم، ئـەی تاعوونـی پایـز کـە دەبایـە هاویـن نـاوت فێربـم، مـن سـوێی سـەرەوژێربوونەوەی بـاغ بەسـەر دڵـی باغەوانـدا، سـوێی

بەسەرچوونی ئیرسی سەما لەناو مردندا، کوشتیانم. من بێخەوی ناوێک کوشتمی کە تەنیا لە خەودا ژیان و مردنی تامدەکرد. تاریکی ڕۆژێک کوشتمی دەیچرپاند: تۆ چی دەکەیت لێرە ئەی گوڵ... ئەی ئەوەی وەستاویت و قیامەت لە گەڵاکانتدایە... وەستاویت و جەهەنەم لە شکۆفەتدایە.

## ئەی بۆهیمیی، بوەستە

باتۆ لەنگەرت نەبێت، ئەوەتا ژیان لەنگەری هەیە.

با تۆ بەیانیان لەخەو هەڵنەستیت، ئەوەتا دەریا بەیانیان لە خەو هەڵدەستێت.
تۆ بخەوە، خۆ ئەو بەلەمانەی لەوبەر چاوەڕوانی ماسیگرەکان دەکەن، ناخەون
ئەو کۆترانەی بەسەر تەلەکانەوە چاوەڕوانی مردن دەکەن، ناخەون
ئەو گاشەبەردانەی لە دوور چاوەڕوانی بوومەلەرزە دەکەن، ناخەون
تورەیی تۆ، هیچ لە ئاسوودەیی ئەو کونەپەپووە پیرانە ناگۆڕێت، کە لە ناو گەڵاکانەوە سەیری ئەستێرە دەکەن. جا تۆ هەر بە هەژاری بژی، ئەوەتا بورجەکان بە بەندۆڵی زێڕین کات دەپێون، شۆستەکانی گەردون پڕ بووە لە قەپانی تەڵا بۆ کێشانەی هەتاو، نرخی یاسەمین لە نرخی باغچە بەرزترە، نرخی چرا لە نرخی خۆر باڵاترە. گەر تۆ بێداریش بیت، کێ خوێنی خۆی لە بەردەم ئاوێنەی تۆدا هەڵدەخات. گەر تۆ خەوتووش بیت، کێ بازاڕی خۆی لەنزیک تۆدا دەکاتەوە. شەهوەتی تۆ، کە هەر لە شەو ورددەبیتەوە، مەگەر لە ئاسمان بپەڕێت. تۆ دەڵێیت،

ئەو ڕۆژەی بە مەستی دەستپێنەکات، بە خوێن دوایبیدێت. دەڵێیت، ئەو درەختەی لانەوازەکان لە ژێریدا نەخەون، ڕەگەکانی لە جەهەنەمدایە.

بەلام لەم باغی جانەوەرەدا، سەیری دەستووره ئەندازەییەکانی ژیان بکە. ئاو لە گێژەنەکانیشیدا سەرمەستە بە ئەریتی دەریا. شەو لە زریانەکانیشیدا سەرمەستە بە قانونی تاریکی. شێتی باڵندەکان، هیچ لە هوشیاری درەخت ناگۆڕێت. بۆهیمیەتی گوڵەباغ، هیچ لە دانایی شەو کەمناکاتەوە. سروشت لە تورەبوونی زەریاکانی خۆی ناترسێت، ئێستا بۆ لە تووڕەیی هەنگاوە مەستەکانی تۆ بترسێت؟
بەلام ئەی بۆهیمی بوەستە و لێمان زویرمەبە، لەگەڵماندا بە تا خۆرئاوادەبێت، لەگەڵماندا بە تا خوێنی تۆ دەچێتە ناو خوێنی بەیانییەوە. دەست لە ماچی مردووەکانمان هەڵمەگرە، با بەهەشت بۆیەکی شەرابە تاڵەکانی تۆی تیابێت. وەرە و پیاسەبکە بە ناو پاییزەکانماندا، با ڕەنگی زەردیی تۆ بپژێتە سەر خەزان، با شوێن پەنجەکانی تۆ، لەسەر پەرداخی شەرابەکانمان بێت، با بۆنی مەستی تۆ، تامردن لە هەناسەمان هەستێت.

کە بەبێ تۆ ئەم شەو سەرتاپای قانونە، بەبێ تۆ ئەمڕۆ فاشستیانەیە ژیان.

## لە وەسفی تاریکییەکانی ئەودا

تاکەی هاواربکات »ئەی تیشک«؟
تا کەی بقیژێنێت »ئەی هەتاو«؟
تاکەی بۆ گورزەیەک نوری درۆ سەربدات بە دیوارەکاندا؟
ئەی ڕوناکی ئەوەی ئەتناسێت نازانێت چەندە لە زوڵمەت ڕەشتریت

**ئەوەتا ئەو لە ڕوناکیدا مەلەدەکات، بەڵام چاوانی پڕن لە زوڵمەت**
**نازانێت بۆ کوێ دەڕوات، بەڵام هەموو دەرگاکان لەسەریدا کراونەتەوە**
**هیچ شتێک نابینێت، بەڵام دەزانێت پێش دەمی سەرتاپا ڕوناکییە**
**ئەی پیاوە داناکان... لەبەر شەو نییە کە ئێمە ناتوانین نور هەڵگرین و بیخەینە ناو گەرووی بولبولەوە، لەبەر تاریکی نییە کە ترێی باغەکانمان پێناگات، لەبەر دەیجور نییە باوەڕمان بە ئاسمان لەقبووە.**
**ئەو وەک من و تۆ چاوەڕوانی بەیانی نەکرد...**
**گووتی، وادانێن بەیانی نایەت**
**وەک من و تۆ نەیگووت: بابوەستین سبەی خۆرهەڵدێت...**
**گووتی، وادانێن سبەی خۆر هەڵنایەت.**
**ئەو گووتی: با چاو نەکەینە شاهیدی شتێک کە نایبینێت.**
**لای ئەو مردن نە سپی بوو نە ڕەش، نە ڕۆشنایی بوو و نە تاریکی، نە ئاشتبوونەوەبوو نە تۆران. ئەو ڕەنگی مووروەکانی مردنی نەبینی بوو، ژمارەی دەنکی ملوانکەکانی ڕۆحکێشانی نەدەزانی.**
**هاواریکرد : ئەمە تەزبێحی مردنە، سەیرکەن بەچی دەنکەکانی لە قەزوانی ژیان جیادەکرێتەوە؟**
**ئەو لە تاریکیدا وەحی جیاکردنەوەی زامەکانی بۆ هات، وەحی خوێندنەوەی ڕۆحەکانی بەر دەرگای تیشک. تاریکی جورئەتیدایە گڕی جاویدانەی فڕین بگەشێنێتەوە. بەدەستی ڕووت، بکەوێتە تەفسیری تێزاب. هێزیدایە، دەم بخاتە ناو دەمی فریشتە مردووەکانەوە، خوێنی ناو دەمی دڕندەکان ماچبکات. لە مرۆڤی هەلاهەلای ناو باکان، ماسی بچوکی دروستکرد بۆ ناو ئاو. لە جەستەی پارچەپارچەی باڵندە، پەپوولەی دروستکرد بۆ باغچە. لە ژیان ژیانی چنی، لە مەرگی دەریا شەپۆلی چکۆلەی سازکرد.**

شەو جورنەتیدایە، دەستبەرێت بۆ مەمکی خوێناوی یار
دەم بنێت بە زامی سەر گەردنییەوە
زمانی بخاتە ناو دەمی جەهەنەمیی عەشقەوە.

ئەو سروودی بۆ قووڵایی تاریکی گووت، لەگەڵ ڕەشپۆشەکاندا گەیشتە شارە نغرۆکانی ناو عەدەم، دەستی لە قەتەرانی پەتی مردندا، کوێریتی ڕەهای ناو بینینی بینی. ئەو ئەمیرانەی بینی کە ساف زەردەخەنەی شەو بوون. ئەو بە دەنگی بولبول لە ناو لالەزارێکی تاریکدا دەیخوێند، وەک قووڵنگێکی کەوتووی ناو قەترانی شەو دەیقیژاند، سەمایدەکرد، چەپۆکی ئیشراقی دەکێشا بە دەرگاکاندا. ماچی غەزادەکرد... پاکیزی پاکیزان، بەهرەی بلیمەتان، سوارچاکی شاسوارانی غەزا دەکرد. تادوێنێ بە هەتاو مەست بوو... ئیتر شەوە بچوکە قووڵەکان، ئەو شەوانەی کەس پێیناخاتە ماڵیان، کۆتاییان بە ڕۆژە درێژەکانی هێنا.

ئیدی تەواو
ئیدی ئاوابە ئەی خۆر، ئاوابە ئەی بێفەڕ. ئاوابە... ئاوا.

# گۆرانیبێژێکی ئەستێرەناس

ئەستێرە هەیە، بە گۆرانی دەمرێت
ئەستێرە هەیە، بە ئاواز دەکوژێتەوە
ئەی مۆسیقارەکان، با چیتر عەرش بەم چریکانە نالەرزێنین
بێدەنگبن، ئەی ئەوانەی نازانن مەلەکووت لە پووش سووکترە
نازانن کە سەمایەک، دەشێت خاک پارچەپارچەکات

هەڵپەڕکێیەک دەشێت دونیا هەڵگێڕێتەوە .

من ئەستێرەم بینیوە کە نایەوێت مرۆڤ ببینێت
نایەوێت دڵی پڕبکەین لە باغچە، هەناسەی پڕکەین لە بۆنی غەمگینی پرتەقاڵ، هێند ناسکە ڕەگی درەختەکان دەیکوژن، ئاورنگی بەیانییەکان دەیپێکن، شەرمی درەختەکان نەخۆشیدەخەن
ئەستێرەم بینیوە،
بە ئاخێکی ئێمە لە مەدارەکانی خۆیدا دەمرێت، بە زامێکی ئێمە دەبێت بە گۆمی خوێن
ئەستێرەم بینیوە
هەنگاوەکانی ژیانی ماچکردووە، دەستی خۆی داناوە تا مرۆڤ بەسەریدا بڕوات، ڕۆحی خۆی گرتۆتەوە تا ئێمە لە ناویدا بگرین.
ئەستێرەم ناسیوە
چراکانی خۆی کوژاندۆتەوە تا سەیری ئاکۆتا بکەین، لە جەستەی جیاوازی ڕۆشنایی و زوڵمەت وردبینەوە، ئەو ژمارانە بژمێرین کە تەنیا لە ماتماتیکی شەوا حسابدەکرێن.

ئەستێرەم خۆشدەوێت
باسی لە دایکبوونی ئەورەسە دوورەکانم بۆ دەکات، باسی جەنگە دێرینەکانم بۆدەکات لەسەر تۆوێکی بچوکی ژیان، باسی زیزبوونی مانگەکانم بۆ دەکات لە یەکدی لەسەر هەناسەیەکی مرۆڤ، باسی شەڕی مەلەکووتەکان دەکات لەسەر عەترێکی ناسک کە لە هەناسەکانی ئێمەوە دێت، جەنگی خوێناوی خواکان دەنوسێتەوە لەسەر شوێنی ئەو بەهەشتەی بۆ من و تۆ دروستدەکرێت.
ئەستێرەم ناشتووە

بۆ گوێگرتن لە پێکەنینی منداڵێک کوچەیەک خنکاندویێتی. بۆ ئاشتکردنەوەی دوو شەونم ئاو بردویێتی، بۆ عەشقی گوڵ هەتاوی باغچە کوشتویێتی.

# وشە و دڵ

ئەم زستانە هەڵپەسێرە بەسەر دەرەختێکدا
با سپێتی ئەو حەرفانە ببینین کە دڵی ڕەشمان نایبینێت
هێلانەی ئەو وشانە ببینین کە تەیری دڵمان لەسەریان خەوتوە
بێدەنگی ڕەشی ئەو ڕستانە ببینین لە خوێنی من نایەنەدەرێ
واوەیلا بۆ ئەو وشەیەی تووشی ڕۆحی من دەبێت
واوەیلا بۆ ئەو دەستنووسەی خوێنی من پاکنوسیدەکات
هەیهات
چ ئاگرێک کەوتەوە کاتێ گووتم: بمکوژێنەوە ئەی حەرف!
چ بارانێک باری کاتێ گووتم : دامگیرسێنە ئەی حەرف!
چ خاشاکێک بەجێما کاتێ گووتم : لە منی تۆز مرۆڤێک دروستبکە ئەی حەرف!
ئەم پاییزە هەڵپەسێرە بە هەناسەیەکمدا
با خەزانی ئەو وشانە ببینم کە دڵی زەردمان نایبینێت
با وەرینی ئەو حەرفانە کۆبکەمەوە کە بێدەنگییان لە بێدەنگی دڵی من ڕەشترە
ئەی گەرووی من، بە وشەیەک هاوارەکانت داگیرسێنە
کە دڵی پڕ لە کینەی من دایناگیرسێنێت
دڵی پڕ لە خراپەی من، کە بەروبوومی حەقیقەت ڕیسوایکردووە

**دوکەڵی ڕەشی ڕاستییەکان فەسادیان خستۆتە فەرهەنگم**
**من گەرد لەسەر بێڕەحمیم نییە، ئیدی بۆ خەزانی ئەو وشانە نەبینم**
**کە دڵی پاییزنشینی من نایانبینێت.**
**ڕۆژێک کە هاوسەر و هاوڕێ و هاودەمانم فەرامۆشمدەکەن**
**کە نەتەوە و دۆست و یاوەرانم دەڵێن : »تۆ لە جنسی ئێمە نیت«**
**من بە هۆی تۆوە دەچمە ناو شەونم**
**تۆ کە لێرە نیت، من لە بری تۆ لێرەم ئەی زمان**
**من کە لێرە نیم، تۆ لەبری من لێرەیت ئەی زمان**
**کاتێک دەمریت، بەدڵی مندا دەگەڕێیتەوە ناو هەرەشەی ساڵەکان لە یەکدی**
**کاتێک دەمرم، بە خوێنی تۆدا دەگەڕێمەوە بۆ جەنگی ڕۆژەکان لەگەڵ یەکدا**
**تا تۆ هاوارنەکەیت من شمشێرم بەرزناکەمەوە. تا من تەقە لە جەنگەڵ نەکەم، تۆ هیجای درەختەکان مەکە**
**تۆ شەڕبکە و من حەشیشی جەنگ دابەشدەکەم**
**خودەی ترس دەکەینە سەر، پێکەوە وەک دوو شەڕیکی ڕەش، ڕۆحی قەترانی خۆمان بەسەر ئەم درەختەدا هەڵدەپەسێرین کە دڵی شین و بێلێوارمان نایبینێت. لە هەرکوێیەک تەقەیان لە باڵندەیەک کرد، دڵی خۆمان هەڵدەبڕین و سەیری بێباکی ڕەشی یەکدی دەکەین کە چاوی عەیارمان نایبینێت. تۆ شتێک لە نهێنی من ببینە کە دەستی سپیم نایگرێت، من شتێک لە مانای نەخوێنراوەی تۆ دەخوێنمەوە کە دڵی بێڕەنگی تۆ نایخوێنێتەوە. یەکی شتێک لە شەونمی یەکدی، بۆ ئەو بێگانەیە دەخوێنینەوە کە هۆشی ڕەشمان نایناسێت، یەکی شتێک لە مەرگی یەک تامدەکەین لەسەر ئەو سفرەیەی کە زمانی ڕەشمان تامیناکات.**
**ئەوەی تۆ ونبکات، تا هەتاهەتایە ئێمەی ونکردووە. درەختەکان تا**

هەتاهەتایە ئێمەیان ونکرد، گیا تەماشاماندەکات و دەزانێت سەر بەم گەردونە نین. ئەی زمان تۆ ئێمەت شاردەوە، تۆ ئێمەت خستە ئەشکەوتێکەوە کە چیدی گوێمان لە ئەستێرەکان نییە، گوێمان لە مانگ و ڕۆژ و پەلکەزێڕینەکان نییە. تۆ وانکرد هەزار گوڵ لە تەنیشتمانەوە بکوژرێت و ئێمە هەر بخەوین.

دڵی ڕەشمان خستە بەر فریوی سپی تۆ. دڵی ڕەشمان کە حەرفی تۆ فەسادی خستۆتە ناو دەنگی. دڵی ڕەشمان کە دەکرا هەر وەکو دڵی بولبول، بینێین بە بەهارەوە و نور لەوسەری ئەوسەری جەنگەڵدا ببینین. دڵی ڕەشمان کە هەر وەکو دڵی چیمەنەکان، دەکرا لێگەڕێین گەشەبکات و ڕێگا لە فرینی باڵندەکان نەگرێت. دڵی ڕەشمان کە دەکرا لەودیو پەنجەرەکانەوە بڕوانێت، سەیری ئەوبەری ئەڵماس بکات، سەری ئەوسەری یاقووت ببینێت.

ئەی زمان، کاتێک دەمرم لە ڕێزمانی تۆ دەربازدەبم و دەچمە ڕێزمانی خاکەوە. کاتێک دەستدەخەمە سەر ناوچاوانی ئەم درەختانە لە ڕوونی تۆ دەردەچم و دەچمە ناو تەمتومانی بێزمانانەوە. من مەلەکوتی بێزمانەکان بە خوێنی خۆم دەکڕم کە بەبێ تۆ، دەتوانم لەگەڵ هەر تیشکێکدا قسەبکەم، بەبێ تۆ دەتوانم لەگەڵ هەر دەریایەکدا دانیشم، بەبێ تۆ دەتوانم حکایەت بۆ هەموو مەرجانێک بگێڕمەوە، بێقسە ڕۆح لەگەڵ تاوێرەکاندا ئاشتبکەمەوە، بە هەناسە ئاسمان بخوێنمەوە، بە ئاه گوڵ بنوسمەوە.

دڵی ڕەشت هەڵپەسێرە بەسەر دڵی ڕەشمدا، کە هەمیشە لە نێوان قەترانی حەرفی من و قەترانی حەرفی تۆدا، فاریزەیەکی عاشق هەیە.

# چ خۆشە شاعیران نامناسن

چ خۆشە شاعیران باسی شکۆفەم بۆناکەن
من کارم بە غەزەلیان نەماوە
با نەیەن... با ڕوونەکەنە ماڵم، حاشا لە جیناس و تیباقیان، حاشا لە کێش و سەروایان، حاشا لە تەدویر و تەشبیهیان. من دڵم بۆ شکۆفەیەک لێدەدا سرکتر لە هەر وەسفێک، دڵم بۆ وشەیەک دەسووتێت، نوتقی ئەو لە نوتقی خوێنم جیانابێتەوە، نوتقی ئەو هاوڕێیە بە ئاوابوونی دونیا، هاوڕێیە بەسەرهەڵدانی تۆڤان، هاوڕێیە بە هەستانی قیامەت، هاوڕێیە بەنەفخی ئاخر زەمان. چ خۆشە شاعیران نامناسن، سڵاویان خودا لە سوبحی کۆترانم دەردەکات، ڕەنگی دەنکە هەنارانم دەشێوێنێت. من دڵم بۆ سڵاوێک لێدەدات، زەندیق و زاهیدان ئاشتکاتەوە، خوێنپژانی دڵی ئەم سەعاتە بگرێ، کە زەمەن وەک فوارە لەبەر برینی دەڕوات. خەمپژان و خەندەبارانی سەر ئەم بستە خاکەی دڵ ئاشتکاتەوە، هێمنی بخاتە دڵی بروسکەوە، ئارامی ببەخشێت بە هەورەگرمەکان، دڵنیایی بداتە ئەو مردووەی دەمرێ، پەیمانی بەهەشتمان بداتێ... بە ئێمەی کافران.

چ خۆشە شاعیران هاوڕێمنین،. مەحاڵە ئەوان وەکو ئەم کوترە بمرن، کە منم تەنیا وەک کۆتر دەتوانم بمرم
مەحاڵە لەم گیایەمدا بنوون، کە منم تەنیا وەکو گیا دەتوانم بنووم.

# پڵنگێک لە مندا

پڵنگێک لە دڵمدایە هەرگیز ناخەوێت
پڵنگێک لە مندایە لە جەنگەڵ نایەتەدەرێ
پڵنگێک لە مندایە، نەخشەی دارستان نەبێت هیچی دی بۆ ناخوێنرێتەوە.
لەشی هەمووی جێکەڵبەی حەقیقەتە، پڕە لەپاوەنی بوونی دی، پڕە لە نەعرەتەی درەختی بریندار لە جەنگدا.

پڵنگێک لە مندایە چلۆچێوی خاپوری جەنگەڵەکان لە دڵی ئەوایە، هەر ئاوێک دەمرێت ڕۆحکێشانێکی دەپەڕێتە ڕۆحی ئەو، هەر ئاگرێک گۆرانی دەڵێت کڵپەیەکی لە گەرووی ئەودا سەمادەکات. ئەوە دەماری من دەبڕێ و دەیبەستێ بە ڕوناکی مانگەوە، ئەوە خوێنی گوڵ دەخواو دەیکاتە خوێنی منەوە، خۆڵەمێشی هەر جەنگەڵێک بخوێنێتەوە، تا نەگاتە مندالی یەکەمین درەختی ناوەستێت. هەر نێچیرێک بخوات، تا نەگاتە یەکەم نوتفەی، دەست لە خوێنی بەرنادات. کە سەیری لە دایکبوون دەکات، سەری پڕە لە وێنەی ئاخرزەمان. کە لە مردن دەڕوانێت دڵی پڕە لە گریانی لە دایکبوون.

پڵنگێک لە مندایە، دارستانی هێناوەتە ناو خوێنی من. ئەوەتا بە چاوی جانەوەرێک تەماشای مەخلوقات دەکەم، ژیانم بووە بە نیگاکردن لە ڕەشەبا، بووە بە بۆنکردنێکی بێکۆتا بە کێڵگەو ئەستێرەوە، بووە بە بیرکردنەوەی بێوچان لە نێچیری بەیانی.

پڵنگێک لە مندایە غەریزەی بەدی هەموو جانەوەرەکانی خوێندووە، حەزی بە مردنە لە ناو لقە بەرزەکانی درەختدا، حەزی بە بازدانە لەسایەقەی شەوەوە کە ڕۆحکێشانی نێچیر لە سەر ڕەنگی شەونم دیارە، بەرەو بارانی بەیانی کە خەندەی ڕاوچیان لە سەر دڵۆپەکان هەڵکەنراون. دەڕوات تا لە نزیک گۆمە بێبنەکانی منەوە بمرێت. چەمە خوڕەکانی من بانگیدەکەن و ئەو تادێت نزیکدەبێتەوە... دێت و تا دێت، من زیاتر دەچمە ناو گۆمەکانی چێژ و سادییەتەوە... دێت و تا دێت من زیاتر حەز بە خواردنی کەرتێکی مانگ دەکەم... کە دەگاتە بەردەمی پەرستگام فوارەکانم لەناکاو بەرزدەبنەوە... خوێنم بە ڕووی شەوەزەنگدا دەڕژێت... تا نزیکتر دەبێتەوە پتر حەز لە تامکردنی ئینسان دەکەم... پتر حەز لە خەوتنی وەحشیانەدەکەم لەگەڵ مێینەی هەموو مەخلوقاتەکاندا... دێت و تا دێت، من زیاتر لەزەت لە وێرانەیی دەبینم... کە دەگات و ناگات، من بڕوای وەسەنییە دێرینەکان دەمخاتەوە سەر کەڵکەڵەی گەڕان لە ناو گیاو بەردو درەختدا بۆ خودا... کە دەگات و ناگات، هەناسەم پڕدەبێت لە تۆزی ڕاوچی ڕۆژگارە دوورەکان، کێڵگەکانم پڕدەبن لە تەقەی تفەنگ... کە دەڕوات و ناڕوات، ئەوەی تادوێنی خزمەتکاری من بوو، ئەوەی تادوێنێ شریخەی قامچی من لەسەر جەستەی بوو، ئەوەی کڕنووشی دەبرد بۆ نانی دەستی من، لە جاهو جەلالم یاخیدەبن. کە نایەت و نایەت، ئەوەی شوێن گوللەی من بوو لەسەرناوچاوانی تفەنگچییەکان، ئەوەی ئاسەواری زللەی من بوو لەسەر ڕوومەتی گوڵ، با دەیبات و بادەیبات و بادەیبات. کە دەمرێت بەهەشتی پڕ لە ماخۆڵانی هەرزەکارانەی من، بەهەشتی کردنەوەی دەرگاکانی غەریزە تا ئەندازەی تۆقان، بەهەشتی هەڵوێستی جیاجیای من دوور لە لێپرسینەوەی هیچ مەزهەبێک... دەڕوخێت... بەرەو خورهەڵات... لەپەوڕوو... کەوتن و مردن وەک هەر پەترپارکێکی خەمگین.

پڵنگێک لە مندایە شەوانی ڕەشەبا خەبەرمدەکاتەوە، پێمدەڵێت تەماشای ئەو پڵنگانە بکە لە ڕۆحی خەمگینی مردووەکان دێنەدەرێ، تەماشای من بکە... تەماشای سێبەری سێبەرەکانم بکە کە خەونی خەونەکانت جێدەهێڵێت. وەک هەر قەتارچییەک کە سەری لە کۆشی جەنگەڵدایە دوای هەموو پڵنگەکان دەکەوم، ئەو پڵنگانەی خاڵ خاڵ نەخشی خۆیان لە لەشمدا جێدەهێڵن، خەت خەت تێپەڕبوونی خۆیان بەناو ناو و چۆمەکاندا ڕادەکێشن. بەرەو زەوییەکی بەڵەک وەک ناوچاوانی ئەو، بەرەو سەعاتێکی سوور وەک شوێن چەپۆکانی ئەو... من سەرم لە کۆشی ڕەنگدایە، ئەو پڵنگە شینانەی لە ڕەنگی گومەزی شارەکانی سەحران، ئەو پڵنگە برۆنزیانەی لە قرچەی هاوینی خۆرهەڵاتەوە دێن، یان لە بزەی مسی بازاڕ، ساختەی تەلای زەرد، تەوقی بێبریقەی مەعدەنێکی نەناس... هەموو پێکڕا مەخلوقات لە پشت مەخلوقات... هەموو پێکڕا گاڕانی پڵنگانی بیمار و ئادەمیزادانی بریندار... یەک لە دوای یەک... بێئەوەی ئاوێنەکان نوتقێکی ڕاستمان پێبڵێن... تێناگەین... تێناگەین... من پڵنگم یان ئەو؟... ئەو پڵنگە یان من؟... ئەوە بازدەداتە ناو سەرم یان منم بازدەدەمە ناو دڵی ئەو... خوێنی ئەوە غیرەتی سەفەری ئەم دارستانەم دەداتێ ، یان خوێنی منە هێزی نەعرەتەی دەداتێ؟ نەعرەتەیەک پڕە لە شوشەی شکاوی پڵنگی تر، پڕە لە پارچە غەریزەی تێرنەبووی هاوجنسەکانی من، گوێی لێبگرە هاوڕێم... گوێی لێبگرە، نەعرەتەیەکە لە هێچ هاوارێکی دی ناچێت...

نەعرەتەیەک پڕە لە وەحشیەتی ڕەواتر لە شیری دایک،

پڕە لە بۆهیمیەتی ناسکتر لە ماچی خوشک.

## ئەی ئەوەی من گوناهباردەکەیت

ئەی گەمژە گوناهی من نییە تۆ ناتوانیت یاقووت ڕاوبکەیت
گوناهی من نییە تۆ لە جنسی خشۆکەکانیت و من لە ڕەگەزی تۆفان
من لە جنسی خوداکانم و تۆ لە جنسی مێروولە خوساوەکانی ژێرباران
من سەر بە خێڵی ئەستێرەناسەکانم، تۆ کرمفرۆشێکی بیمار
تۆ پاسەوانی کەلاوەیت، من ئەندازیاری یۆتۆپیام
تۆ لقی درەختێکی کرمییت، من نور و گڕ و ڕەشەبام
گوناهی من نییە تۆ ناتوانیت گوڵ بگریت
گوناهی من نییە، سەری تۆ لە دڕک زیاتر هیچ ناگرێت
ئەوەی من دەینێرم بۆ ئەبەدییەت بە تۆ ناگەڕێتەوە
ئەو خاک و زەریایانەی من دروستیاندەکەم، بەگەزی پەڕپوتی تۆ ناپێورێن
تۆ ئەی کڕیاری کۆنی زبڵخانەی ژیان
دانی تۆ لەوە پیرترە، گوێزی پڕ حیکمەتی من بشکێنێت
لووتی تۆ لەوە زەلیلترە، بۆنی باغی من بکات

## ماندووبوون... لە جیهانە دووبارەکان

ماندووم... وەک پیاوێک هەموو ڕۆژێک تا ئێوارێ، لە هەمان جێگادا بۆ هەمان گوڵ بگەڕێت. وەک ڕاوچییەک تەماشای تیرەکانی خۆی بکات کە دووبارە هەمان نێچیر، لەهەمان زەمان وهەمان شوێندا دەپێکن، وەک

هەمان باڵندە کە بەسەر هەمان نێچیردا، لەستایشی هەمان مردندا دەفڕێت، دەبینم هەمان دەست، لە هەمان شەقامدا، بەهەمان شمشێرەوە بانگ لە هەمان کۆتر دەکات. هەمان دەنگ، بەهەمان تفەنگەوە، لە هەمان بازاڕدا، تەقە لە هەمان مەولانا دەکات. ئەمیرێک، کە خۆی لە پاشاکان جیاکردۆتەوە، بە بۆنی باروتی هەمان تۆپخانەی شکاوەوە، هاتۆتەوە ناو هەمان سەرای خاڵی لە حەشەم، وەک منداڵێک پێکەنین لەسەر حەوزی عەتارەکان بیکوژێت، وەک کچێک، مامانەکان تریقە و قاقای لەباربەرن، لە نزیک فرمێسکی هەمان زاهیدەوە، هەمان ئیشراقی دێرینەی خۆم دەدۆزمەوە. من لە قەتارچییەکان بێزارم، کە هەمان مەرەکەب لە هەمان شار دەدزن و لەهەمان ڕێگادا، لەسەر هەمان وەرەق هەمان شکستی کۆنی من دەنوسنەوە

وەک منداڵێک لە ژێر هەمان سێبەردا، دەست بۆ خەیاڵی فڕینی هەمان کۆتربەرێت
بە هەمان چاو هەمان کوێری دەبینم
ئەوەتا مەیێک کە هەمان مەی نییە، دەمباتەوە هەمان مەیخانە
ڕێگایەک کە هەمان ڕێگا نییە دەمباتەوە هەمان ناڕێگا.

## شەوی موعجیزە بچوکەکان

بەیانییە دێرینەکان دەکەمەوە، لە گەرووی سوبحە کۆنەکان، هەر سوبحێک کە ناکوژێتەوە، هەر شەوێک کە ئاوانابێت... کوچەی منن هەرکەسەوزەمانی خۆی، زەمانێک لەم دیوەوە بە کلیلێک دەکرێتەوەو لەو دیوەوە بە کلیلێکی دی دادەخرێت، با نوقمبین لە خوێنی وشەدا، لە

شەوی ئەودیوماڵی تێکستەکانەوە، کە لەم دیوەوە بە قفڵێک دادەخرێن و لەودیوەوە بە تۆڤانێک دەکرێنەوە.
کێ ئێمە هەڵدەستێنێ کە ئێمە بە تاریکی داخراوین و بە ڕوناکی دەکرێینەوە. هەڵمانستێنە، باباران بماننناسێتەوە، گوڵ سەیری دڵمان بکات، درەخت بماندۆزێتەوە.
ئەو دەستکێشانەی گوڵمان پێچنین، بێئاوی وەرزەکانیان ئاشکراکرد، شورای دێرینەی باخچەیان ڕوناککردەوە
ئەوەشی ئێمەی شێواند، ئەم پشووەی هەوابوو کە ئەمشەو ئاسمان بۆ دڵمانی هێنا. هەناسەمەدە، با لەم بەردانە ئازادبین... مەڕۆ، باقاچمان لەم درەختە نەترازێت.
وەک هەر باڵندەیەک کە تۆ ئەفسانەی پێدەخوێنیتەوە
وەک بەردێک تێپەڕینی زەمان، یان لێخشانی »با« بیدرەوشێنێتەوە
نەفەس لەدوای نەفەس، مژ لە دوای مژ، هەناسەمان داگیرسان
وەرە ئەمە ئەلبورزی ڕوناکییە من و تۆ پیا سەردەکەوین
پۆنگخواردنەوەی بێدەنگییە لە نزیک ئەم زەنگانەوە دەڕوات.
ئەم هەموو زرینگەیە ڕەشەبا نییە
ڕوناکییەکە نازانێت بو کوێ دەچێت... بێدەنگییەکە لە بێدەنگی ئێمە هەڵهاتووە.
لەم تاریکییەدا
ئەوەی ونبووە وننەبوونە... ئەوەی دەگەڕێتەوە نەگەڕاوەیە... ئەوەی تێدەپەڕێت تێنەپەڕە
تەنیا ئەوا دەتوانم قسە لە کۆتایی ناکۆتاکان بکەم.
دەچمەوە سەر فەرشی تراژیدیا، سەر کورسی دراماکانی دوای تۆڤان، لەوێوە سەیری ئاوەدانبوونەوەی موعجیزەئاسای کاولستانەکان دەکەم...
لە هەستانەوەی ئیمارەتە ڕوخاوەکان دەڕوانم

تەنیا ئاوا دەتوانم لە ژیانەوەی ئاژیان... لە خەونی بێخەونی... لە بوژانەوەی ئەو شتانە بڕوانم کە نابوژێنەوە.
ئیدی هەرکەسەو ماڵی خۆی، ماڵێک بە خوێنی خۆی دایبخات و بە خوێنی خۆی بیکاتەوە.
ئەوەتا... ئەوەتا تەماشامکە منیش وەک تۆ
بەوشەی خۆم قفلکراوم و بە بێدەنگی خۆم دەکرێمەوە.

# سەرۆک بەیانیان کە هێشتا خوێن تازەیە... ڕەشەباکانمان مەگۆڕە !

سەرۆک هێندە یاساکانی شەڕ مەگۆڕە، درۆمان لەگەڵ کۆترە سپییەکان بۆ ناکرێت.
هێندە غەریزەکانمان مەگۆڕە... ئیدی درۆمان لەگەڵ جەستەمان بۆناکرێت.
سەرۆک بەربەیان کە برین هێشتا تازەیە، کە خوێن هێشتا بۆنی شیری لێدێت، کە دڵمان بۆنی پەنیری سپی کێڵگەکانی لێهەڵدەستێ، تۆ جێگای پاوانەکانمان مەگۆڕە... ئێمە ناتوانین هەموو ڕۆژێ بەرغەلەکانمان بگۆڕین. وەرزێکە کەسمان لە باران تێناگەین، ئاگری سەوسەن و ڕێحانان بەربۆتە باوانمان، تەمی گۆمیچکە دوورەکان بەربۆتە هەیوانمان، پوولەکەی ماسییە بۆهیمییەکان بەربۆتە جەستەمان، ساڵێکە بە گیا دەڵێین با بگرە، بە درەخت دەڵێین مەهێڵن تریفە ڕابکات، بە مێگەل دەڵێین سەرکەون تا سەرچاوەی ئەبەدی لەوەڕگا، تا شوێنی گیای جاویدان... تا شوێنی سێوی نەبینراوی ژیان.
سەرۆک من شکات لە ئاگری دوێنێ دەکەم، کە ئەمرۆ خۆڵەمێشەکەی دەکرین... ئێمە ناتوانین نرخ لەسەر هەموو پشکۆیەک دانێین، ناتوانین

هەموو ڕۆژێک بازاڕی خۆمان بگۆڕین.

سەرۆک عەشقەکانمان مەگۆڕە... ئێمە ناتوانین هەموو شەوێک دڵی خۆمان بگۆڕین.
سەرۆک بەربەیان کە هێشتا باوێشکی شەو بە هەلاڵەکانەوەیە، دڵی بولبول پڕە لە پرخەی مێرگوزار، چاوی سوێسکە پڕە لە ڕێشکەوپێشکەی لالەزار. کاتی جەنگمان لێمەگۆڕە... ئێمە بەرگەی شمشێری ناوەخت ناگرین... خەنجەرمان بۆ جەنگی بەر سێبەری نیوەڕوان کراوە... مەنجەنیقمان تەنیا ئێواران شەڕدەکات...
وەرزێکە ئێمە لە دوژمنانمان تێناگەین، وەرزێکە قانونی پەلامار گۆڕاوەو من و تۆ بێخەبەر لە یاسا شەڕدەکەین.
هێندە شەریعەتەکان مەگۆڕە... ئێمە ناتوانین هەموو ڕۆژێ قانونی دڵمان بگۆڕین
سەرۆک بەربەیان کە هێشتا شیری ئێمە سپییە، چوڕی خوێنمان لێوان لێوە لە موچڕکەی شەو، خۆمان لە پەرێزی قسەنەستەقەکانی خودادا دەشارینەوە، جوانی هەرچییەکمان بۆ بێنێت دەیخۆین، کینە هەرچییەکمان پێشکەشکات وەریدەگرین، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ترس دەدەینەوە، دزێوی دەکەینە بەر خۆمان، بەخیلی دەفرۆشین، دڵپیسی تاقیدەکەینەوە.
سەرۆک، باڵەکانمان مەگۆڕە...
ئێمە ناتوانین هەموو ڕۆژێک فڕینی خۆمان بگۆڕین
سەرۆک نێچیرەکانمان مەگۆڕە...
ئێمە ناتوانین هەموو ڕۆژێک تفەنگی خۆمان بگۆڕین

# فریشتەیەکی گەمژە لە بەفرا

ئەی خودا... لێرە هیچ شەیتانێکی لێ نییە
لەناو ئەم سەهۆڵەدا بەهانەیە نادۆزمەوە بۆ تورەبوون لەم ئاسکە شەرمنانە
لکەیەک نابینم لە سەر شەرەفی ئەم گوڵانە
هەموو شتێک لەمن پاکیزترە... هەموو شتێک لەمن شەرمنترە.
لێرەدا تەنیا پاکی هەیە من سەرزەنشتی بکەم
تۆ وەرەو سەیری هێلکەی سپی هەتاو بکە، کە لە بللوری بەهەشت سپیترن
من چیبکەم لێرە کە گوناهێکی لێ نییە لێیخۆشببم
چی لەم درەختانە بکەم، بێخەتا سەیری پرۆشەی جوانی تۆ دەکەن
جگە لە رووناکی هیچی تر نییە من سەرزەنشتیبکەم
بەر لەوەی من بگەم، بەردەکانی ئێرە نوێژیان دەکرد
بەر لەوەی باسی قیامەت بکەم، پاسارییەک دەیگووت :
وەرە و جریوە مەلەکوت ببیستە لە گەروومدا
بەر لەوەی بە تۆ بڵێم ، فێرمکە چۆن ئامۆژگاری گوڵەکان بکەم،
گوڵەکان فێریانکردم چۆن ئامۆژگارییان بکەم.
ئەی خودایە... لێرە کەس شەیتان ناناسێت، ئیدی چی رەجمبکەین؟
من هیچی ترم نییە بیخەمە سەر ئەم پاکییە ئەز نەمتوانی ئەو زریانەنە دەربێنم کە دەگلانە بەفرەوە
ئیدی باس لە چ هێزێکی ئەفسانەیی بکەم لە دڵمدا
کێ بڕوا بە وەعزە ساردەکانی من دەکات لەم بەفرەدا

**کەس لە پشتی فریشتەیەکی خەمگینی وەکو منەوە ناچێتە سەر بەرماڵ**
**هاوڕێم ئەز هیچی ترم نییە، بیخەمە سەر ئەم ڕوناکییە**
**ئەز چوویێتمە هەر خاکێک**
**منارەکانم ڕاسپاردووە چاوەدێری جیشمەتی بولبول بن**
**بە دڕکم گووتوە بچێت بە پێی پاسارییە مەستەکاندا**
**بە بام گووتوە کۆشی گوڵ داداتەوە**
**بە گەڵام گووتوە لە عەورەتی مانگەوە بئاڵێت**
**ئیدی من هیچم نییە بیخەمە سەر ئەم حورمەتە**
**بەدکاران لێرەوە نەڕۆیشتوون، گەروابایە جێ پەنجەیان لەسەر ئەم تریفانە دیاربوو**
**شەیتان نەهاتۆتە ئێرە، گەربهاتبایە، تیشکی لەسەر ئەم ئەستێرانە دیاربوو.**

# چیرۆکی سادەی من و ئاسمان و لەیلام

**لەوەوبەر هەموو ڕۆژێک دەمبینی، هەموو ڕۆژێک لەگەڵما تا قوتابخانە دەهات، بارانی پێدەخوێندم، ئەستێرەی پێ لەبەردەکردم. وەک قورئان ئێورانمان تیلاوەتدەکرد. وەک تۆڕی ماسیگر بانگی بەیانیانمان هەڵدەدا. گوڵمان تەجویددەکرد، سەروبۆرمان بۆ جوانی دادەنا.**
**هەموو ڕۆژێک دەمبینی لە پێشمەوە دەچوو بۆ کێڵگەی ڕوناکی، هەنگاوێک وەک بچوکی من لەنێوانماندابوو. هەنگاوێک میوەی ئەزمونەکانمان تیا بەشدەکرد، پاساری سەر کێڵگەکانمان تیا دەترسان، قەیماغی جووتیارەکانمان تیا دەخوارد. بەهارێک من و ئەو سوار دوو ئەسپ دەبووین، بەسەر دوو درەختدا سەردەکەوتین، دوو کچمان خۆشدەویست...**

لە گەرمەی یاریدا عەرعەری مردنی نیشاندام، لە گەرمەی عەشقدا زەهری هەلاهیلی لەیلام.
ڕۆژێک پێش من لەخەو هەڵدەستا، دەمامکی بەختیاری دەکردە سەرم، دوو دیدەی بۆ دروستدەکردم لە بەرسیلە، دڵێکی پێدەبەخشیم لە پەموو، دەستێکی بۆ دروستدەکردم لەکەتان. دەیگووت تا لوقمانی ئەم کوچەیە هەڵنەستێ... سەیری دەردی خۆت مەکە... هەمیشەش خەونێک وەک بۆنی ڕێحانان لە نێوانماندابوو، خەون بەبەهەشتێکەوە بیکەین بە خەڵوەتی تەقوام، خەونێک بۆ گۆرانی حەبیبەم، بۆ سەمای خودایانەی لەیلام.
هاوڕێمبوو، خوێنی من هەمووی تریفەی ئەوبوو،
دڵم بە ڕەشەبای ئەو لێیدەدا، کە لافاو دەهات چەتری بۆ هەناسەم دروستدەکرد، کە خۆر هەڵدەهات ئەو کەپری من بوو، کە خۆر ئاوادەبوو خوێنی خۆی نیشاندەدام.
نێوارەیەک هەنگاوێکی گەورە کەوتە نێوانمان، خەنجەرێک بە خوێنی زەمانێکی کۆنەوە، فەیلەسوفێک بە پرسیاری ناکۆتاوە دەربارەی فاسیلەی ناکۆتای من و ئەو، کیمیاگەرێک بە هاوکێشەی جاویدانی ئەوو مەعدەنی ژەنگاوی دڵی منەوە...
کەوتنە نێوانمانەوە هەور... کەوتنە نێوانمانەوە باران.
ڕۆژێک بەئەندازەی گێژەن... شەوێک بەئەندازەی تۆڤان
شەوێک هات بۆ ماڵمان نەمدەناسییەوە، هاتبوو ماڵاوایم لێبکات... کە دەستی خستە سەر ڕۆحم دەترسا، کە پەنجەی بۆ دڵم دەبرد دەلەرزی... چاوانی پڕبوو لە پرسیار دەربارەی خوێنی من... دەستی خۆی نەدامێ بۆ سەما. لێوی خۆی نەدامێ بۆ گۆرانی. قوم قوم لە خەندەی یەکترمان خواردەوە... مژمان لە نەفەسی یەکدا... کەسمان باوەڕمان بەیەک نەبوو... نەچوینە ئامێزی خەونی یەک... قاقا پێدەکەنین و دەستمان لەسەر خەنجەرەکانمان بوو... دەگریاین و دەترساین ئەسرینمان هەمووی

ژەهربێت. هات و هەموو تۆزی ڕێگاکانی پێوەبوو... دەیویست بزانم بۆ تۆڵە هاتووە... دەمویست بزانێت بۆ تۆڵە چاوەڕێیدەکەم. مەودای نێوانمان مەودای شەرەف بوو.

هات بۆ ماڵم، لە کوڕی دێرینی ئاسمان نەدەچوو، تۆزی کاروانێکی دوور بە خوێنییەوە بوو... وەک قەتارچی سەردەمی تەتەرە کۆنەکان... سەری سەرتاپا شەونم و جبەکەی تۆزی خەرابی شاران بوو... چاوی لە چاوی هاوڕێ نەدەچوو... خەنجەری وەک خەنجەری دۆست بریسکەی نەبوو... کینەی بۆنی مردنی لێدەهات. نەیدەوێرا بە کۆترکانی بڵێت بنیشنەوە، نەیدەوێرا بە قەڵەڕەشکەکانی بڵێت بڕۆن، نەیدەوێرا بۆنی گوڵەکانم بکات. نەیدەوێرا کتێبم بخوێنێتەوە، نەیدەوێرا کتێبی بخوێنمەوە. هەموو عەشقی خۆی لێشاردمەوە، هەموو عەشقی خۆم لێشاردەوە، ناوی مەعشوقەی خۆی نەگووت، ناوی مەعشوقەی خۆم نەگووت... سنووری فڕینی خۆی نیشاننەدام، بێدەنگ تەماشامکردو بە سادەیی پێمگووت: ئیدی مەیەرە ماڵم، مەیەرە سەیری سووتانی من بە گڕی جەهەنەمی لەیلام.

ئێوارەیەک هات بۆنی گریکە کۆنەکانی لێدەهات، بە دەستە سوکراتییەکانی ژەهرێکی دیکەی بۆ هێنام، وەک ئەفلاتوونێکی پیر بە ژێر درەختەکانمدا پیاسەیدەکرد، فیساگۆرسییەکی منداڵ بوو ژمارەی ساڵەکانی ژیانی دەژمارد، بە وێنەی هێراکلیتسێکی گەمژە دەچووە ناو ئاوی باغی من و دەیگووت »هەموو شتێ دەڕوات، ئاسمان نەبێت«... بێچارە دەیگووت هەر کۆشکێکت بۆبکەم لە گیابێت یا دوکەڵ یا بەرد دەڕوخێت، هەر ژوورێکت بۆبکەم، لە ئێسک بێت یا تەلا یا ئاگر دەکوژێتەوە، هەر عەشقێکت بۆ سازکەم لەگەڵ ئاودا بێت یا خودا یا ئینسان دەمرێت، لە هەر مەعدەنێکت بگرم لە ستیل یا هەوا یا لم دەڕزێت، لە هەر قەڵایەکدا

هەڵتگرم لە تەمبێت یا سەراب یا شوشە دەشکێیت

بە ڕوونی دەستی لە ژیان بەردام
بەڕوونی ماڵی مردنی نیشاندام
پشتیکردە زامی ڕەشی سینەم
پشتیکردە دڵی هەلاهەلای لەیلام

ئەو ڕۆیشت
ئیدی ئێواران بە تەنیا غوبار دەخوێنمەوە
شەوگار تیلاوەتدەکەم...
لم تەجویددەکەم...
سەروبۆر بۆ مردن دادەنێم.

# مرۆڤێک کە نایەت

با لە دایک و بابانەوە دەستپێبکەین، لەو تیشکەوە دەستپێبکەین کە دەبایە لە پشتی باوکاندابایە، لەو وێلاشەی وەک تەرزی مێو خۆمانمان پێاهەڵنەواسی، لەو خوێنەی وەک ئاوی سپی نەمانخواردەوە. باڕاوەستین لەسەر سیحری ئەم نەفەسە، کە ئەم بوونەوەرە بچوکە هەڵیدەکێشێت. ئەم پیاوەی بە ئاشتی قسە لەگەڵ کوژراوەکانی دوێنێدا دەکات، ئەم پیاوەی بە منداڵانی لە دایک نەبوو دەڵێت بوەستن... ئێمە گوێمان لێیەتی و نایبینین... دەزانین ئەو لەوێیەو ئێمە لەوێ نین... ئەو هەیەو ئێمە نین...
ئەو پیاوەی لەسەرسەرمان وەستاوە و ئێمە بە شەقامی زوڵمەتە سادەکاندا،

بەساکاری، دوور لە ئاڵۆزی مەخلوقاتەکان، بەسپێتی سادەبوونەوەی موتڵەقەکانەوە، ساکار وەک ئاوێک نەڕواو نەڕژێ و نەخورێتەوە، وەک شەوێک نەیەت و نەمرێ و نەدرەوشێتەوە، ئاوا بە شەقامی زوڵمەتە جوانەکاندا دەڕۆین. چاوەڕوانین یەکێک چاوەڕێمانبکات، یەکێک دەزانین دەزانێت ئێمە نین، یەکێک دەزانێت ئێمە هەین و نین، دەزانێت ئێمە نین و دەبین. یەکێک... تەنیا یەکێک سێبەرەکەی لەسەر سێبەری لەدایکنەبووی ئێمە دیارە، دەستی لەسەر شوێن دەستی نەبووی ئێمە دیارە، بە ڕێگایەکدا دەڕوات دەبایە ڕێگای ئێمەش بایە، لەدرەختێک دەخوات دەبایە درەختی ئێمەش بایە.

تێنەگەیشتن لە قسەی دووردرێژ دەربارەی فڕینی ڕۆح لە ناوەوە، دەربارەی سەڵتەنەتە دوورەکانی دەرون، ڕۆچوون تا گەیشتن بە بنکی مەرمەڕئاسای نیگا، نوقمبوون تا خۆدان لە دیواری پۆلاینی بینین، کە دەست نەسیمی نێوان بوون و نەبوون هەستپێدەکات، دڵ ترپەی نێوان مان و نەمان دەبیستێت. ئیدی لەوێوە بە بەهانەی ناسینەوەی ڕۆشنایی، دەستدان لە دیواری نێوان خوداو مەخلوقات، بیستنی گریانی گۆمێک لە کاتی لەدایکبووندا

بازدان... بازدان بۆ ناو بەحری ڕۆشنایی

بۆ ناو لافاوی شینی ژیان.

مرۆڤێک کەنایەت، خەیاڵی لای لیمۆیەکە نایگاتێ. فاشستیانە تەماشای سەوسەن دەکات، فاشستیانە لە شیلان دەڕوانێت. وەک گوڵێک نەیەو نەڕوێ و نەکرێتەوە، خەیاڵی لای ئەو دەمامکانەیە مرۆڤ دەیکاتە سەری، لای ئۆردوگاکانی پاشەڕۆژە، لای ئێسقان و خۆڵە لە شەوی ئەم نوتفەیەدا.

مرۆڤێک لەناکاو گوڵی سەرەوخواری عەشق بۆندەکات و ڕێگایەکی تر دەگرێت، بۆنی ڕۆحی سەرەوخواری ئەستێرەیەک دەکات، بە زوبانێک

سەرمای حەرف تەزاندویتی، بە گەروویەکەوە پڕە لە کڕیوەی وشە، دەڕوات بەرەو خەرەندی وەکیەکی هەموو شتەکان، دوور لە زەمهەریری نوسین... دوور لە زەمهەریری زمان. مرۆڤێک کە نایەت، نوتفەی خۆی دەکات بە سەر ئەم گوڵانەداو بەرناگرێت... دەرگای لێدادەخەین، ژیانی لێناکەینەوە. ئەو لەوێیەو ئێمە لێرەین... ئەو دەزانێت ئێمە نیین و ئێمە نازانین ئەو هەیە... ئەو دەزانێت ئێمە هەین و ئێمە نازانین ئەو هەیە...

## چیرۆکی خەندەیەک

ئەی شەو دەست بەرزکەرەوە، بە بێدەنگی کۆتر کۆتر هەموو گیرفانەکانت دەربێنە. یەکە یەکە مرواری کۆن، خوێنی پەپوولە بەمسقاڵ، ڤیرات ڤیرات خەندەی بولبول دەربێنە

خەندەیەک وەک ئاو لە سیمای ئەم پیاوانە دەتکێت. خەندەیەک ڕوناکی لێدەڕژێت، دەفڕێت و بە لێو دەیگرین، وەک خەنجەر دەیدەین لە خۆمان، وەک پەت دەیکەینە گەردنمان.

خەندەیەکە دێت و لە پرسەکانماندا بە پیوە پێدەکەنێت. گاڵتە بە شاکارەکانمان دەکات، دەتوانێ ڕابکات... بگری... پەشیمان ببێتەوە. خەندەیەکە لە مراوییەک هەڵهاتووە بە دوای ڕوناکییدا ڕادەکات، لە درەختێکەوە ئاڵاوە پەپوولەکان دەخەوێنێت. خەندەیەکە ڕەگی قووڵی لە فرمێسکەکانماندا هەیە، ڕەگی قووڵی لە لێوماندا هەیە، لەلێوی ئەو ڤاچاغچییانە ڕادەکات کێڵگە بە پەپوولەکانەوە ئاودیوی پیری دەکەن، زەردەخەنەیەکە بۆنی بەیانیانی هەینی لێدێت، بۆنی ژووری خەوتنی

دایک کاتێک شیری ڕەش دەدۆشێت، کاتێک خەندەی خۆی دەکاتەوەو وەک دەسستەسرِ لەسەر پەنجەرەکان جێیدهێڵێت، خەندەیەک بە قفڵی من و تۆ داخراوە، لێوی ئێمە لە گۆی گوڵڕەنگی کچێتی مژیوێتی، لە دورەوە بانگی ڕۆژ دەکات، لە دوورەوە دەڵێت هەڵبێ ئەی بەیانی سپی، وەرە حەرفی خۆت لە بەر ئاگری تازەی مندا گەرمکەرەوە، وەرە گەرووی خۆت لە بەردەم ڕوناکیدا ڕابێنە، چاوی نە پشکووتوی خۆت بکەرەوە، قاقای باغ ببینە، گوێ لە تریقەی دایک بگرە، گوێ لە پێکەنینی بگرە کاتێک خوێنی سپی دەدۆشێت. لە بیریکە کە تۆ لە نێوان لێوو ددان و قەپاڵ و خواردنی کاڵی باڵندەدا ونبوویت. لە نێوان جنێوو ماچی چرووک و لستنەوەی خوێنی بە جێماوی دوژمندا ونبوویت.

لە بیریکە تۆ ئێوارێیەک لە باڵکۆنەکانمان کەوتیتە خوار، ڕۆشتیت و شوێن پێتمان لە سەر ڕوومەتی بەیانی نەبینی، شوێن پەنجەتمان لەسەر ئێوارێ نەبینی، لە سورەیای ژیانمان کەوتیتە خوار و قۆڵتکرد بە قۆڵی زوڵمەتدا و ڕۆیشتیت... قۆڵتکرد بە قۆڵی بەیانیدا و لە تیشکدا کوژایتەوە. وەکو ئێمە... ئێمە کە لە هەیوانی عەشق بەربووینەوە و هاتین و لە ڕوناکیدا کوژاینەوە. زەبروزەنگی حەرف... تیرۆری وشە لە بیرکە، بفڕە و وەک پەپوولە لەسەر کەپوومان بنیشەوە، ختوکەی ژێر گەردنمان بە، مەڵێ لەبەر پەرژینی ڕستە ناگەمە سەر لێوی ئێوە، مەڵێ لەبەر لێشاوی قسە کێ خەندەی لە بیرە، وەرە ئێمە زمانمان دادەنێین و تۆ لەسەری بنوو، لێومان دادەخەین و لە سەری سەمابکە، گۆنامان دەکەینەوە و تۆ لەسەر پێکەنین بیوەستێنە، وەک چۆن چەتە لە نیوەشەودا قافڵەکان ڕادەگرن، ژیانمان لەسەر پێکەنین ڕاگرە، عومرمان لەسەر قاقا بوەستێنە.

دەنگ بەرزکەرەوە و ڕاستی بڵێ. ئەوەی لێرەدا شەکرێکی سپییە و دەیکەین بە ژەهرەوە، لەویادا ژەهرە و دەیکەین بە نانی سپییەوە. ئەوەی لێرەدا پێدەکەنێت، لەویادا لاشەیە... ئەوەی لێرەدا لاشەیە، لەویادا وەستاوە و بە ئێمە پێدەکەنێت.

## با یار لە ماڵ دەرکەین...

با یار لەماڵ دەرکەین، دەریکەین وەک دەرکردنی گورگێک لە دارستان. با وەک سەگێکی پیر بیدەینە بەر گوللە، وەک گزگلێکی چکۆلە بیخەینەخوار، با چڵکی ئەمرۆمان بە کراسەکانی بسڕین، خوێنی خۆمان بسووین لە دامێنی، درۆ بۆ شەرەفی ڕێکخەین، هیجا لە حەیای بخوێنین... با ماڵی بکەینە تەویلە، یادی پڕکەین لە زبڵی زبڵستان، شەوی پڕکەین لە دڕکی لە چەقۆ بەدتر، نوێژی پڕکەین لە کوفری کوفرستان. بادەریکەین، دەستنوێژی بە ئەتک بشکێنین، لەبەرچاوی دونیا نیقابی پێلادەین... عەورەتی لەبەر ئەم ئاگرە ڕووتکەین... لەبەرچاوی خودا بیدەینە دەست فاسیق... لەبەر چاوی خودا شەیتانی لێجووتکەین.
با یار لە ماڵ دەرکەین. دەریکەین وەک دەرکردنی پشیلە لە حەوشی ماڵ. دەریکەین و بیبەین و بڵێین بخنکێ ئەی خراپترین یار، بڵێین با کرمەڕێزبێت ئەم گۆشتە بە سەرمای زەمهەریری ئەمساڵ، بیخەینە سەر ئاگر ئەم دەستە، بیکەینە پیاڵەوە ئەم خوێنە، فڕێیدەینە سەر شۆستە وەک دز، وەک چرووک، وەک قەحبەی ڕووت و ڕەجاڵ.

**بایار لەماڵ دەرکەین... با ماڵ لە یار دەرکەین**
**دەریکەیـن لـە ئاورنگی بەیانـی، نەهێڵیـن تێکـەڵ بـە تکـەی شـەنم بێت، دەریکەیـن لـە ماڵـێ پـەڕەی گوڵ، نەهێڵیـن تێکـەڵ بـە تـامی مردن بێت... نەهێڵین لێویـدات لـە لێـوی مانگەشـەو، دەریکەیـن لـە سـوعبەت و هـەزەل، دەریکەیـن لـە دەفتـەری ژیـان، دەریکەیـن لـە ڕەشنوسـی غـەزەل.**
**دەریکەیـن لە بالیفـی سپی، دەریکەیـن لە بەهەشت و بـاران، دەریکەیـن لـە سێبەری کەپر، دەریکەیـن لـە شنەبای خەرمان. تڤی لێکەیـن بە ئەنـدازەی تڤی دەریـا لـە ئاسمان، حاشـای لێکەیـن وەکـو حاشـای بەهـار لـە زسـتان.**

**دەریکەیـن... مەحرومیکەیـن لـە هەتـوان و دەوا، لـە بۆنـی خـاک، لـە ڕەنگی ئـاو، لـە پاکێتـی هـەوا. دەریکەیـن لـە غـاری ئەسـپە شـێ، دەریکەیـن لـە خوێنـی عاشـقانی دێ، دەریکەیـن لـە خەنـدەی گیـا، لـە بـزەی سـووری گێلاس، لـە پێکەنینـی هەرمـێ. دەریکەیـن لـە قافیـەو سـەروا، دەریکەیـن لە مۆسیقاو نـەوا. دەریکەیـن لـە سـەوزایی بەهارانێـک کـە دادێ، دەریکەیـن لەلەنجـەولاری زەمانـێ کـە وادێ.**
**بایـار لـە مـاڵ دەرکەیـن، دەرگـا بـە دەرگـاو مـاڵ مـاڵ بـا یـار لـە مـاڵ دەرکەیـن بـێ یـار... بـا مـاڵ پڕکەیـن لـە مەحەبـەت و عەشـق و ئەڤینـی خەیاڵـی ئـەو**
**بێ یار... ژیان پڕکەین لە بوغرد و گوڵاو و میسکی بەهاری ئەو**
**دەریکەیـن و بـە تـارماییەکانی بڵێیـن فەرموون بـۆ جینانـی دڵ دەریکەیـن و بـە سێبەری بێژیـن وا بەخێـر، بـۆ ڕەوزی عاشقانی دڵ**

# وەک دێوانە، هەمیشە بۆ گیا دەگەڕێم

من وەک دێوانەیەک گیام خەبەرکردەوە، وەک دێوانەیەک گیام لە قووڵایی پایزدا ڕاکێشاو گووتم »هەستە ئەی گیا«. وەک یەکێکی مەست بە یارم گووت: تۆم ناوێت، حەزم لە تۆ نییە... کوا چاوە سەوزەکانی گیا. من بە سەربازە ئاڵتونییەکانی بەیانیم گووت، کە بە خودەی تەڵاوە پاسەوانی هەتاویوون »من تەلام بۆچییە، کوا خۆگەوزان... نوقمبوون... خنکانی ناو سپیدەی گیا؟ من بە پاشاکانم گووت، کە هاتبوون بۆ مردن لە بەردەم هەتاودا. من جەنگم بۆچییە؟ وەزیری و گزیریم بۆ چییە؟ سامانی خەزنەکان و لیرەی والییە پیرەکانم بۆ چییە... کوا گیا؟. بە پارکی شارە دوورەکاندا ڕامکرد... خۆم گەیاندە دەرباری خەلیفەکان... خۆم فڕێدایە بەر کەژاوەی سەرۆکە پیرەکان و پرسیم کوا گیا؟... لە بەرسێدارەکاندا دەستمبەرزکردەوە بۆ خودا، نە پاڕامەوە بۆ ژیان... نەمگووت، خودایە تەمەنی بەندەت درێژکە، نەمگووت، با ئەم بەیانییە نەمرم، گووتم ئەی خودا... ئەی گەورەی زەوی و ئاسمان... کوا گیا؟ من بە دارستاندا ڕۆیشتم... ڕوومکردە ئەستێرەکان، لەمزگەوتەکاندا گریام، دەستی واعیزەکانم ماچکرد... ڕومکردە مانگ... گووتم »گیامان بەنێ... گیای زۆر. من بیرم لە بیابانەکان دەکردەوە، لەوانەی شەونمییان نەبینیوە، لەوانەی لە خۆڵبارانەدا گۆرانی دەڵێن، لەوانەی لە سەر لم شیعر دەنوسن. من لە پێناوی ئەو شارانەی لە ترسی خۆڵ ڕادەکەن بۆ دەریا بیرم لە گیادەکردەوە ، لە پێناوی ئەو ژنانەی نازانن خوێنی دڵی خۆیان بەچی بسڕن، لەبەر ئەو منداڵانەی لەسەر شۆستەکان ڕادەکەن و نازانن مانگ لەکوێوە هەڵدێت. من بە بەیانیم گووت، (کە باسی میوەی دوێنێی دەکرد بۆ میوەفرۆشەکانی ئەمڕۆ، باسی وشکبوونی دڵی

هەرمێکانی ئەفغان و سیسبوونی خورماکانی کوفەی دەکرد) : گیامان بەرێ... لەبری خۆڵ و گەرماو بەرد... گیامان بەرێ بەشی ئەوەبکات، لێرەوە تا مەغۆلستان ڕایبخەین... بەشی ئەوەی شیراز و سەمەرقەند داپۆشێت... بەشی ئەوەی هەمووان لە پاوەنەکانیاندا بخەون، کەس بیر لەوە نەکاتەوە، بەیانی باغەکەی دەمرێت... کەس بیر لەوە نەکاتەوە بەرغەلی بەرێت بۆ وڵاتێکی تر.

من هەمیشە بۆ گیا دەگەڕام... ناو خەزنەی پاشا... گیرفانەکانی جەنگ... ڕیواقی نێوان ئیمپراتۆریەتەکان.

هەمیشە ناو خوێناوی ڕاپەڕین... ژێر کورسییەکانی پەرلەمان... ژێر کڵاوی سەرۆکەکان، بۆ گیا دەگەڕام.

دەچوومەوە درزی نێوان شۆڕشەکان و هاوارمدەکرد: ئەی گیا... ئەی چیمەنی جاویدان... ئێوە لە کوێن؟.

دەچوومە کۆنگرەکانی فریشتە، دەچوومە دیوەخانی شەیتان، دەچوومە شورای پیرانی بولبول، ئەنجومەنی دانایانی گوڵزار، دەمگووت : ئەی نوێنەرانی سەوزی... پەرلەمانتارانی بەهار، ئێوە لە کوێن؟

زمانی کێڵگە وشکەکان... شەرەفی درەختی بێگەڵا... باڵۆرەی حەوزە خنکاوەکانی سەرا... هاواری بەراوەکان لە ترسی خۆر... قریشکەی جامێکی خاڵی لە لێواری بیرێک... هەناسەی لێڵی پەرداخێک لەسەر مێزێکی بێمێوان...

دەڵێن تۆ لەکوێیت ئەی گۆمی بێ بریقە و ناز؟
تۆ لەکوێیت ئەی بارانی گیاوەشێن؟
تۆ لەکوێیت، ئەی ئاوی سەوزیساز؟

**من هەمیشە بۆ گیا دەگەڕێم**
**لە ڕۆحی منداڵانی کوژراوی کوچەدا**
**لەدەستی ئەو پیاوانەدا کە لە مردن دێنەوە**
**لەگەڵ یاردا خەوتم و هاوارمدەکرد »تۆ لەکوێی ئەی سەوزایی بێمەودا؟**
**حەبیبە لەماڵ دەریکردم و گووتم: »لەکوێی ئەی ڕایەخی بێئەندازەی سروشت؟**
**عابیدان لە خەڵوەت دەریانکردم و هاوارمکرد:**
**مەدەد ئەی سروشتی گەش...**
**مەدەد ئەی بەهەشتی شاعیران.**
**مەدەد ئەی دەریای پەپوولە...**
**مەدەد ئەی فەرشی جاویدان**

**من ئێستاش بۆ گیادەگەڕێم، ئێستاش کە کفنەکانم دەشۆم و لەبەریاندەکەمەوە. کە لە مردنەوە سەیردەکەم و بانگ لەو باڵندانەدەکەم کە بە ئاست مردنی مندا دەفڕن. دەڵێم:**
**گیاتان نەبینیوە، گیایەک زیندوومانکاتەوە**
**گیایەک بیخۆین و هەستینەوە سەرپێی**
**گیایەک سەفەری ترمان بخاتە سەر... گەردونی ترمان نیشاندات...**
**تەماحی ترمان باتەبەر؟**

# لە کەشتی عەقڵدا بەرەو شێتی

به باڵی حیکمەت بەرەو ماڵی دێوانەکان دەفڕین... ئێمە واین
به باڵی وەفا ڕووەو کوچەی جەفا دەفڕین... ئێمە واین
سوار بەلەمێکی ڕەش دەبین و دەڵێین با بڕۆین بۆ دورگەی سپی
سوار کەشتی خوێن دەبین و دەڵێین تۆ لە کوێی ئەی ئاسودەگی

گوێ بە شەپۆلی هۆش هەڵدەخەین... ئێمەواین... دەچینە بەر لافاوی شەڕ... ئێمەواین... ملوانکەی هوشیاری دەکەینە مل... ئێمەواین... ئاگر لە زانین بەردەدەین... ئێمەواین... دەچینە سەر جۆلانێی گەنجی... ئێمەواین... دەبین بە دەرگاوانی پیری... ئێمە واین... فوو لە شمشاڵی هزر دەکەین... ئێمەواین... دەست لە نەزاکەت بەردەدەین... ئێمەواین... دەڕوێنە بەر قاپیی خودایان... ئێمەواین... نقدەکەین لە جوانی بەهاران... ئێمەواین... دەیژەنین کەمانی عەقڵ... ئێمە واین... دەبین بە خزمەتکاری دڵ... ئێمەواین... تێکیدەدەین کونجی دەروێشانی زانا... ئێمەواین... تێکەڵدەبین بە ڕستەی گوڵڕەنگی دانا... ئێمەواین... دەڕۆین بۆ هەڕاجی شەرەف... ئێمەواین... دەیشکێنین بللوری سافی حەیا... ئێمەواین.

به باڵی جوانی ڕووەو ماڵی دزێوان دەفڕین... ئێمەواین
به باڵی ویقار ڕووەو کوچەی قەلەندەران دەفڕین... ئێمەواین
سوار بایەکی ڕەش دەبین و دەڵێین بابڕۆین بۆ بەهەشتی سپی
سوار باڵی ئاشووب دەبین و دەڵێین تۆ لە کوێ ئەی ئاسوودەگی

# بەشکردن

**کە جیهانمان بەشکرد**
**سبەینێی پۆلا بۆ تۆ**
**دڵی ناسکی بەیانیانیش بۆ من.**
**گیای قەتارچییە خەیاڵییەکانی ئەمشەو بۆ تۆ**
**حەشیشی شێداری ئێواران بۆ من.**
**عەتری سەماکان بۆ تۆ**
**خوێنی درەختەکان بۆ من.**
**کەروێشکی سەراسیمەی ناو دەغڵەکان بۆ تۆ**
**چۆلەکەی بچوکی ژێر تەپکەکان بۆمن.**

**نا هاورێم... نا**
**نیشتیمان بۆ تۆ، شەرەف بۆ تۆ، شەراب بۆ تۆ، یار بۆ تۆ...**
**بۆ منیش، خۆم.**
**گیا بۆ تۆ، دەغڵ بۆ تۆ. ترێ بۆ تۆ، چرا بۆتۆ...**
**بۆ منیش، خۆم.**
**تفەنگ بۆ تۆ، جەنگ بۆ تۆ، خۆر بۆ تۆ، هەور بۆ تۆ...**
**بۆ منیش، خۆم.**
**گوڵ بۆ تۆ، چەقۆ بۆ تۆ، کۆتر بۆ تۆ، خودا بۆ تۆ...**
**بۆ منیش، خۆم.**

# برینداریێک، وەسفی مۆتەکەیەک دەکات

گومانم لە گوڵەکانیان کرد، گومانم لە زیکرو فیکرو کتێبەکانیان کرد... لامکردەوەو سەیری کونجێکی دوورم کرد. چرای شارەکانیان وەک لەدۆزەخدا داگیرسابێت بۆ مردن دەسووتا، گوێم لە دەسترێژبوو لە بادا، گوێم لە تەقەکردن بوو لە تاریکی، گوێم لە هاواربوو لە تریفەی ناو کوچەکان، برینم بینی هێشتا خوێنی لێنەهاتبوو، مردووم بینی هێشتا پێدەکەنی، چەقۆم بینی هێشتا نەگەیشتبووە زام.

شتێک لە هەوادابوو نەناس، تەنێک بوو لە باڵندە دەچوو، بەڵام باڵندە نەبوو... لە ڕوناکی دەچوو، بەڵام نەدەبینرا. هەموو گیانی ئەستێرەبوو، سەرتاپای تاریکی بوو، بەڵام شەو نەبوو... وەک کات نەدەڕۆی، وەک شوێن نەدەمایەوە... پولەکەی نەبوو وەک مردن... لووس نەبوو، وەک ژیان، شتێک بوو بە بێدەنگ دەهات، بەڵام تا دەهات دوورتربوو... تا دوورتریش بایە، پتر شنەیدەهات.

دونیا سەرتاسەری ژنێک بوو نیقابدار، سروەیەک بوو بە دەمامکێکی ڕەشەوە، دەمبینی بەڵام دڵنیانەبووم بینیوومە. دەگریام بۆی بەڵام دڵنیانەبووم دەگریم، ڕەش بوو، سپی بوو، نامۆبوو... بێڕەنگ بوو، پڕڕەنگبوو، دۆست بوو... لە ئاودەچوو، بەڵام دڵنیابووم ئاو نییە... لە گوناه دەچوو بەڵام دڵنیابووم گوناه نییە. گوێم لە زەنگەکانی بوو... بەڵام ئێوارێ سەرتاپای خیانەت و دوودڵی بوو، سەرتاپای فیتنەی نادیارو زەنگی مەترسی نادیاربوو، زەنگ بوو یان تێکشکانی ڕۆحی باڵندەیەک لەناو خۆیدا؟... زەنگبوو یان دەنگی ئاوێنەیەک بوو، خۆی لە دەهلیزەکانی خۆیدا دووبارەدەکردەوە؟... زەنگ بوو یان من بووم بۆ شەوی خۆم دەگەڕام؟ تاریکی سەرتاسەری حیجابی بابردووی ئاو

بوو... ئاوێک لێمدەخواردوومو تامی گومانم دەکرد... تامی فەلسەفەی کانییەکانم دەکرد... لە سێبەری بەرددا تامی لاهووتم دەکرد... تامی تیۆلۆژیای تێنەگەیشتنم دەکرد لە ژیان... شەوبوو، من تامی فەلسەفەی ڕۆژم دەکرد... ئێوارەبوو من لە لاهووتی بەیانیم دەخوێند... باڵندەیەک بە زامی باڵداری خۆیەوە، هەواڵی زامی گوڵی دەهێنا... بەڵام بۆ کێ؟ بۆ یەکێک بای باکوور ئاڕاستەکانی لێدەگۆڕی... بەهەشتیی بوو، بای باکوور دەیبرد بۆ دۆزەخ... شاریی بوو، بای باکوور دەیبرد بۆ جەنگەڵ. یەکێک کە سێبەری من بوو... وەک من شەفرەی برینەکانی خۆی بۆ نەدەکرایەوە، وەک من تادەهات نوقمی سێبەری زەخمە میتافیزیکییەکانی خۆی دەبوو... وەک من لە ژێر درەختەکاندا تامی لاهووتی ئەستێرەکانی دەکرد. بە تەک درەختەکاندا دەڕۆیشتین و دڵنیانەبووین درەختە، من دەمگووت درەختەو هەر منیش دەمگووت درەخت نییە، من دەمگووت ئاومو هەر منیش دەمگووت ئاو نییە، من دەمگووت ئەستێرەیەو هەر منیش دەمگووت ئەستێرە نییە... گوێمان لە تەقە دەگرت لە ناو کۆشکەکاندا... من دەمگووت تەقەی خۆشەویستییە، هەر منیش دەمگووت تەقەی کینەیە، هاوارێک لە بنکی بێقەراری کینە تاریکەکانی شەوەوە دەهات، من دەمگووت فریشتەی پاداشتە، هەر خۆشم هاوارمدەکرد، فریشتەی سزایە... دەمگووت، مۆتەکەیەو مەرگ نییە، وڕێنەیەو زام نییە.

تێکەڵاوبوو خولیا و درۆکانم، تێکەڵاوبوو ڕاستی و ماخۆلانەکانم

خوێنی ئێوارانم بە گوڵ دەڕازاندەوە...مێزی ئێوارانم هەمووی شوێن بادەی گومان بوو. ئەو دەیگووت من هاوڕێی تۆم... بەڵام ئەو کێ بوو؟ من ئازایانە قسەم لە ترسی خۆم دەکرد... کوێرانە بینایی خۆمم دەکردە حکایەت... بچوکانە باسم لە گەورەیی خۆم دەکرد. ئەو تەفسیری منی

دەدایە بەر خۆر... خوێنی منی دەخستە ناو ناوێتە سیحراوییەکان، شەرەفی پێدەبەخشی، جوانی تیادەدرکاند... ژانی منی لە سووتانێکی تر موتووربە دەکرد... زەخمی منی لەگەڵ ڕەشەبای قیامەتدا کۆلاجدەکرد... پێدەکەنی ودەیگووت قسەی تۆ فەتوایە بۆ ئەم جەنگەڵە، قسەی تۆ حەقیقەتە بۆ ئەم درۆنابادە گەورەیە.

بەڵام من کێ بووم... من لە کوێ بووم؟

بێ ئەوەی بزانم من کێم و من لەکوێم
گوێم لە تەقەبوو لە بادا، گوێم لە مەستی بوو لە خوێنمدا، گوێم لە گووللەبوو لە هەناسەمدا، زەمانی بێ زەمانم بینی دەهات، شوێنی ناشوێنم دیت دەڕۆی، دەرگام بینی لە بەر هاوارمدا دەشکا، مەرگم بینی تک... تک لە سێبەرم دەتکا.

## دونیای پێچەوانەی مردووەکان

ئالێرەدابوو کوژرام، ئالێرەدا پیاوێک هات دەیویست خوێنی خۆی نەبینێت.
مردنی خۆی وەک بەردێک هەڵگرتبوو
وەک بەردێک لەو بەردانەی دەیگرینە کۆترکان
وەک بەردێک لەو بەردانەی دەیگرینە ئەستێرە دوورەکان.
پیاوێک بوو، گڵی تەڕی شەوی بەهار بە جومجومەیەوە بوو
بۆی شێداری درەختەکانی گۆڕستان... نم نم... بە هەناسەیەوە بوو
دەیپرسی : بۆ ئەوەی لێرەوە دەڕوات دەبێت بە درەخت؟
بۆ ئەوەی لێرەوە دێت دەبێت بە با؟

بۆ گیا لە مۆمی تواوەی شەوانی عەشق دەچێت
بۆ شۆستەکان هەموو شەونمی ڕەشن
بۆ پەیکەرتاشان لەناو دیوارەکانیاندا تواونەتەوە
بۆ جەستەی ڕەنگاوڕەنگیی نیگارکێشان کشاوەتە ناو تابلۆکانەوە

فڵچەیەک لە ناو نیگارەوە دێت و ئێمە ڕەسمدەکات
دەستێ لە ناو پەیکەرەکانەوە دێت و ئێمە دەتاشێت
گەروویەک لە ناوەوە دێت و قوم قوم ئێمە دەخواتەوە

ئالێرەدا ئاوێنە هەڵمی سەر ڕوخساری ئێمەی دەسڕی، مۆم بوو ڤووی لە ڕوناکیمان دەکرد، پشکۆیوو ئاوی لە ئاگرمان دەوەشاند.
گرێک لە جەنگەڵەوە دەهات و ئێمەی دەکوژاندەوە
قەڵەمێک لە کتێبەکانەوە دەهات و ئێمەی دەنوسی
باغەوانێک لە باغ ڕایدەکرد و ئێمەی دەتەکاند

تەماشاکە، دەرمانە دەرد دەخوا
مەرهەمە پڕە لە زام
شیرینییە بۆتە زەهر
زەهرە پڕە لە تام.

# گۆڤارێک لە خۆر و زوڵمەت

هەموو حەرفەکانیشت تەلابن، هەموو فاریزەکانت لە زیو، هەموو نوختەکانت لە برۆنز و هەموو لاپەڕەکانت لە نیلۆفەر... ئەو پیاوەی کە لێرەوە دێت، ئەو پیاوەی هەموو حەرفەکانی لە لمن، هەموو فاریزەکانی لەدڕکن، هەموو نوختەکانی لە تەرزەن... تۆ ناخوێنێتەوە.

با تۆ دەناسێت... با تۆ دەخوێنێتەوە... با تۆ تەفسیر دەکا ت... با تۆ دەنووسێتەوە.

ئیدی بەس لەپێش چاوی بەیانی ئەم حەرفانە بۆ ڕوناکی بشکێنە، بەس لەبەرچاوی خۆر ڕستە وەرگێڕە سەر زمانی هەتاو، ئەی تەرجومانی تیشک، ئەی باڵوێزی زمانزانی تریفە، بەس ڕستە بدەرە بەر مانگ، بەس ڕۆژەکان بۆ مستێ ڕوناکی بخۆرەوە، بەس کتێبەکان بۆ کەمێک تیشک بگێڕەوە بۆ چاپخانە... ئەوەی تۆ دەخوێنێتەوە خوێنەری ڕوناکیشە، ئەوەی تۆ دەنوسێت پڕیشە لە حەسرەتی هەتاو.

شەپۆل تۆ چاپدەکات... شەپۆلی ڕەش... گیا تۆ پەخشدەکاتەوە... گیای ڕەش

هەموو حەرفە قەقنەسییەکانی خۆت دەربهێنە... باڵندە تۆ دەخوێنێتەوە، باڵندەی وەکو من و تۆ ڕەش، تۆ کە لە ئەڵماسی زوڵمەتیت، تاریکی خۆت بۆ هیچ تیشکێ مەشێوێنە، خوێنی ڕەشی خۆت ڕوناکمەکەرەوە... ئەوەی تۆ دەخوێنێتەوە تاریکیش دەخوێنێتەوە، ئەوەی تۆ دەخواتەوە

پڕیشە لە حەسرەتی ئاو.

هەموو ڕستەکانت لە نوربن، هەمو پەرەگراڤەکانت لە مێخەک، هەموو وتاریکت لە شەونم بێت و هەموو پەراوێزەکانت لە ناورنگ، ئەو پیاوەی لێرەوە دێت و ڕستەکانی خۆڵی بیابانن، پەرەگرافەکانی زیخی بەجێماوی تۆڤانن، وتارەکانی بیدەنگی سەر پلەکانی مردنن... دێت و سەیری پەنجەرەیەک دەکات پڕە لەوشەی بابردوو... لەسەر سەکۆیەک دادەنیشێت و تۆ ناخوێنێتەوە
ئەو مەرگ دەخوێنێتەوە، کێل دەخوێنێتەوە، تۆز دەخوێنێتەوە، هالاو دەخوێنێتەوە.
ڕۆژێک بە سپێتی دێتەدەرێ، بە سپێتی وەک پەرییەک لە لێواری قیامەتدا. ڕۆژێک دێتە دەرێ و حەرفەکانی خۆت نابینی... وشەکانت دەبن بە هەمهەمەیەک دوور لە زاری ئینسان، دوور لە جەبری وشە، دوور لە زەبری هاوار، دوور لە ماڵی زمان.
دەفڕن و ئیتر لە باڵندەکانیان جیاناکەیتەوە... دەخنکێن و لە ماسییەکانیان جیاناکەیتەوە.
بەس وشە بشکێنە بۆ بادەمێک کە تیا نییە، بەس ڕستە هەڵوەرێنە وەک هەنار، دە فارزەیەک دانێ لە یاقووت، دە نوختەیەک دانێ لە ئەڵماس.
سەر لەنوێ حورمەت بدەرەوە بە بێدەنگی
بێدەنگییەک خاڵی لە سێبەری هاوار.
سەر لە نوێ حورمەت بدەرەوە بە لاپەڕەی سپی
سپێتییەک خاڵی لە چاوەڕوانی وشە.
حورمەت بدەرەوە بە نیشانەی پرسیار کە لەم دەفتەرەدا ونبووە، حورمەت بدەرەوە نوختە و فاریزەی شکاو، شەرەف بدەرەوە بە وێرگوڵی زامدار کە شوێنێکی نییە لە تەفسیری ئەم جەهەنەمەدا، خەت لە نێوان دوو

بێدەنگیدا ڕاکێشەو بیکە بە ڕستە. تەماشاکە ئەم پیاوە لەم لمە تێکست دروستدەکات، لەم تەمە گۆرانی سازدەکات، لەم تۆزە کتێب دەنووسێت لە سەراب.

# ئەو باڵندەیەی کە هەرگیز گۆرانی ناڵێت

بەرەو هەر جێگایەک بڕویت لە زەمەندا، بەرەو هەر کاتێک بڕۆیت لە شوێندا، بەرەو هەر دەهلیزێک بچیت لەم شارەدا، بەرەو هەر شارێک بڕۆیت لەم دەهلیزەدا... من دەنگم لێوە نایەت، تەماشای خولیاکانی تۆ ناکەم، بە هێمنی سەردەخەمە ژێرباڵی شتە بچکۆلەکان، گوێ لە هاژەی بەریەککەوتنی شتەکان و نیگارەکانیان دەگرم، سەیری ئاوڕدانەوەی سێبەرەکان دەکەم لە ئەسڵی خۆیان، سەیری خەمی پرتەقاڵ دەکەم لە کاڵبوونەوەی وێنە ئەفلاتونییەکانی خۆی، سەیری هەرەسی ئاسمان دەکەم بۆ ناو گوڵەباغێک.

لەکردنەوەی باڵی پەپوولەیەک دەڕوانم کە وەک کردنەوەی لاپەڕەی کتێبێکی موبارەک وایە.لە هەناسەی چۆلەکەیەک دەڕوانم کەوەک هەناسەی بچوکی خودایەک وایە.

من گۆرانی ناڵێم، تا دەنگم لەم هەوایەدا بۆگەننەکات. ئێوە گۆرانی بڵێن... ئێوە کە لە ناو ئاو و هەوا و ئاگردا بۆگەنتانکردوە.

من گوێ لە جەنگ و جەدەلی باران و وەهمەکانی دەگرم
گوێ لە هەراوهوریای پاییزو هاوڕێکانی دەگرم

بەلام من چیتر ناچریکێنم. چریکەی من بۆ ئەو درەختانەیە کە بۆ

**ئەسڵی خۆیـان دەگەڕێـن. بـۆ ئـەو پەروەردگارانەیـە کـە نازانـن بتـن یـان خـودا.**

**من گۆرانـی نـاڵێم تـا دەنگـم وننەبێـت، ئێـوە گۆرانـی بڵێـن کـە لـە نـاو جەنـگ و تۆڤـان و تاریکـی سێبەرەکانتانـدا ونبـوون.**

**بێدەنگدەبـم و هەمـوو شـەوێک لـە چریکـەی بێدەنگیـدا پیاوێـک دەرگام بۆدەکاتـەوە و دەڵێت بەسەر کتێبەکانی مندا بمرە، چونکە تەنیا باڵـدارە ئارامەکان. ئەوانەی ڕۆحیـان لـە قووڵایـی بـوون جیانابێتەوە... زمانیـان لە بێدەنگی جیانابێتـەوە... وێنەیـان لـە جەستەیان جیانابێتـەوە. هەقیانـە بەسەر ئەم لاپەڕانـەدا بمرن کە بۆ ئەوان نوسراون.**

**من لێرەدا لە ناوەڕاستی هەموو ناوەڕاستەکاندا. لەنـاو ئەو شتانەدا کە نابینرێـن، لـە نێوان دوو گەڵادا کـە ئاگایـان لـە بوونـی مرۆڤ نییـە. لـە شوێنێکدا کۆتر بە شەو دەتوێتەوەو وەک شەکر دەبێت بە ئاو. لە شوێنێکدا شـارەکان وەک لۆکـە شـیدەبنەوەو دەبـن بـە هـەور، زەمـان شـیدەبێتەوەو دەبێـت بـە زەمانـی تـر، قەڕنـەکان دەگوشـرێن و دەبـن بـە شـەراب. لـە شـەربەتی گیـراوەی بێدەنگـی و ئاگـر دەنۆشـین، عەسیری پاڵێـوراوی ئـەم شەڕانە دەخۆینـەوە، کە تیایـدا بریـن وەک سەما دێتەپێشێ، خولیـای ڕەش وەک هـەور بەسـەرماندا دەبارێت، خوێـن وەک ماڵاوایـی دۆست لـە دەستمان دەتکێتەخـوار.**

**لێرەدا من سەدە لە دوای سەدە تـامی شەربەتی زەمان دەکەم..**

**هەرگیـز گۆرانـی نـاڵێم... گۆرانـی ژەهرێکە تـامی ئەم بێدەنگییـە دەکوژێت...**

**تـامی ئـەم هەموو ئارامییە دەکوژێت کە لە نێوانـی درەختەکاندا دۆزیمەوە...**

**تـامی دەریـا دەکوژێت لـە گەرووما... من گەلێـک سەخت گەیشتم بـە تـامی**

دەریـا... گەلێک سـەخت ئـەم بێدەنگییـەم دۆزییـەوە کـە بـە قانوونـی زەوی ناشکێت.

من گۆرانـی ناڵێم، گۆرانـی لـە خـودام نزیکدەکاتـەوە، خـودا بـۆ ئێوە... کـە لـە بێخوداییـدا بۆگەنتانکردووە

# من و سۆفییەکی ئێسک سووک لە ناومدا

من گووتم : هەموو ڕۆژێک خۆر یەکجار هەڵدێت
ئـەو گووتـی لەگـەڵ منـدا، وەرە و هەمـوو ڕۆژێـک چەنـد خـۆرت دەوێـت پێشکەشـت بێـت
من گووتم : هەموو ڕۆژێک دەتوانم سەیری یەک دەریا بکەم
ئـەو گووتـی : لەگـەڵ منـدا وەرەو هەمـوو ڕۆژێـک سـەیری هەمـوو دەریـاکان بکـە
مـن گووتـم : لـە مردنێـک زیاتـر ناتوانـم بمـرم، لەنێـو باڵندەکانـدا دۆسـتم کەمـە، ناتوانـم وەک درەخـت بڕوێم، ناتوانم وەک شـەو پڕبـم لـە هـاواری ئاورنـگ، بـە زمانێـک دەدوێم لـە تیشکدا دەکوژێتـەوە، ڕوناکیم لـە هیچـەوە دیارنییـە، خۆڵـم هیـچ بایـەک نابیـات، دڵـم تێکچوونـی سیسـتمی درەوشـانەوەی گوڵەکانـە. خوێنم لەقبوونـی ڕەگـی ئـەم مۆسیقایەیە، برینم سـەرتاپا نۆتـەی وەریـوی شـەوێکە لـە مەسـتیدا خـۆی بـە تریفـە دەکوشت، دادەنیشم و کتێب لەسـەر کتێب لەسەر گەڵا دەیخوێنمەوە، بـەڵام کە دەمرم ناتوانـم هیـچ شـکۆفەیەک لەگـەڵ خۆمـدا بـەرم. کـە دەمـرم دەبێـت دەسـتم خاڵـی بێـت لـە ئـاو، لـە شنەی بـا، لـە دەنگـی ئەسـتێرەکانی ژوورسـەرم.
ئەو گووتـی : من زیاتـر لـە ژیانێکم هەیـە، لـە هـەزار شـەقامەوە دەچمەوە

سەر هەزار مردن، هەزار پەنجەرەم هەیە بۆ سەیرکرنی یەک بەیانی، هەزار بەیانیشم هەیە بۆ سەیرکرنی یەک غونچە. لەسەر بەربەڕۆچکە سپییەکانی ژیان سەیری ئەو هەموو جوانییە دەکەم کە لە سەرتاپای دونیا دەتکێت. هەر لاپەڕەیەک دەیخوێنمەوە بۆنی هەموو لاپەڕە جوانەکانی تری لێدێت. هەموو وشەیەک دەمباتە سەر دەریایەکی تر لە وشە. هەموو ڕستەیەک بەلەمێکی بچکۆلەیە بەرەو ناوە بێکۆتاکان. لە هەزار بازنەی سەمادا مەلەدەکەم، لەسەر شانۆکان مردن و زیندووبوونەوەی هەموو جنسە خەیاڵییەکان دەژیم. دەمامکی گوڵ و نەورەس و سوێسکەکان دەکەمە سەر. لە ژێر ئەستێرەکانی مندا دزێوی بوونی نییە. جوانی دابەشناکەم، فەزڵی بولبول نادەم بەسەر فەزڵی کەسدا. هەر ژوورێک دەرگام بۆ بکاتەوە دەچم. هەر بارانێک بیەوێت بە سەرمدا ببارێت... باببارێت. بەخێربێن هەمو ئاگرەکان. بەخێربێن هەموو بروسکەکان. جودانییە گریانی من لە گریانی ماسییەکی سووتاوی سەر لم. جودانییە پێکەنینم لە پێکەنینی مێروویەک کە لە ناو گوڵدا دەخەوێت. خۆشی من لە خۆشی ئەم کونەپەپووە دوور نییە کە بەیانی بەرەو مردن دەفڕێت، غەمم لە غەمی ئەو چۆلەکەیە جیا نییە بەیانی لەدایک دەبێ.

سەیرکە... بە زەردەخەنەوە دەچمە ناو ئاگر

لەوسەر بە پێکەنینەوە لە ناو دێمەدەرێ.

من گووتم : لە مێژە دەمەوێت لەسەر ئاگر و لم بنوسم، لەسەر شەهێن و شۆڕەبی، لەسەر هەنگوین و تاریکی. لە مێژە حەزدەکەم کتێبێکی گەورە لەسەر دڵی یەک سۆنە بنوسم، کتێبێکی گەورە لەسەر مردنی یەک ماسی، لەسەر سیسبوونی یەک پاتۆنیا بەر لە بەیانی... حەزدەکەم باسی کۆدێتابکەم لەوەسفکردنی ڕوخسارو جەوهەردا... بەیەکجار هەموو مرواری و تیشک و گەلاو باڵندەکانە ببەمە ناوەوە، هەموو ئیشراق و سووتان و سەراب و خەندەکان بهێنمە بەر خۆر... دەمەوێت هەموو

**ئەوانەی ناگەنە ناو دڵم... بگەن... هەموو ئەوانەی لە قووڵایی مندا ونبوون بێنەدەرێ... تەنیا لە شۆڕشێکی وادا هەموو سەدەف و زیخ و مێرووییەکی ناو دڵم دەگەن بە مافی خۆیان، هەموو کەسێک تاسەر ئێسقان دەمبینێت، دەگرێمەوە بۆ میوانیی پرشنگە بچوکەکان، دەگرێمەوە بۆ نازی ئاورنگەکان.**

**تەنیا لە شۆڕشێکی وادا ئەو ڕەگانە دەدۆزمەوە کە لە خوێنی مندا بۆ درەخت دەگەڕێن**

**تەنیا لە کۆدێتایەکی وادا ئەو درەختانە دەبینم کە لە خوێنی مندا بۆ بولبول دەگەڕێن**

**ئەو گووتی : هەموو باڵندەکانی جیهان لە دڵتان، هەموو گوڵەکانی جیهان لای تۆن، ئەوە تۆیت دڵۆپ دڵۆپ ڕژیت لە »سەرتاپای ئاو«. درەختێک نییە تۆ بیری لێبکەیتەوەو نەبێت بە موڵکی تۆ، کێڵگەیەک نییە تۆ بیناسیت و پڕنەبێت لە میوەی تۆ. هێندە باڵی پەپوولە لە ناوتایە بە هیچ دیدەیەک کۆناکرێتەوە، هێندە دەستی درەخت درێژە لە هەواتدا، بە هیچ پێوانە ناکرێت. سەمابکە تا بزانیت چ دەریایەک لە جوانی لە ژێر قاچتدایە، سەمابکە تابیبنیت چ گەردەلوولێک لە ڕوناکی دەوریماڵی تۆی داوە، سەمابکە تا بەرەو قووڵایی سەوزایی نوقم بیت.**

**ببینە چ یاخیبوونێکی منداڵانە ئەم پیرییەی کردووە بە بەهەشت.**

**ببینە چ ڕوەکێکی سەیر ئەم ژوورەی کردووە بە بەهار.**

**ئاوێک و ئاوێنەکانی سەر لە تینوێتی تۆ تێکدەدەن... دەرچۆ لە مردن لە نێوان خۆت و ئاوێنەکانتدا، کە کەس نازانێت تۆی سەمادەکەیت یان سێبەرەکانت... کە کەس نازانێت تۆی دەسووتێیت یان وێنەکانت.**

**خۆت بە مەتەڵەکانەوە سەرقاڵ مەکە، ئەو گوڵانە ناوبدە کەلەسەر شانت ڕواون، ئەو دەغڵە بەخێوکە کە لەسەر سینەت هاواردەکات، تۆوێک بکە بە ڕۆحتەوە و بە دیارییەوە دانیشە و بیربکەرەوە، شەڕو بەدکاری**

**ئەوەیە، تۆوێک بکەیت بە ڕۆحتەوە و بڕۆیت و بیرنەکەیتەوە، ئەوە بیرکردنەوەیە بە نەمامەکان دەڵێت گەورەبن، ڕامانە بە سونبول دەڵێت وەرە و هەموو پاوەنم لەیەک دەفتەردا بدەرێ. سروود بخوێنە ستایشی شێتی ڕەشەبای تیابێت**

**من لە شێتی ڕەشەباوە فێربووم، سەیری شێتی ئاو و درەخت و ئاگربکەم.**

**شۆڕش ئەوەیە لە گوڵ تێبگەیت...**

**ڕاکە بەرەو ئەوسەری شتەکان، لەوێ پەلکەزێڕینە کلاسیکییەکانی بەهار ببینە، لەمیوەی درەختە ڕۆمانسییەکان بخۆ، ڕیالیزمی دەریا ببینە، سوریالییەتی خۆر ببینە کە لە تێکستەکانی تێناگەین**

**بڕۆ بەرەو هەستی تیشک**
**بڕۆ بەرەو ئەستی هەتاو**
**بڕۆ تا نیازی مانگەشەو**
**بڕۆ تا ڕازی خۆرەتاو**

**بزانە... شەو ئاگای لە تۆ نییە**
**ئەوە تۆیت دەبێت ئاگات لە تاریکی خۆت بێت**
**بزانە... ڕوناکی ئاگای لە تۆ نییە**
**ئەوە تۆیت دەبێت ئاگات لە تیشکی خۆت بێت**

# بۆهیمی و ئەستێرەکان

بە ڕەنگی ئەو فریشتانەی لە دڵتان، فێرنەبوویت ئاو ببیستیت و ببینیت و بنوسیت
بە وێنەی ئەو ئەستێرانەی لە دڵتان، فێرنەبوویت شەو بلەنجێیت و بلەرزێیت و بنۆشیت
بەوێنەی ئەو بارانانەی ڕۆحت، فێرنەبوویت گوڵ لە خەو هەستێنی بە حیکمەت
نە ئاوت ویست، نە شەوت ویست، نە گوڵت ویست، نە باغت ویست، نە جەنەت.

تۆ ساف ڕوناکییت... درەوشانەوەیەکی پەتیت... تیشکێکی پاڵێوراوی لەهەموو غوباری شەو.
تۆ ساف ئاویت... دەریاچەیەکی پەتیت... هەزار ساڵیت لە شەپۆل. تۆ زەمەنیت کاتێک لەشێوەی گۆمێکدا دێیتە ڕێمان... جوانییت کاتێک لە شێوەی زەهرێکدا دەتخۆینەوە... بازنێکیت لە شێوەی زنجیردا دەتکەینە دەستمان... بلوریت و لە شێوەی میتاڵدا دەتخوێنینەوە... شوشەیت و لە شێوەی قەفەزدا دەتنوسینەوە. تۆ ساف دڵیت، ساف باڵێکییت دەفڕیت بەبێ جەستە، کتێبێکی دەتخوێنینەوە بەبێ حەرف، دارستانێکی لە نیگاماندا وەک ئاگر دەتکوژێنینەوە. ئەوە لەشی تۆیە لە خۆڵەمێشی سۆفییەکاندا هەڵدەستێ و سەمادەکات، ئەوە تەنی تۆیە لە کانزاکان نزیکدەبێتەوە... ناشکستەنی میتاڵ دەکاتە بەر... دڵنەوایی دڵی خۆی ناداتەوە کە دەیکێشێت بەسەر بەردا... دڵنەوایی سەری خۆی ناداتەوە کە دەیکێشێت بە ئاگردا... زەردبوونی پەنجەکانی خۆی دەبینێت کە

گەڵای زەمان دەژمێرن... سووتانی قاچی خۆی دەبینێت کە بەسەر پشکۆی منداڵیدا ڕادەکات... ڕەشبوونی دەستی خۆی دەبینێت کە بە خەڵوزی ئەوین سەرتاپا بووە بە زوخاڵ.

تۆ ساف کڵپەیەکی پاڵێوراویت لە هەموو خۆڵەمێشێک
ساف گیایەکی پاڵێوراویت لە بای پاییز
ساف سەرابێکی پاڵێوراویت لە بۆنی ئاو.

تۆ ڕابوونێکی بە هوشیاریماندا تێناپەڕیت، پێویستت بە چاو نییە بۆ بینینی ئەستێرە، ئەو ئەستێرانەش تۆ تەماشایاندەکەیت لە ئاسمان نین... ئەوەی تۆ دەیبینیت ڕوناکی خۆتەو لەسەر تاریکی خۆت دەدرەوشێتەوە... تۆ ئەستێرە نیت، مەشخەڵێکیت لەنێوان بەیانی و ئێوارێدا هاتوچۆدەکەیت... تریفە نیت، کڵپەیەکی لەنێوان ئاو و ئاگردا دیلانێدەکەیت. نا... نا... تۆ ساف گوڵ نیت، بەڵکو پڕی لە جوانی گەڵاکان... ساف ئاسمان نیت، بەڵکو پڕی لە زریان و لە گریانی بەردەکان.

بەڵام موبارەکە ئەم ناسافییە...
ئەوەتا لەشی تۆیە، لە لەشی ئێمەدا وننابێت.
ئەوەتا سەری تۆیە، لەسەری ئێمەدا ناتوێتەوە.
تۆ لە شۆڕشەکانماندا نیت... تۆ لە هیواکانماندا دەژیت.
تۆ ساف ئومێدیت، پاڵێوراو لە خورافاتی دوارۆژ. تۆ خەونی ئێستەیت پاڵێوراو لە هیوای بەیانی. تۆ ناوی سبەینێت نەبیستووە، پاکیت لە ئەفسانەکانی داهاتوو. تەنیا تۆیت شەڕ بۆ ئەمڕۆمان دەکەیت، شەڕ بۆ

ئەم چرکە چکۆلانەیە دەکەیت کە بە هیچ تفەنگێک ناگیرێت، شەڕ بۆ ئەم هەناسەیە دەکەیت کە چەند قووڵتر هەڵیمژین کەمتر دەگاتە بنکی بێقەراری ژیان. شەڕ بۆ ئەم ساتە دەکەیت کە پێش ئەوەی بیناسین لە بیرماندەچێتەوە .

تۆ نابیت بە یادگار، نایەیتە دی، تۆ لە ئومێددا دەخنکێیت.
شەڕانگێزە ئەم پاکییەی تۆ، ناهەقە ئەم هەموو تریفەیەت.

هەموو ئاسمانت کورتکردەوە بۆ سەر یەک ئەستێرە. هەموو مەخلوقاتت کورتکردەوە بۆ سەر یەک باڵدار. حەڵاڵە ئەم بێ قانوونییەت، ئازادییە خۆت لەم ئازادییە ئازاد کەیت، سێبەر بخەیتە شوێنی جەستە، خۆت لە هەوادا بنوسیتەوە، ڕوناک وەک حەرفێکی ژێر هەتاو، تاریک وەک زەیتونێکی وەریو لە ئەستێرە، حەڵاڵە ئەم دەیجورە بکەیت بە ئاوێنە. تۆ ساف ئەستێرەیت، پاڵێوراویت لە شەوقی زەوی.

تۆ لە خۆڵەمێشاکانماندا نیت... تا ئەو شوێنە لەتەکماندایت کە پشکۆین
تۆ کارت بە هەتاومان نییە... تا ئەو شوێنە دۆستمانیت کە تریفەین.
تۆ هەمیشە ئەو مۆمە دادەگیرسێنیتەوە کە با دەیکوژێنێتەوە،
هەمیشە ئەو پێغەمبەرانە دادەگیرسێنیتەوە کە خودا دەیانکوژێنێتەوە.

تۆ لقێکی بچوکی و ئێمە لەشێوەی جەنگەڵێکدا دەتبینین. لەزەتی تۆیە ئێمە لە شێوەی ئازاردا دەیچێژین، بەردی تۆیە ئێمە بە ئاو دایدەگیرسێنین، باڵدارە ئەم بۆهیمییەتەی تۆ و دەسووتێت لەم نیگارەدا،

درەختە ئەم بۆهیمییەتەی تۆ و دەڕوێت لەم وێنەیەدا. سەمای تۆ بەسەر ئەم هەموو سێبەرەدا دەڕژێت. سێبەری تۆ لە ماڵی خۆی دێتەدەرێ و دێتە شەقامی مەستان. تۆ جوانترین خیانەتت لە ئێمەکرد، ئەم درۆیەت هەرزان فرۆشت. بوویت بە شەهوەتێک خاڵی لە هەر نوتفەیەک، بوویت بە نوێژێک خاڵی لە هەر وەسوەسەیەک.

بڕۆ... بڕۆ بۆ ئەستێرەیەک
بەهار بوهیمییانە پەلاماری درەخت بدات، ماسی بۆهیمییانە دەریا بخواتەوە، جەنگەڵ بۆهیمییانە خۆی بکاتەوە، ئاسمان بۆهیمییانە خۆی دابخات.

# پاسەوانێک لە زنجیر تێناگات

چەند سەیرە ئەم باغچەیە، کە پڕە لە بەلاغەتی تێکشکاوی غونچە، پڕە لە سێبەری مردووی گوڵ، وەک باغێک قسەدەکات پڕبێت لە یاسەمینی کێو، پڕبێت لە میتافۆری نێرگس، پڕبێت لە جیناسی مێخەک، پڕبێت لە سیحری سێو.
پاسەوانێک سەری لە خۆرئاوابووندا سپی کردووە. دڵی لەم شەوەدا بووە بە قاموسی تاریکی. لە هیچ نەوێیەکی نێرە، لە هیچ نێرەیەکی ئەوێ تێناگات، شوێنێکی دەوێت ساف وەک دڵی پەپوولە بێت. تێناگات ئەوە دەرگایە دادەخرێت نەوەک باغ. ئەوە قەفەزە دادەخرێت نەوەک بولبول تێناگات گیا نابەسترێتەوە، شەو ناونادرێت، گەڵا کلیلی نییە، سێبەر قفڵناکرێت.
لەبەردەم هەموو درەختێکدا پاسەوانێک دەڕوێنێت، دەتوانێت دەنگی خۆی

لە خۆرنشین هەڵکێشێت، ڕەنگی خۆی بخاتە ناو تێزابی تیشکەوە. ئەودیو ئەم چیغە بلووریەی ئەو سەرتاپا لاشەی ڕەنگاوڕەنگی منە، ژێر ئەم گومەزەی لە ئاوازی باڵندە چنراوە سەرتاپا بێدەنگی منە. من لە هەموو میوەیەکی ئەودا کوژراوم. لە هەموو باڵندەیەکیدا دیلم، لە سەرەتای ئەودا من هێشتا نا ئاشنام بەسەرەتا، لە کۆتایی ئەودا من بووم بە ناکۆتا.

من شەبەیخونیم بینی بۆسەر مانگ، من بۆسەیم بینی بۆ نێرگس.

لەنێوانماندا:

برینێک ئاگری لێدێتەدەرێ. غونچەیەک وەهمی لێهەڵدەقووڵێت، ژاوەژاوێک ئاوی لێدەتکێت.

لەنێوانماندا:

باغەوانێک خەریکی کێشانەی ئەفسانەکانی گوڵە، خەریکی چنینەوەی ئەو کڵپانەیە کە لە سنەوبەر ڕادەکەن. ئەو تێناگات، کۆتر وڵاتێکی نییە داگیریبکەین. سێو قەڵایەکی نییە بیگرین. هەرمێ بورجێکی نییە بچینە سەری. تێناگات، ئەم هەموو زنجیرە، هەناسەی پاتۆنیایەک نابەستێتەوە. ئاخی شەوبۆیەک ناگرێت.

بە خۆی و زنجیرەکانییەوە کڵپەی خۆی بە کڵپەی باڵندەکانەوە گرێدەدا.
دەچێتە بێستانێک درەختەکانی بێڕەنگ لە هەوای عەدەمدا دەشنێنەوە
دەچێتە سەر گۆمێک ماسییەکانی بێ ئاو لە قووڵایی نەبووندا مەلەدەکەن
بە زنجیر تەمی ئەم هەڵاڵە مردوانە دەهێنێتەوە سەر گوڵ
بە زنجیر ڕۆحی ئەم چۆلەکە کوژراوانە دەخاتەوە سەر چڵ
خۆڵەمێشی درەخت دەدات بەدەم ئاسمانە پەژموردەکانەوە
لە ژێر سێبەری شێداری هەرێزەکاندا ئاوێنە دەدۆزێتەوە بۆ بینینی باغی تر

لە نالەی گوڵەباغەکاندا ڕێگا دەدۆزێتەوە بۆ ناسینی ئاخی تر.
بە خۆی و پاسەوانەکانییەوە پاسی گوڵێک دەکات تەنیا لە خەیاڵدا هەیە
ئەو دەستی لە ستایشی ئەو هەنگانەدا هەیە کە شانەی حەرام دەچنن.
پاسی پەپوولەیەک دەکات تەنیا لە یادگاردا هەیە. من پەلاماریم بینی بۆسەر دواشکۆفەی ساڵ، بە پیرێتی خۆی پێدەکەنی لە بەر ئاوێنەکاندا، کە شەو دەهات دەگەڕایەوە بۆ سەر شەترەنجی شەڕ. کشماتی لە پاتۆنیاکان دەکرد، کشماتی لە خۆی دەکرد، کشماتی لە دالیاکان دەکرد.
بەخۆی و تفەنگەکانییەوە تەقە لە تەنهاییەک دەکات، تەنیا لە مردندا هەیە.
لەودیومانەوە:
لەیەک بستدا سەدەها شەو هەبوو، لەیەک ژووردا هەزاران بەیانی هەبوو.
گەڵایەک دەبوو بە هەزار بەهار، بولبولێک دەبوو بە هەزار باڵدار.
بەخۆی و قامچییەکانییەوە ڕقێک پاواندەکات تەنیا لە ئەڤیندا هەیە
بەخۆی و ئەفسەرەکانییەوە شارێک داگیردەکات تەنیا لە عەدەمدا هەیە

## ستایشی من بۆ دەسەڵاتداران

ئێوە گەلەک شۆخن، بەیانیان وەک پاساری ڕیقنە بەسەر حەقیقەتدا دەکەن
گەلەک مەزنن، شەوان وەک کوکوختی ڕیقنە بەسەر تریفەدا دەکەن
ئەمە دیاری ئێوەیە؛ میللەتێک بە سەد دەست لێتانڕادەکات، نەتەوەیەک هەزار قاچ قەرزدەکات و دەچێتە ناو هەزار ئاگر و هەزار باڵ دەخوازێت و بە هەزار نینۆک بە سەر زەمینی هەزار بێگانەدا دەڕوات، میللەتێک

خۆی بە هەزار ڕەشەبا و هەزار جەنگەڵ و هەزار دەریا دەبەخشێت، گیرفانەکانی پڕدەکات لە تووتڕکی هەموو میللەتانی تر. دەنوشتێتەوە بۆ هەزار دەریاوان و دەلیل و ئەستێرەناسی تر.
ئێوە واتانکرد بۆیەکەمجار جەهەنەم لە بەهەشت جوانتر بێت.
دەریایەک لە خۆڵەمێشتان بۆ داناین و گووتتان ئەمەیە ڕوناکی، لمتان بۆ کردینە کاس و گووتتان ئەمەیە شەراب، شەیتانتان بۆ ڕازاندینەوەو گووتتان ئەمەیە خودا، کینەتان دەرخوارداین و گووتتان ئەمەیە ئازادی.
ئێوە واتانکرد بۆ یەکەمجار تاراوگە لە ماڵ جوانتربێت.

ئەمە خەڵاتی ئێوەیە، میللەتێک لە با دەپارێتەوە دەریای لێنزیکبکاتەوە. میللەتێک قیامەت بەکرێدەگرێت، مەحشەر زەخرەفەدەکات، تابووت دەژمێرێت، کفن بەسەر ئێوارەکاندا دابەشدەکات، بە تلیاکی هەموو جەنگێک خۆشنوودە، بەحەشیشی هەموو کینەیەک ڕازییە.

ئێوە واتانکرد بۆ یەکەمجار شەیتان لە خودا جوانتربێت.

# گوێگرتن
# لە پارچەیەک غەزەلی زەوی و زەریا

*با کاغەزەکانمان دەربهێنین، ئەمشەو میراتی خودا بەشدەکەین. یاقووت و میوەی باغاتی تاریکی، سەلامی کۆتر و توڕەبوونی تاووس، ئەمشەو منداڵی پێغەمبەران، نهێنی شکاوی خودا دەدەینە یەک. من و تۆ پێویستیمان بە پەرستگا نییە، سوژدە بۆ گەرداوەکانمان دەبەین. ئەو ئایاتانەی لەسەر سنگی ئێمە نوسراون لە هاواری ئاسمان ڕونترن،

**ڕونتـرە سـەوزایی درەختـی ئێمـە لـە سـەوزایی باغـی نەبینـراوی خـودا، گەرمتـرە تینـی ئاگـری ئێمـە لـە تینـی کـورەی داگیرسـاوی خـودا.**

*** ئـەی دەنگـی برینـداری کەنـار، ئـەی ئـەو دۆسـتەی هێنـدە لـە دەرگامدایت هەمـوو دەسـتم خوێنـە، ئـەی ئـەوەی هێنـدە هـاوارم لێکردیت هەمـوو گـەرووم بـووە زام، ئـەم لمـەی نێوانمـان دەردی جوداییمانـە. سـەیرکە هەموومـان زامداریـن، ئاگـر و بـا، خـاک و خەیـاڵ، باڵـدار و ناباڵـدار خوێنمـان لێدەتکێت. من سـەردەخەمە سـەر سینەی تـۆو دەگریـم بـۆت، ئـەم پەنجـە بچوکانـەت لەلـم ماچدەکـەم، ئـەم دەسـتە بچوکـەت بـە سـەدەف دەگوشم، ئـەم هەنگاوەت بـە مرواری ستایشـدەکەم. ئـاوی من چییـە جگـە لـە خزمەتکارێکی بچوکـی ماڵـی تـۆ، سـەیری گـەورەییم مەکـە، من لەبـەردەم درەختێکـی تـۆدا دەبـم بـە تنۆکـێ ئـاو، من بـە ئـەورەس، بـە ئەسـفەنج، بەمەرجـان ستایشـی ویقـاری کەنـارەکانـت دەکـەم.**

*** وام هەسـتدەکرد لـە نێـوان ئێمـەدا درەخـت دەبێـت بـە تەرجومـان، هـەر جۆگەیـەک تـۆ دەیبینیت مەرمەڕی عەشقی منـە، خـۆم لـەم دەریاچـە و گـۆم و ڕوبارانـەدا دەنووسـم، دەمەوێت هەمـوو سروەیەکم بۆنـی دەسـتی پاکت بکات. من بـە بولبـول، بـە هەناسـەی مێرگـوزار بانگـی تـۆ دەکـەم. ئـەم بەردەنوێـژە ڕوناکانـە پاشـماوەی دۆعـای منـن بـۆ تـۆ، ئـەم بـەردە خوێناویانـەی کەنـار گـەرووی نوسـاوی منـن کـە تۆیـان پـێ ستایشـدەکەم. ئـەو هەورەبروسـکانە دەنگـی منـن سـەردەدەن بـە سێبەری خۆیانـدا. من بـە ڕونـاکی پڕاو لـە زامـی پەروانـە، بـە تینوێتـی سـەر زاری ئـەو دەروێشـەی بێوچـان سـەمادەکات... بانگتدەکـەم. سـەری شـەپۆلەکانی خـۆت بهێنەپێشـەوە، بـا گـەرووی ئـەم بیابانانـەم ببینیت کـە گـەرد بـە گـەرد دۆعـا بـۆ تـۆ دەکات. دڵـی تـۆ لـەوە نازکتـرە بەرگـەی تـکای ئـەم هەمـوو لمـە بگرێـت، بەرگـەی هـاواری ئـەم زیخەڵانـە بگرێت کـە بـە نـور زمانـی خۆیـان تەڕدەکـەن، بەرگـەی ناڵـەی ئـەو**

**هەموو کاروانە بگرێت کە سۆزی من بەرەو سۆزی تۆ دەهێنن، ئەمشەو ناوی خودا بەشدەکەین، سەرەتای سایبەر و کۆتایی هەتاو بەشدەکەین.**

***من سەرەتای هەموو گوڵێکت ماچدەکەم، کۆتایی هەموو باغێکت ماچدەکەم، سوژدە بۆ نیوەڕۆکانی تۆدەبەم کە لەناوقەددا دەبنەوە بە بەیانی، سوژدە بۆ ئەو ئێوارە پاکانەت دەبەم کە هەر لەسەرەتاوە پڕن لە کزەی بەیان. ئەوە پەنجەی شەوی تۆیە کە پەنجەی بەیان بەرنادات، ئەوە هەناسەی هەتاوتە سەرشارە لە هاڵاوی باران، من زاری ئەم بەردە بچوکانەت ماچدەکەم کە کەفی عەشق بە لێویانەوەیە، سەرەتای قسە و یەکەم حەرفی سروودی تۆ ماچدەکەم.**
***لە دەنگی نووساوی ئەم درەختە ببورە، کە نازانێت چۆن باسی تۆبکات، زانستێک نییە بتوانێت ئینشای ستایشی تۆ دارێژێت، ئاوناسێک نییە تۆ ڕاڤەکات، ئەلفبایەک نییە تۆ بنوسێت. هەموو چەکی من ئەبجەدییەتی ئەو کەنارانەیە کە لە گەرووی تۆوە فێری هاواربوون، من لەدەستی درەخت درێژترم نییە، بیخەمە سەر جەستەت، بەڵام تۆ لە قووڵایی بێبنی خۆتدا تەماشای نائومێدیم دەکەیت، دەستی من بە هەموو گەڵاکانییەوە دڵۆپێک لە سالاری تۆ هەڵناگرێت، جوانی تۆ شتێک نییە لەپی من نەسووتێنێت، شتێک نییە بەسەر ڕامان و سەرسوڕمانی مندا نەڕژێت، من بە دووری ستایشی نزیکی تۆ دەکەم، بە پەشۆکان ماچی دڵنیاییت دەکەم.**

***ببورە گەر ماسییەکم بە غەمگینی هاتە بازاڕی تۆ، لێمخۆشبە گەر شەپۆلێکم کامەران لە ئامێزی تۆدا نەمرد، ئەمە شەوی بچوکبوونەوەی لێوی منە بۆ ماچی شەونمی تۆ. شەوی سوژدەی ئۆقیانوسی منە بۆ بچوکترین ئاورنگی تۆ. من کڕنووش بۆ سینەی دوێنێت دەبەم کە پڕبوو**

لە شیری سبەینێ، کڕنووش بۆ بەرچنەی دوێنێت دەبەم کە پڕە لە بەرسیلەی پاشەڕۆژ. من سەرەتای ڕۆژ و کۆتایی شەوی تۆ ماچدەکەم. من بەراورد بە گەلایەکی تۆ هیچ نیم جگە لە ڕیزێک سەراب، بەرابەر بە سامانی تۆ سەدەفێکم شکاو. بەرامبەر بە شەرابی تۆ پیاڵەیەکم گەدا، بەرابەر بە پاکی تۆ ناوی من لە شەرمدا دەمرێت، من بە نرکە ستایشی بێدەنگی تۆ دەکەم، بەگەرداوەکان لە خۆم دەدەم، بە شەپۆلی ڕەش تۆڵەی ئەم بچوکییە لە خۆم دەکەمەوە. بە چەپۆکی نەهەنگ دەکێشم بەسەری خۆمدا.

*تۆ گوێ لە سکاڵای من مەگرە، بیستنی تۆ کە سەرتاپا لایلایەی خوداییە، کە سەرشارە بە ستایشی جوانی خۆت، تەنیا جێگای ئەو ئایەتانەی تیا دەبێتەوە کە دەربارەی پاکی خۆت دێنە خوارێ، خودا لە تۆدا ستایشی خۆی دەکات، لە تۆدا قووڵی خۆی دەدۆزێتەوە، لە تۆدا کۆتایی بە موعجیزەکانی خۆی دەهێنێت

*هەموو ئاوی دونیا هەنگاوێکی کورتە بۆ گەیشتن بە خونچەیەکی تۆ، من چیم جگە لە هەزاران شەپۆلی لە بیرکراو، تۆ هەموو بستێکت ناوێکە، بێ دەلیل لە هەموو باغێکی تۆدا وندەبین، بێ نەخشە ناتوانین بچینە هیچ هەرێمێکی بچوکی تۆوە، من ڕوون و سادەم، ون و بێناوم، نە شارم پێیە نە میوە، بەخیلی بەم هەموو ناونیشانانەی تۆ دەبەم، بەخیلی بەم هەموو هەتاوە زێڕینە دەبەم کە تینوێتی تۆیان ڕاگرتووە. ڕەشەبای تۆ ستونێکە لە تەلا، گەرداوی من سکالایە لە پوچی خۆم، نیوەی ئاو سەدای هاواری خۆمە، نیوەی ئۆقیانۆس ئاوێنەیەکە بۆ بینینی دووبارەبوونەوەی خۆم. من جگە لە هەڵهاتن لە خۆم ڕێگایەکی ترم نییە پیابڕۆم. ئاڵۆزی من دووبارەبوونەوەی خۆمە لە پێچاوپێچەکانی خۆمدا،

ئاڵۆزی تۆ، جیاوازی ڕەهای تۆیە لەگەڵ خۆتدا.

* تەنیا تۆ ڕاستگۆیت کە هەمیشە بەیەک نیگارەوە دەگەڕێیتەوە، تۆ ڕاستگۆیت کە لە هەموو دڵۆپێکت هەمان جوانی دەتکێت، لە هەموو گەروویەکت هەمان هەناسە دەبیستین، لەهەموو دەنگێکت هەمان هاوار. تەنیا تۆ قەشەنگیت کە تیشکی تۆ ڕاست و چەپی نییە. ماڵی تۆ ئەمبەرەوبەری نییە. دەرەوەی تۆ هەر هەمان تەلیسمی ناوەوەتە. تۆ ڕاستگۆیت کە لە ناوی کەس ناخۆیت، دەستنابەیت باڵندەکانمان ڕاوبکەیت، دەستنابەیت میوەمان لێبکەیتەوە. ئەوە منم گەرووی خۆم بۆ لە بەرکردنی دەنگی تۆ تەرخاندەکەم. ئەوە منم بچوکانە دەستدەبەم بۆ بەروبوومی ماڵی تۆ. منم کڕنووشدەبەم بۆ وەڵامی ساردترین سڵاوی تۆ.

* ئەی زەوی، ئەی دۆستی من، من بەم مەخلوقاتە بێدەنگانەی خۆمەوە ناتوانم دیوانی غەزەلی خۆم شەرمنانە هەڵنەگرم و نەگریم، من ئیبلیسێکی بچوک، کەڕولاڵێکی گەورە، گەمژەیەک لە پێستی هەوردا، نەفامێک لە دروستبوونی خۆی تێناگات، من کە زمانم نییە شەپۆلی خۆم تێبگەیێنم، کە ڕێزمانم نییە ناوی خۆم و وەسفی تۆ جیاکەمەوە. بەم ماسییە لاڵ و ڕۆبیانە ترسنۆکانەوە، هەموو ڕۆژێک زیاتر خۆم لە تۆ دەشارمەوە، شەرم لە بەراوردی خۆم دەکەم بە ڕەنگی بەیانییەکی تۆ، شەرم لە گۆڕینەوەی هەموو مرواری خۆم دەکەم بە هەناسەی گوڵەباغێکی تۆ. بێدەنگبە ئەی زەمین، بیستنی من شایستەی گوێگرتن نییە لە سیحری دەنگی تۆ، گەرووی ڕەشی من شایستەی قسەکردن نییە بۆ گەلایەکی مردوو لە زەردترین خەزانی تۆ.

# سەرۆک ئەمە دونیای ڕەشی تۆیە

سەرۆک پەپوولەکانمان بەسەر ئاسندا دەفڕن، هەناسەمان ئاشنایە بە هەناسەی میتاڵ، شەڕ خزاوەتە سەری کەنارییەکانمانەوە، داروی ڕەش بۆتە بەشێک لە دەرمانمان، سەری گەنمی ئێمە هالاوی تەنیایی گرتوێتی، خەرمانی ئێمە پڕبووە لە پێکەنینی ڕەش. سەرۆک ئەمە کۆلێرایەکی کۆنە لە کوچەی ئەم ئەسپسوارانەدا یاریدەکات، ئەمە قات و قڕی تەیمورە گەڕاوەتەوە بۆ فەرهودی بێستانمان. ئەمە تاعوونی جارانە ئالاوە لە بەندۆڵی زەمان، ئافاتی جارانە چۆتەوە سەر شکۆفەی خوێنمان.

سەرۆک ئەوەتەی تۆ پێدەکەنی، ئاو هەمووی دەگری، ئەوەتەی تۆ بەیانیان زوو تەماشای بولبول دەکەیت، گوڵزار هەمووی دەخەوێت، ئەوەتەی تۆ شەوان دەگریت، ئەستێرە هەمووی پێدەکەنێت.
سەرۆک کێ هەیە نەزانێت کە تۆ یاقووتێکت هەڵگرتووە پڕە لە ورشەی خشڵی ئێمە، تۆ ئاوێکت ڕشتووە پڕە لە لافاوی دڵی ئێمە، لەو کاتەوەی تۆ دێیتە سەر دەریا، ئاو حەزی لە خۆکوشتنە، لەو کاتەوەی تۆ دەچیت بۆ تەماشای کەنار، بەلەم هەوەسی لە خۆ خنکاندنە.
ئەمە دونیای ڕەشی تۆیە... ئەمەیە قیامەتی خوێنینت، ئەمەیە دابەزینی هەتاهەتایی تۆ لە شەمەندەفەری جوانی، سەعاتی دابەشبووی تۆ لەنێوان خۆر و خیانەتدا، ئەمەیە ئێوارێی شکاوت لە نێوان شەوی سپی و نیوەڕۆی قەترانییدا.

سەرۆک کە تۆ بۆنی خونچەیەک دەکەیت، هەموو گوڵی دونیا دەگری.
کە تۆ تەماشای هاوین دەکەیت، هەموو وەرزەکان چاوی خۆیان دەگرن.

کە تۆ کۆترێک دەکوژیت، لەو ساتەدا هەموو باڵندەی دونیا دەکوژیت .

ماڵاواییکردنی ڕەش لە بەیانی هەموو درەختێک، ئێوارەباش لە خوێنی هەر فریشتەیەک، سەلام لەهەر کوژراوێکی سپی بە کفنی ئەرخەوانییەوە، دۆعا بۆ خنکانی هەر تووتییەک بە هاوارێک لە گەرووداٍ، هەڕەشە لە بایەکی مەست یاخی لە حورمەتی بادە، تێکەڵبوون و ئامێزان و مردن لە باوەشی گوڵدا، سواربوون لە گالیسکەی سپی مەستان، نوستن لەسەر فەرشی هەموو ئەستێرەیەک. کردنی شیر بەسەر قەترانی هەموو کینەیەکدا، دۆزینەوەی بەختیارییەکی ڕەش لە زوخاڵی مردندا، دەرهێنانی کڵپە لە سووتووی هەر ئەفینێکدا. ونن لە قەترانی شانشینی تۆدا، ونن لە دەیجوری مەملەکەتی تۆدا.

ئەمە دونیای ئەرخەوانی تۆیە
ڕەنگی خۆرئاوابوون بەسەر ڕۆحمانەوە دیارە
باڵی ڕیشۆڵە سوورە، کە لە ئاوێنەی بەیان دەخشێ
ڕەنگی ماسی شینە کە لە ئاوی مەرگ دێتەدەرێ.

سەرۆک کاتێک تۆ تەماشای کاتژمێرەکان دەکەیت، زەمان دەوەستێت. کە تۆ دەوەستیت، شوێنەکان دەڕۆن... کە تۆ هەڵدەستیت دارستان دادەنیشێت.
لە سەر درەختی زەردتدا، باڵندەی خوێنین دەنیشێتەوە
بەسەر کێڵگەی سپیتدا بارانی ڕەش دەبارێت
سەرۆک یادەوەرییە شینەکانمان پڕبووە لە سێبەری سپی تۆ
زامە سەوزەکانمان پڕبووە لە یادی نەمامی تۆ.

سەرۆک کەی ئەو دەستانەمان دەدەیتەوە کە مانگی پێدەگرین؟ کەی ئەو

جەستەیەمان دەدەیتەوە کە دەریای پێ سەرسامدەکەین؟ ئەمە دونیای مۆری تۆیە، دونیای ئەو لاولاوانەی تا ئەندازەی خنکان لە گەروومان دەنالێن، ئەمە کوچەی خۆڵەمێشیی تۆیە، کوچەی ئەو باڵندانەی تا سنووری شێتی لەسەر شانمان دەخوێنن.

سەرۆک کە تۆ دەڕۆیت، ئێمە لە مردن دێینەوە و دەچین بۆ ماڵی سپی یاران

کە تۆ دەمریت، لە گۆڕ هەڵدەستینەوە و دەچینەوە بۆ کوچەی سپی جاران

سەرۆک بمرە، با ئێمەش لەگەڵتدا بمرین کە نانی ڕەش بەخێوماندەکات، ئەو ڕووەکانە بمرن کە هەوای ڕەش لەئامێزیاندەگرێت، ئەو شەرابانە بڕژێن کە شەو دەیانخواتەوە، ئەو سێبەرانە بسووتێن کە تۆفان دەیاننوسێت.

## هاوار لە ئەبەدییەت

بانگمکە، بانگی زەمانی بچوکم کە، بانگی سینەم کە کە بۆتە سەعاتێک بۆ پێوانەکردنی جاویدان، بانگی دەستم کە کە ترێی تۆ کردوێتی بە ڕەز. بانگی ترێم کە کە لێوی تۆ کردوێتی بە شەراب. بانگمکە، بانگی باڵی پۆلاینی سیمرغە بچوکەکانم کە، بانگی قەقنەسم کە کە ئەفسانەی تۆ کردوێتی بە زوخاڵ، بانگمکە. کە تۆ بانگمدەکەیت، ڕەنگی زەمان دەگۆڕێت. کە تۆ دەمپێویت، من دەبم بە فریشتە. کە بۆن بە سەرابتەوە دەکەم، دەبم بە ئاو، بانگمکە، کە تۆ بانگمدەکەیت، سەرتاپا لمی نێوانمان دەبێتە هاوار. بانگمکە، یان گەرووی خۆتم بەرێ بانگتکەم، من لەوە وشکترم بگەمە سەر ئۆقیانوسی تۆ، من لەوە بێباڵترم، بەبێ

بانگ بگەمە قەراغی شاری تۆ. بانگمکە، من ئەتڵەسی زەمانم پێ نییە تا بانگتکەم. بانگمکە تا ماڵی خۆم بسووتێنم و دوای بانگی تۆبکەوم، هاواری خۆم بخنکێنم و دوای هاواری تۆ بکەوم. یەک ماچی تۆ بەسە سرووی جیهان جێبهێڵم و بێمە باوەشی گڕی تۆ، یەک دەستی تۆ بەسە، دەست لە بەهەشت هەڵگرم و بێمە سەر لمی سارای تۆ. لە پوچی ئەم ژووره بچوکانە، لە بچوکی ئەم پێچە ڕەشانەی کات، لە پوچی بەیانی و ئێوارێ، لە پوچی شەو و ڕۆژ ئازادمکە و بانگمکە. چیتر لە سپێتی ئەم ساتەنەدا ناژیم، تا قیامەت بمخەرە گۆمی ڕەنگی خۆتەوە و بانگمکە. ئەی ئەبەدییەت تۆ پێش خۆت نابینی، بمخەرە پێش خۆتەوە و گوێبگرە بانگتکەم.

بانگمکە، ئەو وەرزانەی سەرتاپا خوێنی سپیین، لە نێوانماندان. ئەو پاوانانەی پڕن لە لەوەڕی گەرم، ئەو شارانەی ڕوخاون بە بۆمبای پاییز، بە تەقینەوەی میوەهاتی ڕەش، لێرەدان. مینی چقڵداری وەهم دەتەقێتەوە بە خەیاڵمدا، سێوی دڕکداری مردن دەتەقێتەوە بەدەستمدا، قارچکی شەڕ بۆردمانمدەکات، بەڵام تۆ بانگمکە، با لەم سەدەفی خەڵوزەوە، کە گەرووی پڕکردووە لە ئاگری مرواری بێمەدەرێ، لەحوکمی ئەم کلیلە دەرچم کە بەری دەستمی پڕکردووە لە زەخرەفەی قیامەت. ئەمە چاوەڕوانی تۆیە لە سەر خۆڵەمێشی ئەم قەقنەسە هەڵدەپەڕێت، حەسرەتی عەنقایە لە سەری مندا بەرەو ڕووی تۆ دەفڕێت. بانگمکە، من دواجار خوداحافیزی لە هەموو زنجیرەکانم دەکەم و بانگتدەکەم. تۆ لەم بیرە دەرمبهێنە کە خودا منی تێخستووە، لەم قەفەزە دەرمبهێنە کە نازانم کەی هاتوومەتە ناوی، لەم ژوورە دەرمبهێنە کە نازانم کێ دروستیکردووە، ئەم قفڵەم بشکێنە کە نازانم کێ کلیلی کردووە.
ئۆقیانێکی گەورەیە گوێگرتن لە سینەی تۆ. سەعات تۆ ناپێوێت، ڕۆژ و

**ساڵ و سەدە ناتگرنە ئامێز، سپییە ڕۆژژمێری شەپۆلەکانت، تۆ دولبەرت نییە، ترپەیەکی ناکۆتای جەفایە حیسابی عەشقی تۆ. بانگمەو بمخەرە بەردەم ماڵی خۆت، بابانگتکەم. تێکەڵمکە، ئاوێتەی مەرهەمێکم کە، کە دەخرێتە سەر زامی زەمانی تۆ، با دەمی هەموو ئەو برینانە بگرم کە نەبەدییەتیان لێدەتکێت. با خوێنی ئێستا نەتکێت لە ناکۆتا، باچلکی زەمان نەنیشێت لە نازەمان. بانگمکە. من ئاشنام بە نازەمان، لە ژمارە دەرمبهێنە و بمکە بە جەوهەر. لە دیالەکتیکی هاتونەهات دەربازمکە، بمخەرە دەرەوەی ماتماتیک، زائیدی گوڵەباغم کە، لەگەڵ ڕەهای تیشکدا کۆمکەرەوە، لە ئاوم دەرکە و بەسەر هەوادا بەشمکە، لەگەڵ قیامەتدا بمخەرە کەوانەوە، زەربی ناکۆتام کە، دامنێ با توانی سەرشانم نەستێرەبێت، با خۆر لۆگاریتمی من بێت، با ڕوناکی دووجای هەناسەم بێت. لەگەڵ تریفەدا بمخەرە ژێر ڕەگەوە، ڕاستەوانەی من لەگەڵ موتڵەقدا دەربهێنە، پێچەوانەم لەگەڵ بولبولدا بدۆزەوە.**

## بۆ خودا ئێمە ناناسێتەوە؟

**بۆ خودا هەندێ جار، چۆلەکەکان ناناسێتەوە؟**
**بۆ هەندێ جار بە شەتڵێک ڕێحانە، باغچەی لێتێکدەچێت؟**
**بۆ هەندێک بەیانی سڵاومان لێناکات و دەڕوات؟**
**بۆ هەندێ ساڵ بانگماننناکات بۆ کەربەلای نەیارانی خۆی؟**
**بۆ دەزانێت ئێمە ئاهەنگدەکەین و نایەت تەماشامانبکات؟**
**بۆ فەزڵی گریانی کوکوختییەک دەدات بەسەر گریانی ئێمەدا؟**
**بۆ بە هاواری گوڵێک ئیدی بەهار ناناسێتەوە؟**

# ترس
# لە تێکچوونی جیهان لەنێوان خۆت و سێبەردا

دەترسم و دەگەڕێمەوە بۆ ژووری کۆنی جاران، بۆ لای یەکێک بە ڕێکەوت دەیبینیت و دەیناسیت و دەیکوژیت، بۆ لای یەکێک بە ڕێکەوت دەتبینێت و دەتناسێت و دەتکوژێت. دەترسم و دەست درێژدەکەم بۆ بێستانێکی کۆن، پەنجەم پەشیمانمدەکاتەوە لە خواردنی میوەیەک کەسەرتاپای تەنهاییە.
من دەترسم لە نانی هەتاو بخۆم نەوەک پڕبێت لە تاریکی، دەترسم تەوقە لەگەڵ تریفەدا بکەم، نەوەک دەستی پڕبێت لە دەیجور. دەترسم و لەگەڵ تیشکێکدا دەفڕم، بەرەو شارێک بە ڕێکەوت لادەدەیت و چادەخویت و عاشق دەبیت و دەمریت، شارێک بە ڕێکەوت دەتهێنێت و دەتبات و دەتکوژێت. شارێک خاڵییە لە مۆسیقای زەمان، خاڵییە لە فڕینی باڵندە، چۆڵە کۆڵانەکانی لە هاواری تۆ. من دەستم ناگاتە دەرگاکان، کوچەیەک بانگتدەکات و پێچاوپێچ بە سەرابی خۆیدا دەتبات، کوچەیەک بانگیدەکەیت و بە ئاوێنەی خۆتدا دەیبەیت، دەتبات و دەست ناخاتە سەر زامت بزانێت چۆن خوێنی لێدەڕژێت، دەیبەیت و دەست ناخەیتە سەر دڵی بزانیت چۆن پڕبووە لە خەیاڵ. من دەترسم و دەگەڕێمەوە بۆ ژووری کۆنی جاران، بۆ لای بابەک پیربووە بە دیار درەختەکانەوە، بۆ لای زەمانێک لەسەر ئاوێک وەستاوە و ناڕوات. بۆ لای یەکێک بە ڕێکەوت لەسەر شێوەی خۆت دروستیدەکەیت، بۆ لای یەکێک بە ڕێکەوت لە شێوەی خۆی دروستتدەکات.
دەترسم و بەرەو درەختێک دەڕۆم بە ڕێکەوت میوەکانی تامی من دووبارەدەکەنەوە، بەڕێکەوت پاییزی ئەو لە پاییزی پیری من دەچێت. دەترسم لە سێبەریدا بخەوم، نەوەک سێبەرەکانی جەستەی من

دووبارەبکەنەوە، دەترسم سەرکەومە سەر لقەکان نەوەک لە باڵندەکانی بچم، دەترسم بڕۆمە نێوان گەڵاکان، نەوەک بە ڕێکەوت خەزانی ئەو دووبارەبکەمەوە. دەترسم و لە سێبەری ترسەکانمدا پیاوێک دەبینم لە خۆم دەچێت. پیاوێک بە ڕێکەوت لە ترسی خۆی ڕادەکات و ڕاکردنی لە ڕاکردنی من دەچێت. دەترسم و بەرەو پیری بیابانێک دەچم، بێلێوارە وەکو خۆم، بەرەو بایەک دەچم، سەر لە سێبەری ئەم کوچەیە تێکدەدات، بەرەو کۆڵانێک لایلایەکانی من دووبارە دەکاتەوە، بەرەو حەوشەیەک گڕوگاڵی من تیا دەنگدەداتەوە. من و ئەو لەوسەری بێستانێک بەیەکدەگەین، ئەو بە من دەڵێت: من تۆم، من بەو دەڵێم؛ تۆ منیت. ئەو بە من دەڵێت؛ من سێبەرم و تۆ ڕاست، من تەماشای خۆم دەکەم و دەگریم و دەڵێم: تۆ ڕاستیت و من سێبەر.

من دەڕۆم بەرەو شارێک بە مەبەست هاواری من دووبارەدەکاتەوە
بەمەبەست خەونی من لەسەر کۆشی خۆی دەنوێنێت
لەویادا بەیەکێک دەگەیت نەمامی مەرگی تۆ دەچێنێت
بەڕێکەوت دەتناسێت
بەڕێکەوت گوڵی تۆی خۆشدەوێت
بەڕێکەوت دەتڕوێنێت.

لە شاری ترسە دێرینەکاندا
سەیری دەرگایەک دەکەیت بۆنی لایلایەی لێدێت
دڵت پڕدەبێت لەترس
کاتێک دەگەڕێیتەوە بۆ پرسیار لە کوچەی دایک
دەستدەبەیت بۆ کلیلی قاپی کۆن
دەمدەبەیت بۆ سێبەری شاتووی باوک

لەشت دەبێت بە کڵپەیەکی ڕەشی زام
زەهر دەبێت بە ماڵی بولبول
خوێن دەبێت بە ڕەنگی شەمام.

لە دەستێک ڕادەکەیت بەڕێکەوت لە ژوانێکی ڕەشدا دەتخنکێنێت. بەڕێکەوت دەستت دەگرێت و دەتبات بۆ گۆمی هات و نەهات، بۆ شوێنێک تۆ لەوێ سێبەریت، بۆ ماڵێک تۆ لەوێ بوویت بە یاد.

# ژیانی ڕۆژانەی شەپۆلێک

لە ناو جەنگەڵی جوانی ئەم ڕۆحلەبەرە شینانەدا، لەناو شکانەوەی تیشکدا لەسەر بللوری ئەم برینانە. هێزێک لە تۆفانی گوڵ بەهێزتر، غەریزەیەک شین وەک سایەقەی ئاسمان. لە بناوانی هێمنییەکی ئەفسواناوییەوە، شەپۆلێک لە سەرابێکی زیوین، بە بازووی پاڵەوانێک بە هێزی ڕوناکییەوە، بە مەچەکی خودایەک لە تینی خۆر، وەک یەکێک پاییزی خۆی لە ناو هەڵکێشێت و موعجیزە کۆنەکانی خۆی تەلاپۆشبکاتەوە. لە قووڵایی ڕوناکییەکی دوورەوە دێتەدەرێ، هەستانی لە هەستانی باڵدارێک دەچێت، کە جەستەی لەسەر درەختەکان مردووە و ڕۆحی لە هەوادا دەفڕێت. تورەیی لە تورەیی ڕوناکییەک دەچێت لەسەر گەڵایەک بەجێماوە و تەماشای شەودەکات. هیچی لە دەریا ناچێت، بەڵام لێرەدا کەوتۆتە ناو گەمارۆی ئۆقیانووسەکانەوە، ئەو شەپۆلێک نییە لە ناو، بەشێکە لە شێتی خوداکان، کەرتێکە لە ئەستێرەیەکی دوور، کەرتێکە لە شفرەیەکی ناتەواو، نیوەی داخراوی تەلیسمێکە شکاو. ئەو ناو نییە، خودایەکە لە دەریادا تواوەتەوە. بە هێزی گەردەلوولەکانەوە

سەری خۆی دەکێشێت بە تریفەدا، دەسورێتەوەو دەگەڕێتەوە سەر هەمان هەناسە، لە توتییەک دەچێت کە دەفڕێ و دێتەوە سەر هەمان وشە. لەخنکاوێک دەچێت کە دەمرێت و دێتەوە سەر هەمان ئاو. لە خەو هەڵدەستێت و بەرچایی خۆی دەباتە سەر بورکانەکان، نانی بەیانی لەلای ئاگرێکی نەمرەوە دەخوات. دەچێتە یارییەکی خوێنینەوە لەگەڵ قولاپەکاندا، تۆڕەکان پڕدەکات لە بەروبومی خۆی. فێری هیچ نابێت، مژینی تیشک نەبێت، تەنیا ئەوانە

دەناسێت کە دەسووتێن و دێنەوە سەر هەمان ئاگر، لەسەر ئەو بەردانەوە دەخەوێت کە دەبنە گزنگ و دەبنەوە بە بەرد. گوێ لەو گەردەلوولانە دەگرێت، دەبنە هێمنی و دەبنەوە هاوار
خۆی لەگۆڕانێکی بێقەرار هەڵدەکێشێت
دەبێتە شیرینی و دەبێتەوە بە ژار
دەبێتە گوڵ و دەبێتەوە بە خار.

نا، ئەمانە وشەکان نیین، وشە ڕاستەقینەکان لە خاکدان، لە دەریادان، لە هەوادان، لە تۆدان.

«والت ویتمان»

# ١

# مارشێکی تر بەرەو بەهەشت

من دەمەوێت بە شێوەی تر بچینە بەهەشت. دەرگای تر، فڕینی تر، شێوەی دیکە هەیە بۆ گەیشتن بە باغاتی عەدەن. تێکستی تر هەیە دوایکەوین، تیشکی تر هەیە وەک شمشێر هەڵیگرین. دەبێت گوێمان لە زەنگی عەردێکی دیکە بێت.

وەک باڵندەیەک لە باکورەوەڕا بۆنی نێچیربکات، دەبێت بۆنی زەمان بکەین. بۆنی چەرخێکی دی بکەین، قەڕنێکی دیکە لە تەڵا، ڕۆژگارێکی تازە لە برۆنز. بەهەشت لەوێیە، لە شوێنێک هەموو زانینێک بە ئازادی و گوڵ فریوماندەدەن، هەموو باغێکی غەمگین کە نیلۆفەر تیاییدا ناخەوێت دەمانکوژێت. ئێمە سەرەتا لێرەدا دەوەستین و چاوەڕوانی ئەو کەسەین کە هەوای بەهەشتمان بۆ شیدەکاتەوە. ڕیتمی ئەو باڵدارانەی بە خوێندنی خۆیان دۆزەخــمان بۆ پڕدەکەن لە کامەرانی. ڕیتمی ئاو کە خیانەت لە سەرچاوە دوورەکانی خۆی دەکات، ڕیتمی گەڵا کە پاشەوپاش بەرەو شکۆفە دەگەڕێتەوە. شتێک لە زمانی ئەم تەفسیربازە تێدەگەین کە قسە لە برینی باڵندەکانی بەهەشت دەکات، قسە لە تەماحی ئەوان دەکات لە ئاگر، قسە لە گەرمی دۆزەخ دەکات، بەرابەر بە سەرمای جەنەت. قسە لە خەراباتی عەدەن و خەراباتی وەتەن. چۆن خەڵک باس لە مردنی ئینجانەیەک دەکەن، ئاوەها باس لە کۆتایی بەهەشتە درۆزنەکان

دەکەم. تۆ چۆن باس لە کوژرانی چۆلەکەیەک دەکەیت، ئاوا باس لە کوژرانی خودا دەکەم. ئێمە بەپێ بەرەو شارێکی تر دەڕۆین، بەرەو سەردەمێک سەرابی تیا نییە، سەردەمێک هەموو خەیاڵاتێک لێرەیە، ئاوی ئاو دەهێنێت و تینوێتیت بە حەرفەکان دەشکێت، ئاوی زێڕ دەهێنێت و بەردەکانی بەردەمت دەبن بە تەلا، بەرەو سەراب دەڕۆیت و تێدەگەیت سەرتاپا شەتاوە. بەرەو شارێک بەختەوەری دەمانکوژێت، شادییەکی ئەبەدی ڕۆژەکانمان پڕدەکات لە دەنگی عەندەلیب. هێندە لە جوانیدا نوقمدەبین تادەخنکێین، هێندە گۆرانی دەڵێین تا گەرومان لەتدەبێت. من هەمیشە هاواردەکەم با بڕۆین بۆ بەهەشت. تۆش دەڵێیت، هاوارمەکە با جەنەت هەڵنەستێت و باغەکانی ببات و بڕوا. من هاواردەکەم و تۆ دەڵێیت: ئیدی کاتی ئەوەهاتووە تێبگەن... یەک باڵندەی خەمگین دەتوانێت بەهەشتمان لێحەرامبکات، یەک عەندەلیبی خەمگین دەتوانێت دڵمان پڕبکات لە خەفەت. دەبێت وریابین یەک کەروێشک کە بە ترسەوە لە بەر پێماندا هەڵدێت، دەتوانێت هەموو ڕێگاکان تێکبدات، یەک کۆتر کە بەهەڵە دەفڕێت، دەتوانێت نێوان هەموو ئەستێرەکان بئاڵۆزکێنێت.

وەک شەڕکەرێک کە هەمیشە دەکێشێت بە تەپڵە گەورەکانی جەنگدا. یەکێک نەفخی هەستانەوەی ڕۆحلەبەرەکان لێدەدات، یەکێک شەیپوری گەشانەوەی هەموو خوڵەمێشەکانی دونیا، گەشانەوەی پشکۆی مردووەکان، ئەو ئاگرانەی لە ڕۆژگاری هانیپاڵەوە خامۆشبوون، زیندووبوونەوەی پەنگری خێوەتگاکانی هۆلاکۆ. من هەمیشە دەکێشم بەتەپڵی ئەم جەنگەدا و هاواردەکەم من بۆ فەتحی تۆ لێرەم ئەی بەهەشت. ئەوەتا بەهەشت لە هەر چوارلاوە دێت. کە لێرە دەڕۆین ئەوسا دەزانین بەهەشت لە پشتمانەوە بوو، کەدەگەڕێینەوە تێدەگەین بەهەشت وا لە دوامانەوە، کە دەگەڕێینەوە بۆ دوا تێدەگەین بەهەشت لەولا لە بەردەمماندا بوو.

**هەڵهاتن لەسەر ڕیتمی ئەسپێک کە پێش نور دەکەوێت، هەڵهاتن و جیابوونەوە لەهەر غەزەلێکی کلاسیک بۆ باغات و گوڵزار، مارش بە تەنیا بە شەیپورێکی ڕەشەوە، لە دەشتێکی سەوزدا بەرەو ئەوسەری تورەییەک کە بە شیعر وەسفناکرێت. بە ئەفخێکەوە کەسەرەتای وەرزەکانی تۆفان ڕادەگەیێنێت، تورەبوون لە هەر ڕێبوارێک کە بە ناوی بەهەشتەوە لە ماڵ دێتە دەرێ. تورەبوون لە یەکێک ناوێرێت بەتەنیا لەدیواری ئیمانی خۆی دابەزێت، ئەوەی کەلەپچەکانی ناشکێنێت و لەسەر دیوارەکان بنوسێت: «ئێرەیە بەهەشت، منم بەهەشت، دووریی لە خودایە بەهەشت».**

**بەهەشت ڕوخانی هەموو مەعبەدەکانە. گەڕانەوەی ئینسانە لە ماچی خوداوە بۆ ماچی گوڵ، دەستگرتنە بەسەر خەزنەی زەندیقە دێرینەکاندا، بەشداریکردنە لە زیندووکردنەوەی عەسرە بەباچووەکان، قەڕنە تەنیاکان، ئەو سەدانەی پادشاکان میللەتانیان هەڵدەبژارد، شەڕ قارەمانەکانی دەدۆزییەوە، شمشێر جەنگاوەری لە خەوهەڵدەستان.**

**بێئەوەی هیچ بەهانەیەک بدۆزینەوە، بێئەوەی بەهەشتمان دیبێت، بێئەوەی ئاوازێکی ترمان پێبێت بۆ بولبول، دڵنیا لە تەفرەیەک لە منداڵییەوە لە خوێنماندایە، دڵنیا لە فیتنەیەکی سپی، لە لەعنەتێکی شین » شین وەک ئاسمان«. بەسادەیی خۆمانەوە، بە گوێڕایەلی موسافیرێکەوە کە دەچێتە شارێک و لەوێ لە نرخی نانێکی سپی دەپرسێت، لە نرخی هەنارێک دەپرسێت، لەسەر دوا سەبەتەی بازاڕ، دێین و لە گوڵ پرسیاری نرخی جەنەتێکی تر دەکەین، دێین و لە بولبول دەپرسین: ڕێگا لێرەوە چۆنە**

تا بەهەشت؟ تێشوومان هەتاوی زەردی ئێوارەی ئەم کوچانەیە، ناوی بەختەوەری لە مەرکانەکان دەخوێنەوە، بێئەوەی جەنگێکی دیکەمان پێبێت بۆ ئەم سوارچاکە بێنیشانەی لە بەردەرگاکانی خۆیان باوێشکدەدەن، جارێ بۆ غەزایەکی خەیاڵی دەدەین، جارێ بۆ داگیرکردنی بەهەشت، هەرەسی دیوارەکانی نێوان باڵندە و ئینسان، فەتحکردنی مەلەکوت، حەڵاڵکردنی داوێنی فریشتە، بەدیلگرتنی ئیزرائیل، بەرزبوونەوە بۆ مەقامی باڵا، بۆ شوێنێک کە وشە نایگاتێ، لەو دیو سنووری مەخلوقاتەوە، نزیک، نزیک لە جەبەروتی بێئەندازەی خودا.

هەر یەکەمان بەهەشتێکمان دەوێت بۆ خۆی، بەهەشتێکمان دەوێت بۆ منداڵەکانمان، بەهەشتێک بۆ ئەو دەروێشانەی لەگەڵ خەڵوەتدا ناتەبان، بۆ ئەو زەندیقانەی لەگەڵ شەیتاندا شەڕدەکەن. بەهەشتێک بۆ ئەوانەی هەموو عومریان سەرتاپا تۆبەیە، بۆ ئەوانەی هەموو ژینیان سەرتاپا گوناهە.

بەهەشتی نزیک لەگڕ
نزیک لە تۆفان
نزیک لە شەیتان
بەهەشتی جودا لەیەکتر
جودا لە ئاسمان
جودا لەخودا.

# ٢

# لە چاوەڕوانی لەدایکبووندا

نەسیمێک دێت، هەمووی گوڵاوی باڵندە خەوتووەکانە
بایەک دێت پڕە لە خورافاتی پاییز، شەوێک پڕێتی لە ناڵەی جەنگاوەران
تۆ لە دایکدەبیت و ئەهریمەن نازانێت غەریزە بەدەکان چ بەختیارییەکت بۆ دەهێنن. ئەهریمەن نازانێت ئەو هەنارەی بەدەستی تۆوەیە، چ تامێکی وەحشییانەی هەیە. چ دا\ڕندەیە ئەم بۆنەی لە بای بەیانی دێت، چ ڕوناکە ئەو دەنگەی لە تاریکی جیابۆتەوەو کوێرانە بۆ بێدەنگی دەگە\ڕێت. لەدایکدەبیت وئاسمان زەنگ بە زەنگ عەرشە شوشەییەکانی خۆی بۆ ستایشی تۆ پاکدەکاتەوە. تۆ خودا نیت، بەڵام غەریب نیت بە خوداکان. فریشتەنیت بەڵام فریشتە بەختیارە تۆ فریشتەبیت.

هەوا شێدارو خەمگینە، بەڵام کوچەکان پڕن لە هاڵاوی ژیانێکی پاک. سەختە ئیشی ئەم \ڕەنجبەرەی ئاو لە جۆگەی خورافەتەکانەوە دەگوازێتەوە بۆ گۆزەی ئێمە، وەحشییە ماندوێتی ئەم خزمەتکارەی شوێن دەستەکانی ئێمە دەخاتە سەر شوێن دەستی بەهار. وەحشییە و سەرسامە بە هەوای بەیانی، سەرسامە بە خوڕەی ئاو لە \کاتی کردنەوەی دەرگای ئومێدا. سەرسامە بەو مۆسیقایەی لە پەنجە بریندارەکانی یەکێکەوە دێت، کە شمشاڵەکەی کەوتووە و هەوا دەژەنێت، هەوایەکی ڕەش کە وەک پیانۆیەکی سپی وەهایە و ئێمە بە نۆرە دەیژەنین، ئێمە کە پەنجەکانمان

برینە و هەموو ئەم دەفتەری نۆتەیەمان کردووە بە خوێن. چ شادە ئەم مۆسیقارەی برینی ئێمە دەژەنێت. شەو شێدارو خەمگینە، باران پڕە لە مۆسیقای غەمبار. بەسەر ئەسپێکەوە کە فێربووە لەسەر ئیقاعی مردن ڕەوتبکات، بەبەردەرکی ئەو گۆڕستانانەدا دەڕۆم، مردووەکان لەسەر لێواری سپی گۆڕەکانیان دانیشتوون، مێشولە لە درەختەکان دەردەکەن، مێشولە لە مانگ دەردەکەن، بەدەست غوباری یاد لە کێلەکانی خۆیان دەسڕن و بانگماندەکەن: ئەی ڕێبوار، ئەی ئەوەی لەسەر ئیقاعی مردن دەڕۆیت، لەسەر ئەو ئەسپە وەرە خوار.

تۆ خۆر نیت، بەڵام خۆر غەمگینە کە تۆ خۆر نیت.
تۆ خودا نیت، بەڵام خودا غەمگینە کە تۆ خودا نیت.

شەو شێدار و خەمگینە، بەڵام زوڵمەت هێندە نییە زەوی تاریک بکات، بۆ ئەوەی هەموو تاریکی ببینین، پێویستمان بە زوڵمەتی تۆیە، پێویستمان بەو چاوە تاریکانەت هەیە کە لە دڵی تۆوە سەیری کۆتر دەکات، گەر لەدایکنەبیت.. ئێمە لەبەر ئەم ڕوناکییەدا چیبکەین؟
چیبکەین لە خەوتن بە ڕووتی لەبەلەمێکدا ماسییەکان لە ژێرەوە تەماشای ڕۆحمان دەکەن؟ چیبکەین لەو ئاوازەی مۆسیقارەکان بە هوشیاری دەبات و بە مەستی دەیانهێنێتەوە؟ چیبکەین لە غەریزەی خۆمان کە جەستە لە تاقەتی نایەت؟ نا... نا تاریکی ئەم ئێوارەیە بەشی نوقمبوون ناکات لە خۆماندا، نوقمبوون تا ئەو جێگایەی یادەوەری دەبێتە پیانۆیەک لە پیانۆکانی پاییز، یادەوەری دەبێتە شمشاڵێکی ڕەش، دەبێتە فلوتێکی خنکاو. من نوقمدەبم لە ناو خۆمدا و تاریکی مردن بەشی کوێرێتی من ناکات. تاریکی مردن ناتوانێت ئەم مۆمە جاویدانەی بینین و هوشیاری

خامۆشبکات، من نوقمدەبم و هوشیاریی بەرەو دۆزەخ دوامدەکەوێت. من نوقمدەبم و نوقمبوون عەقڵم لەگەڵ خۆیدا دەبات، تا پتر ڕۆبچم حەکیمانەتر دڵم بەسەر باغدا دەکرێتەوە، من بۆ کوێرێتی دەگەڕێم و زوڵمەتم بەشی هیچ ناکات.

پێویستیم بە تاریکی تۆیە، تاریکی تۆ... تاریکی تۆ.

تۆ لەدایکدەبیت و پیسی ئاو، بۆنی ئەو خواردنە ڕزیوانەی هاوین فەرامۆشیکردون، دەنگی پێی ئەو سوارچاکانەی بۆ مەنزڵێکی ئەبەدی لێرەوە دەڕۆیشتن لە سەر جەستەت بوو. تۆ بۆنی خوێنت لێنەدەهات، تۆ بۆنی ڕزینی ئەستێرە، بۆنی کەوتنەخوارەوەی تیشک، بۆنی پەژموردەیی کات، بۆنی خەرابی ئاوت لێدەهات... تۆ لە ڕەحمی غەریزەکانەوە، لە ڕەحمی عەقڵێکەوە کە ئیتر بیرناکاتەوە هاتیت. بۆنی درمێکت لێدێت، دەردێک بەیانی تووشی خوێنپژانمان دەکات. دەردێک ئێمە دەیدەین بە گوڵەکان و تووشی پژانی شکۆفە و خەرابی خونچە دەبن.

شەو شێدار و خەمگینە، ئێمە دەگەشێینەوە، چەژنی هەموو شکۆفەکانمانە، ئیرادەمان لە خەرابی ئەم کێڵگەیەدا بەشدارە، داسی ژەهرمان هەیە، دروێنەی خوێناوی دەکەین، لەسەر هیچ وەرزێک ناوەستین، خۆر با بمرێت لە هاوارەکانی خۆیدا، ئێمە گێلاسێک دەنێژین تەنیا لە زوڵمەتدا دەخورێت. سەیرکە کتێبەکانمان گوڵی قەدەری لەسەرە، لە دەستماندا مستیلەیەک هەیە، بازنێک هەیە موڵکی ئەمیری جەنگە لەیادچووەکانە. موڵکی جەنگاوەرێکە ڕزیو لە ژێر خۆردا، ئەمیرێک بە قەڵغانی خۆی و بە شمشێری ئێمە پێدەکەنێت.

ژیـان شێدار وخەمگینـە، من خـۆم لـە نـاو تەمێکدا دەدۆزمەوە هیچی لە ژیان ناچێت. ژیـان سـارد و خەمگینـە، دەنگێـک لـە دوورەوە قسـە لـە ڕێگایـەک دەکات لـە تەنیشـت ژیانـەوە، قسـە لـە نەدۆزینـەوەی ئینسـان دەکات بـۆ ئینسـان. ژیـان شێدار و سـاردە وەک مردنـی سێوێک لـە دەستی پاییـزدا، من دەستم پڕدەکـەم لـە شپرزەیی ئـەم بارانـە، پڕیدەکـەم لـە پەشۆکانی بـا، لـە پەشیمانبوونەوەی لەهـەر هەڵکردن و خۆشکردنەوەیەک بەسەر ئەم کێڵگەیـەدا، ئـاه... هەڵکردنـی ڕەشـەبای ڕەش بەسـەر وڵاتـە سپییەکاندا، وەرینـی هەرمێـی ڕەش بەســەر عـەردی سپییدا. مـن لەبـەردەرگـای ئـەو ژووره تـاریکانـەدا کـە یـەک پەنجـەرەی ئومێد و سـەد دەرگای دەردی هەیـە دەوەسـتم، تـاریکـی بەشـی ئەوەنـاکات خـودات لـێ ونبکـەم، بەشـی ئـەوە نـاکات، هەمـوو حەقیقـەت نەبینـم، بەشـی ئـەوە نـاکات غەریزەکانمـان داپۆشین، مۆم بکوژێنینـەوەو لەگەڵیـدا فوو لـە هوشیـاری بکەیـن.
هەر وەختێـک تـاریکـی دڵمـان دەگەشێتەوە، ژیـان سپیتر لێـرەوە دەڕوات. من ڕقـم لـە پاکییە، کاتێـک بـە مەکرەوە توانـج لـە شکستی غەریزەکانمـان دەگرێت. تێکشکاو لـە تێرکردنـی هـەر خراپەیـەک، تێکشکاو لـە تـامکردنـی خوێـن و خۆڵەمێـش و خـەراب، تێکشـکاو لـە ئاشـتکردنەوەی جەسـتەمان لەگـەڵ هـەر ددانێکـدا کـە وەحشـییانە دەیگـەزێت. من چاوەڕێـی تـۆم کـە حەرامـەکان هەڵبگریـت... چاوەڕێـی تـۆم کـە سێوێکی تـر بهێنێـت، لـە باغێکـی تـرەوە، لـە خودایەکـی تـرەوە.

ئەفسـوس تـۆ ئەسـتێرە نیت، بـەڵام ئاسمان غەمگینـە کـە تـۆ ئەسـتێرە نیـت، ئەسـتێرە غەمگینـە کـە تـۆ ئەسـتێرە نیـت.

# ٣

# پرسیاری ناکۆتای من لە ناو

لە نێوان هەموو تەفسیرەکاندا، جگە لە با، جگە لە دەنگی ئاسنینی با، جگە لە زوڵمەتی پارچەپارچەی ئەو لەسەر سفرەکان، جگە لە مۆمی ئەو کە تەنیا بە هەوا دادەگیرسێت، هیچ نابیستم. من دەمەوێت کەمێک زیاتر لە هەستی ئەو تێبگەم کاتێک بە کۆمەڵ دوای تینوێتییەکی درێژ دەیخۆینەوە... دوای شەڕێکی درێژ لەگەڵ هەندێ تۆفانی خەوتوودا دەیخۆینەوە. من دەمەوێت کاتێک چیتر مرۆڤ تینوێتی مرۆڤ ناشکێنێت، لەگەڵ شتەکانی دیکەدا تینوێتی یەکتر بشکێنین. تۆ ئەی ئەوەی لەسەر سفرەکان هەمیشە بە مەستی هەڵدەستیت، هەرگیز هوشیاریت خواردۆتەوە؟ هەرگیز بەدیار تێگەیشتن لە ژیانێکەوە دانیشتویت، کە دەمانەوێت بیخۆینەوە و بڕۆین، بیخۆینەوە و سەرمان پڕکەین لە فەرامۆشی زیندەگییە فەرامۆشکراوەکان، بیخۆینەوەو هەستین و قسە لە هەر ئاسوودەییەک بکەین کە دوورە لە ئاسوودەیی تێگەیشتن لە وجود.

کێ تێگەیشتنی منی لە دەریا فەرامۆشکرد؟ کێ ئەو هەموو تەفسیرەی کوشت و جگە لە تینوێتییەکی تاریک هیچی بۆ بەجێنەهێشتم؟ کێ نێوانی من و بەیانیانی پڕکرد لە ڕۆژی خاڵی لە ئاورنگ، لە نیوەڕۆی خاڵی لە ئاو، لە شەوی خاڵی لە پرشنگ؟

من لە تینوێتی خۆمدا قووڵدەبمەوە، تادەگەمە سەر سنووری بیابانەکان

**دڵ. تادەگەمە سەر سەدەفە دوورەکانی ناو خوێنم، سەر کەنارە وشکەکانی ئەوسەری خەیاڵ.**
**لەمندا گوێگرتن هەیە لە یەکێک پێچەوانەی خۆی قسەدەکات، هەستکردن هەیە بە هاواری یەکێک بەدەستی خۆی وەک ئاسنگەرەکان بزمار لەسەر سینەی خۆی دادەکوتێت. وەک دارتاش بزمار لەسەر ڕۆحی خۆی دادەکوتێت، بە مەقەست چووکی خۆی دەبڕێت، بە چەقۆ لە جومجومەی خۆی دەدا.**

**من لە یارمەتی کۆتر دەڕوانم بۆ برینێک لەبری خوێن بۆنی بەیانی لێدێت، لە باوەشێنی ئەو کاتێک دەیەوێت بە باڵ جەنگ بگەشێنێتەوە، بە باڵ هەورەکان وەک توو بەسەرماندا بتەکێنێت. من لەو دەپرسم بۆ ئێمە پاییزمان هەیەو ئاو پاییزی نییە؟ بۆ ئێمە کۆتاییمان هەیەو ئاو کۆتایی نییە؟ من لەو دەپرسم ئاو بە چی سەیری تریفە دەکات؟ بەچی بەهار جیادەکاتەوە؟ بەچی یادی ماسییە دێرینەکانی خۆی دەکاتەوە؟ بۆ ئێمە دەستمان هەیەو ناگەینە هیچ، ئەو بۆ دەستی نییە ودەگاتە سەر ناکۆتا؟ ئێمە بۆ گوێمان هەیەو ئەو نابیستین، ئەو بۆ گوێی نییە و دەمانبیستێت؟. من دەپرسم و جگە لە هاواری ئاو کە وەک هاواری تەرزەیەک وایە لەناو چیمەنی حەوشەدا دەمرێت... سەدای کەس نابیستم. من هەمیشە لە ئاو دەدەم و جگە لە دەنگی برینی خۆم هیچی دیم گوێ لێنییە. تەقە لە ئاو دەکەم و جگە لە خوێنی خۆم هیچی دی نارێژم.**

# ٤

# کوڕی ئەهریمەن

من کوڕی چکۆلانەی ئەوم، لەژێر گەلاڕێزاندا لەدایکبووم. بەختەوەری خۆم لە ئاهەنگەکانی ئەودا دۆزییەوە، تادرەنگ غەریزەی خۆم لە شەوی ئەودا تاقیکردەوە، ئەو باوکم بوو، تا نزیک سنووری درەوشانەوە بە هەموو تریفەکانی شەو دەستیگرتم. لەدوورەوە دەریای نیشاندام، کێلگەکان بوون بە هاوڕێم، بەحر هەستا سلاوم لێبکات، نان لەدەستمدا بۆ گەروم پێدەکەنی، برسێتیم برسێتی مەغۆلەکان بوو، وەک تەتەرەکان ڕووم لە ئاوەدانی دەکرد، کەس نەیگووت ئەم سنوورانە مەبڕە، ئەمیرەکان فەرموویان لێکردم، پادشاکان حەرامسەراکانی خۆیان بۆکردمەوە. بەلام من لەهەموو باغێکدا نێچیرم بە کالی دەخوارد، تووی نەگەیوم دەڕنی، گوێزی ناکاملم دەتەکاند. من پەروەردەی دەستی بام، پەروەردەی دەستی توخمە بێڕەحمەکانی شەوم، ترسێک لەم هەورەدا دەچێنم کە دەریا دەگوڕێت، بــا ئاوەژوودەکەمەوە، ئەسپــی تۆفان ڕووەو کێلگەی گەنمەشامییە ڕەشەکان بازوودەدەم. من تەپوتۆز لەدوای خۆم جێدەهێلم، تەپوتۆزی باغاتی لۆکە، ڕیشالی سپی کەتان کە بە یالی کەحێلەکانمەوە دەنوسێت، جوانووی سپی بۆ غارێکی ڕەش زیندەکەم، ماینی شێت بۆ ڕەوتی ناو پێچاوپێچی زولمەت. دێم و لەسەر ئەم باغی پەمووە، تاریکی خۆم دەنوسمەوە. لەسەر قۆزاغەکان ناوی خۆم دەنو...

ئاوریشمی ڕەش دەپۆشم، جیلبابی نهێنی لەبەردەکەم. ئەفسانەو خورافاتی زۆر لەسەر من دەنوسرێن، مستیلەی خوێنمژان دەکرێن بە مستیلەی من، شمشێری ئەو غەزاکارە ڕەشپێستانەی بە هیچ ئاوێک پاکنابنەوە، دەکرێن بە شیری من. هەر جەنگاوەرێک لە هەر کوچەیەکدا دابەزێت، دەڵێن جەنگاوەری ئەوە، هەر کەسێک لەهەر کوچەیەکدا سەرببڕدرێت دەیکەن بە تاوانی چەقۆی من، هەر باڵندەیەک بە ئاسمانەوە بمرێت، دەیکەن بە گوناهی تیری من.

کتێبی زۆر لەسەر من دەنوسرێت، قەسیدەی تاریک... دیوانی پڕ لە خوێن. حەرف شەرمەدەکات لە نزیک ناوی منەوە دابنێن، قەڕنەکان شەرمدەکەن تێکەڵ بن بە زەمانی من، ڕەنگەکان شەرمدەکەن تێکەڵ بن بە ڕەنگی من. ساڵوەختێکی درێژ خەریکی ناو دەبم، نیگار بۆ خۆم دروستدەکەم، شکۆی ئەفسانەیی، هەیبەتی خوداوەندە بەسامەکان، جاهوجەلالێکی ئاسمانی. تا ڕۆژێک ئیدی چیرۆکی زۆر لەسەر من دەنوسرێت، لەسەر چەقۆی با لەسەر دڵم، لەسەر هاواری چەقەڵ لەسەر لاشەکەم، ڕزینی ڕۆحم لە ژێر خۆری هاویندا، مردنی سۆزم لەژێر بارانی پاییزدا.

# ٥

# خزمەتکارەکان

کۆیلەو کرێکارە پیرەکانی شەو، ئەوانەی لە بەری ئاوەدانبوونەوەی شارەکان دەخۆن، لەزەت لە زنجیرەکان دەبینن، لە نێوان قامچی و ئازادیدا، قامچی هەڵدەبژێرن. بەرد دەنێنە سەر بەرد، وەستان لە دروستکردنی قەفەزدا، دیوار شاسەنعەتی ئەوانە. وەک چۆن باڵندەکان بە شادی هێلانە دەچنن، بە خۆشییەوە کۆیلەن، بە شادییەوە زیندان بۆ خۆیان دروستدەکەن، بە کامەرانییەوە دەبنە عەبد.
شەوی درێژ ئاواز بۆ برسێتی دادەنێن، بە سەما تینوویێتی لە یاد خۆیان دەبەنەوە، بە زیکر ملکەچی خۆیان بۆ ئیمپراتۆرە خەمگینەکان دووبارەدەکەنەوە. پاسی دەرگای گۆرانیبێژەکان دەکەن » کە لە مەلەکوتەوە چاوەڕێی ئاوازن «. عەردی بێحاسڵ ئاودەدەن، گەنمی ڕەش دەهاڕن، سەوڵ لە قەیاغی کون دەدەن. شەوی درێژ ئەوان لە سەرای ئێمەوە هیوا بەرەو کوچەکان هەڵدەگرن، خزمەتکاری ئومێدەکانی ئێمەن، کۆیلەی ئاواتەکانمان. بۆ هەر کوێ بچین ئەوان یاقووتەکانی ئێمە دەخەنە سەرشانی خۆیان. بە دوری ئێمە زامی دڵیان دەشارنەوە، بە مەرجانی ئێمە دیلی خۆیان جوان دەکەن.

خزمەتکارەکانمان، ئەوانەی لە جەنگدا لاشەکانمان هەڵدەگرن، بریندارەکانمان تا بەر قاپی حەکیمان دەگوێزنەوە، لە نەفرەتی سپی

ئێمە کە تاعوونی سپی دەهێنێت بێدەنگدەبن، لە ڕۆژی زەمهەریردا گەرمای دڵی خۆیانمان دەدەنێ، لە ڕۆژی ئاشتیدا لەزەتی شەڕمان بۆدەگێڕنەوە. لە شەوی ئازادیدا دەنگ بۆ خواجاکانمان دەدەن. گوڵاو بۆ وەستاکانمان دەگرن، شەکر دەدەن بە ئەسپی ئاغاکانمان، پلنگ بۆ کچەکانمان ڕاودەکەن.

سەعات دروستدەکەن بۆ زەمانێک خاڵی لە ئازادی، شمشێر بۆ شەڕکردن لەسەر بەروبومی کێڵگە تاریکەکان، کات دەخەنە ژێر چەکوشی بازووە ئاسنینەکانی خۆیانەوە، بەیانیان لە بێژنگدەدەن، ناوی ئەبەدییەت هەڵدەگۆزن، ناوی ئاغاکانیان لەسەر بای ئەمری دەنوسن، کوتاڵی شەڕ دەچنن، ئاسمان غەزادەکەن.
بە گوارەی ڕەشەوە بە بازاڕەکانی شاری مردندا دەڕۆن، گوێ لەوەسفی عەتارەکان دەگرن، باسوقی تالانی دەبەخشنەوە، مێوژی سەرکەوتن دەخۆن. ئومێدمان لە دورگە دوورەکانەوە بۆ دەهێنن، دەستێک پڕدەکەن لە خوێنی دوژمنەکانمان و بە دەستێک ئالا سپییەکانی ئێمە هەڵدەگرن، شەو لە شەمەندەفەری شەڕدا دەبەنەسەر، لە سەنگەری سوبحدا قافییەی بەختەوەری، بحوری کامەرانییە بچوکەکان، عەروزی ئومێد ڕاستدەکەنەوە.
خزمەتکارە خنجیلەکانمان کە بە سینی پڕ لە تلیاکەوە، بە حەشیشی عەشرەتە بەباچووەکانەوە، بەنانی میللەتە بەدبەختەکانەوە دەگەڕێنەوە، کە سەعاتی نیوەشەو لێدەدات ئامادەن بۆ سپیدەی خوێنین، ئامادەن بە زنجیرەکانیانەوە عەشقبکەن، ئامادەن لە ئاردی شەو نانی سپی دروستبکەن، تەنووری وجود دادەخەن، تا شەفەق لەسەر تەپڵەگەورەکان سەمادەکەن، هەلهەلەی شەڕدەکێشن، دەچنە قووڵایی عەدەم و لەوێوە مرواریمان بۆ دەهێنن.

لە جلە دڕاوەکانیاندا، بە سیپاڵی شڕی دیلییەوە، ئاوریشم بۆ ئێمە دەچنن، تاج یاقووت ڕێژدەکەن، ڕۆحی ڕەشی خۆیان دەخەنە سەر سینی تەلا، زیندەگی پیسی خۆیان دەخەنە سەر قاپی زیو و پێشکەش بە ئێمەی دەکەن، خزمەتکارەکانمان ئەوانەی خزمەتی تاجەکانمان دەکەن، کلیلێکمان بۆ دەکەن پاشەڕۆژ دەکاتەوە، هەفتە دوای هەفتە ژیانمان وەک مافوور بۆ دەچنن، سوبحمان وەک چەرچەف پیادەدەن، متیلی تیشک دەگرنە نوێنی سبەێنێمان، بەرگی ئاو دەگرنە سەرینی بەیانیمان، شیری خوداییمان لە فریشتەکان بۆ دەکڕن، قەیماغی پێغەمبەرانەمان بۆدێنن، شەربەتی نەمرییمان بۆ زامندەکەن.

## ٦

# کرێکارەکانی بیابان

ئەی چۆڵەوانی سپی، ئێمە بۆ خزمەتی تۆ لێرەین. بۆ خزمەتی گوڵە نەبینراوەکانی تۆ جارێکی دی درەختی خەیاڵی لێرەدا دەچێنین، سەرووی ئومێد، زەیتونی وەفاداری. ئەی بیابانی سپی، ئەی ئەوەی بەفرێکی جاویدان خوێنی تۆ ساردەکاتەوە، لەمی تۆ چییە جگە لە ملوانکەی پچڕاوی ئەبەدییەت، وردبوونی زەمان، پارچەپارچەبوونی عەشق، وشکبوونی ئاسمان وەکو گەلا.

ئێمە بە تەپوتۆزی بارانەوە دێین، لەسەر شەرەفی تۆ شەونم دەخۆینەوە، ئاو دەنوسین، فوارە دەخوێنینەوە.

ڕەنجی ئێمە لمی تۆ پڕدەکات لە هەڵاڵەی ئەو ڕۆژگارانەی کە دادێن، گوڵی بەهەشتناسا بۆ مێرگی تۆ دەهێنین، تریێەک تامی خۆر بدات، هەنجیرێک هاوینی لێبرژێت. ئێمە خزمەتکاری تۆین قافڵەی شەرابمان پێیە بۆ عەشرەتە دوورەکانی ناو لم، هاتووین ببینە ساقی پادشا خەمگینەکانی تۆ، ببینە ئەفسەر لە ژێر خۆری سپی ئەودا، شەڕ لەگەڵ بای خۆرهەڵاتدا بکەین، سەنگەر لەئاسمان بگرین. ئێمە عەتر دەهێنین، ئاوریشمی سەردەمە زیوینەکان، کاسی زێڕ، جامی ئەو شاعیرانەی تۆزی مەرگیان بەسەر ڕۆحی ئێمەدا دەبارێت. ئێمە خزمەتکاری تۆین، خزمەتکاری گوڵێک تا ئەبەد لێرەدا ناڕوێت. دێین تاقگەی دەستکردمان پێیە، ڕەسمی دەریا نیشانی ئەم گەرمایە، ڕەسمی ئاو نیشانی ئەم تینوێتییە دەدەین.

ئەی زەردییەک وەک ڕوخساری قەلەندەرە کۆنەکان، ئەی گەنمێک سەراسیمە لە مردنی دووبارەی خۆی لە کۆشی کێڵگەدا، من دەزانم کەس تێناگات بۆ ناتوانێت لە تۆ نزیکببێتەوە. کەس تێناگات بۆ لە دەستی تۆدا کۆترەکان پڕدەبن لە فڕینی دڕندانە بەرەو ناشوێن، بۆ تۆ زێڕێکت هەیە عەیارەکانی بە خوێن دەپێورێت، بۆچی شوشەی عەتارەکانی تۆ پڕن لە تۆفانی سەوز، لە شەرابی وەک سەراب سپی، لە ژەهری وەک نوتفەی پادشاکان ڕەش؟
ئێمە خزمەتکاری تۆین. ئێواران کە لمی تۆ ئاسمانی بۆ ناگیرێت، ئێمە ئاسمانت بۆ هەڵدەگرین.
تۆ لە موتڵەقمان نزیکبکەرەوە، ئێمە کۆتایی دەریات نیشاندەدەین.
ئێمە بە کۆڵ لە شارە دوورەکانەوە سێبەرت بۆ دەهێنین
تۆ لمی سپیمان بە با لە خوداوە بۆ بهێنە.

# ٧

# هێرشی کرێکارانی ڕوناکی

ئێمە ئیشدەکەین، عارەقەمان ڕوناکی لێ سەوزدەبێت، تینوێتیمان پڕە لە شنەبای سوبح.
ئیشدەکەین، بەرد لە ئەستێرەکانەوە دەهێنین، چەکوشی ئێمە ڕوناکی ڕاستدەکاتەوە، تیشک کاتێک بەخواری لەدایکدەبێت. گوللە کاتێک بە خواری لە تفەنگ دێتەدەرێ. ئێمە نور ڕاستدەکەینەوە. تریڤە دەدەینەوە بە ئاسنگەران.

ئێمە لە ڕوناکی شتی ئەوتۆ دروستدەکەین، ڕۆژ نەیبینیوە.
سوودی زۆر لە زوڵمەت دەبینین، سوود لە دیدەی ئەو مەخلوقانە دەبینین کە هێندە شەویان خواردەوە نابینابوون. سوود لە فێڵی زەرەنگەران کە عەیارەی خۆیان بە جادوو گەورەدەکەن. ئاڵتونی تێکەڵاو بە مس، یاقووتی غەش، مرواری دەستکردی سەنعەتکاران دەکڕین.

ئەی ڕوناکی، ئێمە بە چەکوشەکانمان ئازارتدەدەین، ڕۆحی هەژارمان لە تۆ نزیکدەکەینەوە، پیاڵەی ڕەشمان لە تۆپڕدەکەین، تۆ کە ئینسان تا ئەندازەی عەزاب ڕۆشندەکەیتەوە، فرینمان ئاشکرادەکەیت، غەریزەمان دەدەیتە بەر هەتاو.
ئێمە بە شەوارەی ئەو ئارەزووانە کەوتین کە لە تۆدا دەدرەوشێنەوە.

سوپاس بۆ ساردی تۆ کە لە ڕۆژی بارانی گەرمدا فێنکماندەکاتەوە. دەتبینین کە پێشوازی ئاسنگەران دەکەیت، پێشوازی ئەو ڕەنجبەرانە دەکەیت کە لەقوولایی زەوییەوە دێن و نەفەق بەرەو مەلەکوتە دوورەکان لێدەدەن. هەمووماان لەسەر ئەو پردە لازۆردییانە ئیشدەکەین کە تۆ بەرەو موتڵەق دەگوێزنەوە.

ئیشی ئێمە فڕێنە بۆ بەرزییەکی هێندە دوور، باڵ سوودی نەمێنێت، لەوێ بەپەنجە خوداکان دەژمێرین، زمان لە ئاورنگی مەلەکوت دەدەین، لە ئاوی قیامەت دەخۆینەوە.

ئێمە بەیانی ڕاستدەکەینەوە کاتێک بە خواری لەخەوهەڵدەستێت. شەو ڕاستدەکەینەوە کە بەگەوجی ڕووەو تاریکی دەڕوات، خەت بۆ نەورەس دەکێشین کە بەدەم فڕینەوە دەمرێت، سەراب ڕادەکێشین تا دەیخەینەوە سەر ئاو.

ئیشدەکەین... وەک دارتاشەکان ڕوناکی دەبڕینەوە و بەلەمی ئومێدی لێدروست دەکەین.
تیشک دەبڕینەوەو دەیکەین بە قەیاغ بۆ منداڵەکانمان.
تیشک دەخۆین و دەبین بە نێزەکی بچکۆلە لەسەر شەقامەکان.

قافڵەکانمان بە قەڵەمی ڕوناکی باردەکەین، کتێبخانە دەکەینەوە هەر هەمووی تیشک بێت. هەر کاتێک مەعشوقە گریا، بە سەکسەفۆنی هەتاو ئاشتیدەکەینەوە. هەر کاتێک زیزبوو، شمشاڵی سوبحی بۆ لێدەدەین. کە تۆرا، بە فلوتی تریقە دەیهێنینەوە.

ئێمە خزمەتکاری ئاوازەکانین... تریڤە بە نۆتە دەکەین... ڕوناکی دەکەین بە مۆسیقا... مێژوونوسی ڕوناکییە غەمگینەکانین، جوگرافیاناسی مانگێکی دەربەدەرین، ئیقاعاتی دەریا دەپێوین کە لە ژێر تۆفانی ڕوناکیدا پاشەکشێدەکات، دەنگی ئەو شارانەی تیشک بۆ هەتاهەتایە فەرامۆشیکردوون، ئەو کوچانە پاکدەکەینەوە کە خەزانی تاریکی تیاهەڵدەکات. ئێمە ئەندازیاری ئەو درەختانەین نور لەسەریان هێلانەدەکات.

هەر کەسێک بۆ ئاسمانێک دەگەڕێت، هەورەکانی نور ببارێن...
بابێت ئاسمانی وامان لایە.
هەر کەسێک بۆ دەریایەک دەگەڕێت، ماسییەکانی لە تیشک بن... ئێمە دەریای وامان لایە.

## ٨

# هێرشی باڵندە سپییەکان

ئێمەین ئێوارە ئاوەداندەکەینەوە.
ژیانمان تاکۆتایی هەر سەرەتایە، زەمەنمان بۆ پێشەوە ناڕوات.
پەلاماری ئاو دەدەین کە بەرەو پێش پاشەکشێدەکات. پەلاماری دەریاچەکان دەدەین و پڕیدەکەین لە ئیمپراتۆرییەتی سپی، پڕیدەکەین لە کەشتی کە مەخلوقاتی ڕەش دەگوێزنەوە، ڕووەو سەرزەمینی ئاوریشم، بۆ وڵاتێک جەنگاوەرەکانی خوێنی سپی دەخۆنەوە. باڵندەی قسەزان،

بەسەرماندا دەفڕن.

دەتوانین لە کاتی کوشتنی کۆتردا گوێ لە هاواری هاوڕێکانی بگرین. قسە لەگەڵ کوکوختییەکاندا بکەین، کە لە سەر منارەکانەوە بە باڵ قسە لەگەڵ خودادا دەکەن. دەچینە هەرێمێکەوە پڕە لە پاساری زیکرناس، لە تیترواسکی زاهید، لە قەفەسی ئیماندار. ڕیشۆڵە دێت غوربەتمان بۆ شەرحدەکات، پۆڕ دێت هیجرانمان بۆ شیدەکاتەوە.
لە زەمینی باڵندە سپییەکاندا، ئێمە گوێ لە شەرحی درەخت دەگرین، گوێ لە باران دەگرین کاتێک خۆی تەفسیردەکات. لەوێ پڵنگ سەرەتا گوێ لە نێچیرەکان دەگرێت، ئەوسا دەیانخوات، شەیتان گوێ لە تۆبەکانمان دەگرێت، ئەوسا غیوایەتمان دەکات. ئێمەش بە نەزاکەتی دێرینەی خۆمانەوە، بە هەموو ئەو شەرمەفە بەرزەی لە منداڵییەوە فێربووین داوای لێبوردن لە دوژمنەکانمان دەکەین و ئەوسا دەیانخۆین.
شەو لە ئێوارەوە شفرەکانی خۆی دەخوێنێتەوە، تاریکی بە ڕەزامەندی ڕۆژ هەڵدێت، خۆر بەر لەوەی هەڵبێت، قسە لەگەڵ ئەستێرەکان دەکات.
لەوێ فانۆس دەفتەری هەیە، هەر پەپوولەیەکی بوێت بە نامە ڕازیدەکات خەنجەر شفرەی هەیە، هەر دڵێکی بوێت بە ڕەمز بانگیدەکات.
ئێمە دێین و بێدەنگییەکی سپی دەهێنین.
لە زەمینی باڵندە سپییەکاندا، دەتوانین بە بێدەنگی خۆمان لە بێدەنگی ڕزگاربکەین
لەوێ درەختەکان بەر لە مردن نهێنی خۆیان وەک ڕوناکی بە لقەکاندا هەڵدەواسن
گەرداو بەر لەوەی کەشتییەکان نوقمبکات، نهێنی خۆی وەک چرا بەئاودا هەڵدەواسێ
بەڵام بەر لەوەی بمرێت، نەورەسەکان وەک مۆم دادەگیرسێنێت و دەیانخاتە

**سەر دڵی خۆی**

**شەوان دوای ماندووبوون لە گوێگرتن لە دەنگە سیحراوییەکانی ئاسمان، کاتێک زەنگەکانی نەمریی، ناڵەی کەنیسە دوورەکان، هاواری مزگەوتە خەمگینەکانی ناو تەم بێدەنگدەبن، یەکێک لەناو درەختەکاندا ترسەکانی خۆی دەداتە دەم با، تۆپێکی بلورینی پێیە و بەختی باڵندەکان دەخوێنێتەوە، سیحر لەو گوڵانە دەکات کە بڕوایان بە غەریبەکانی شەو نییە، سیحر لە مینا دەکات کە گەڵا وردەکانی پڕن لە چوارینەی ترس، شەونم بەجۆرێک دەخەوێنێت بە هاواری زەوی هەڵنەستێت، پاتۆنیا وامەستدەکات بەباران هۆشی نەیەتەوە... بە چاویلکەی هەندێک پزیشکی بەدەوە، وەک خراپەیەک بێپەروا بەناو باغدا بڕوات. ئەو درەختانە دەگرێت کە مانگ لەسەر گەڵاکانیان پێدەکەنێت، لەسەر قەدی شۆڕەبی ڕۆژی هێرشە سپییەکانی خۆی دەنوسێت، زوبانی ئەو گیایانە دەبڕێت کە زمانی ئاو دەزانن، هەر شتێک نهێنی ئەم سەعاتە سپییانەی ئەو ئاشکرابکات دەیشکێنێت. هەر شتێک شفرەی ئەم شمشێرە مەستانەی ئەو ئاشکرابکات، ئاوەژوو تەفسیریدەکات.**

**ئەو دێت و بێدەنگییەکی سپی دەهێنێت.**

**لێرە هەنار مۆسیقای دەنکەکانی خۆی دەژەنێت. تیشک لە باڵندەکانەوە فێری نیشتنەوە بووە لەسەر ئاو، فێربووە لە خوێنی ئێوەدا گەرا دانێت... دەڵێت: با خۆر زۆربێت، با هەتاو زاوزێبکات.**

**ڕۆحلەبەرە سپییەکان دێن، لەو هەوا بێدەنگە ڕادەمێنن کە پڕە لە ئەگەری تەقینەوەی ترسناک، لەو دەریاچە گەرمانە دەڕوانن کە کەشتییەکانیان دەبنە هەڵم، دەریاوانەکانیان دەبنە غوبار.**

**ڕۆژێک دێت، چیتر باڵندەکان ناخوێنن... بولبول بەهار بەکەڕولاڵی دەباتە سەر، هاوین بە کپی بخووری دەریاچەکان هەڵدەمژێت، بەبێ هاوار باڵەکانی دەنوسێن بە ئاسماندا، بەبێدەنگ وەک بورجێک لە لم دەڕوخێت، بەبێدەنگ وەک مورووی‌ەک لە تۆفاندا وندەبێت، بەبێدەنگ وەک تەیرێک لە فەخار دەشکێت.**

**٩**

# زیندووبوونەوەی ئێمەو زیندووبوونەوەی گوڵ

**چۆن باڵدارێکی تورە خۆرێکی خەوتووی سەر دەریا لەخەو هەڵدەستێنێت، لە تەپوتۆزی پاییزدا هەڵدەستێت و مردن لەخەو هەڵدەستێنێت و پەشیمانیدەکاتەوە، دەیەوێت مردن وا لێبکات بگری و لە بەلەمێکی کۆندا خوداحافیزی بکات و بڕوات. ئێمەش بە کۆمەڵێک پاڵتۆی شینەوە بێباک لە هەر تێفکرینێکی قووڵ، لە ژێر بارانی ئێوارەدا سەرقاڵی حیسابی دەستکەوتی خۆمان بووین لە بروسکە. ڕۆژەکانی خۆمان تا قیامەت حیساب دەکرد. بیرمان لای سفرەی پرسەکانی خۆمان بوو، مشوری تەڵقینێکی شاعیرانەمان دەخوارد. مشوری کچێک بە ڕووتی یاسینمان بخوێنێت. گوێمان لێبوو گوڵێک دەهاتە بەردەممان و دەیگووت: منم تەنیا لە مردن دەگەڕێمەوە.**

**ئێمە کە دەمانزانی ناتوانین وەک ئەو لە مردن بگەڕێینەوە.**
**یەکێکمان گووتی : ئێمە وەک گوڵ زیندوونابینەوە.**

بەڵام نا، ئێمە گەر تا ئەوسەری مردن بڕۆین، گەر هەموو دەقیقەکانی خۆمان، هەموو چرکە چکۆلەکانی خۆمان، هەموو هەناسەکانمان بەکاربهێنین، دەشێت ڕۆژێک وەک خونچە زیندووبینەوە. بەڵام گەر زیندووبووینەوە چی بکەین؟ کە ئێمە ناتوانین وەک ئەو بگەشێینەوە، بچینەوە ناو ژیانی باغەوە، ناتوانین زەوی بۆ خۆمان ڕاخەین، ئاسمان سەر لە نوێ دروستبکەینەوە. گەر زیندووبووینەوە تەماشای ئەو دۆستانە دەمانکوژێت کە وەک ئێمە زیندوونابنەوە. بێوەفایی ئەو هاوڕێیە غەمگینمان دەکات کە هەستانەوەمان دەیکات بە دوژمن.

گەر زیندووبووینەوە چی بکەین؟ بگەڕێینەوە بۆ ژێر باران و چاوەڕوانی گوڵ بین؟ چی بکەین؟ لەسەر شۆستەکان بوەستین، نەی بژەنین، سەیری باران بکەین؟

ئێمە بە تەنیا جارێک لە گوڵ تێدەگەین، کەچی گوڵ بە هەزاران مردن و زیندووبوونەوە لە ئێمە تێناگات.

گەر زیندووبینەوە دەبێت دووبارە لەسەر شۆستەکان بۆ ئیش بوەستینەوە، شەوان گوڵەبەڕۆژە ئاوبدەین، لە بەلەمەکاندا کۆچبکەین و تف لە شەپۆلەکان بکەین، لە شەمەندەفەرەکاندا بگرین و فستق بخۆین. کوتاڵ بفرۆشین، هەنگ بەخێوبکەین، خورما بە قاچاغ بەرین بۆ دوور. گەر زیندووبینەوە خودایە دووبارە دەبێت بچینەوە بۆ قوتابخانە، نامە بۆ کچان بنوسینەوە، توتن بۆ عەمبارەکان داگرین، لە بەردەم زەرەنگەرەکاندا شقارتە بفرۆشین. ئەوکات دایکمان تێناگات بۆ هاتووینەتەوە، دەزگیرانەکانمان تێناگەن بۆ دوای ئەو تۆفانی عەشقە دەگەڕێینەوە.

ئێمە بە تەنیا جارێک لە هەموو درەختەکان زیاتر دەژین. هەر یەکێک لە ئێمە، لە ڕۆژێکدا بەقەد هەموو باڵندەکانی دونیا دەفڕێت. هەر یەکێک لە ئێمە لە باغێکدا بە ئەندازەی هەموو خونچەکان سەیری بەهاردەکات. هەر یەکێک لە ئێمە بە ئەندازەی هەموو مراوییەکانی دونیا ئاسمانی بینیوە. هەر یەکێک لە ئێمە لە سەعاتێکدا بەقەد هەموو ماسییەکانی دونیا ماندوودەبێت. گەر ئێمەش زیندووببینەوە، سەرسامی ئێمە بە تیشک زیندوونابێتەوە، حەزمان بۆ ئۆقیانووسەکان دەکوژێتەوە، عەشقمان بۆ با دەمرێت.

تۆ بە من بڵێ ئەی گوڵ، گەر ئێمە حەز لە دەریا نەکەین، ئیدی ئاو بۆ کێ دەژی؟ مانگ بۆ کێ دەدرەوشێتەوە؟ باغچە بۆ کێ دەڕوێت؟

# ١٠

# ئیشکردن لەگەڵ ڕاوکەرێکی مردوودا

وەک تیشکێکی تێکەڵاو لە سووتانی ڕۆح و نەسووتانی. کە دەدرەوشێتەوە بۆئەوەیە ئیدی نەدرەوشێتەوە. وەک ئێمە کە لەسەر ئەم بەردانە وەستاوین سەوزبین تا جارێکی تر نەوەستین و سەوزنەبینەوە.
ئێمە لێرەوە دەڕۆین، وا مەزانە ڕێبوارین، ئێمە ڕێبوارنین، بۆئەوە لێرەوە دەڕۆین، تاجارێکی دی لێرەوە نەڕۆینەوە.
من و ئەو پێکەوەڕا دادگا بۆ سروشت دادەنێین. ئەو تەقە لە باڵندەکان

**دەکات و دەڵێت لەگەڵما بۆنی سووتانی هەوابکە، نەسیم هەڵمژە کە پڕە لە ترسی گیا، شەو بخۆ کە پڕە لە تامی میوەهات. ئای... ئەی ڕاوکەری مەزن، ئەی ئەوەی لەسەر پەڕی قوڵنگە خەمگینەکان خەوتوویت، من و تۆ ئیشدەکەین، توتڕکی بەستووی نێو دەوەنەکان دەخوێن، خونچەی ڕۆژگارە کۆنەکان کە هێشتا نەژاکاون، وەک هەنگی شانە دێرینەکان کە دەفڕن و هێشتا نەگەیشتوونەتەوە خەرابی شارەکانیان. ئیشدەکەین... تەقە لەو کۆترانە دەکەین کە بە جەهەنەمدا دەڕۆن تا بە جەهەنەمدا نەگەڕێنەوە. تەقە لەو ڕیشۆڵانە دەکەین کە بە تاریکیدا هاتوون و دەڵێن ڕوناکی وێرانەترە. من بانگتدەکەم، ئەی ئەوەی وەک چۆن داو لە قاچی پاسارییەوە دەئاڵێت ئەو هەموو تیشکە خنکاوەی شەو، لە پەنجەتەوە ئالاوە. من دێم ئیشکەرێکی بچوکم، لە ناو تەمدا باڵندەت بۆ دەدۆزمەوە، بە بەفرا ڕادەکەم و لەبن درەختە سەرسامەکانی زستاندا نێچیرە پێکراوەکانت بۆ دەهێنمەوە. من لەگەڵ تۆدا شادم، وەک شادومانی تانجییەک لەگەڵ کاروانە دوورەکاندا.**

**چادرەکانمان کە باڵندە گومانی لێناکەن، ئەستێرەمان کە لە ئەستێرەی سوبح جیاناکرێتەوە، جێپێی من و تۆ کە لەسەر زەوی ئاسەوار جێناهێڵێت، وەک ڕۆحێکی سووک بەسەر بەستەڵەکی جەنگەڵدا دەڕۆین نێچیر ناماننناسێتەوە. ئەی ڕاوکەری مەزن، ئێمە خوێنی خۆمان دەڕێژین، تا خوێنی کەس نەڕێژین. جێدەستی من و تۆ لەسەر هەوا، لەسەر درەخت، لەسەر تفەنگەکان جێنامێنێت... وەک پیاوکوژێکی لەشسووک، جەلادێکی ڕووخۆش بانگی کەروێشکەکان دەکەین، کە دێن لە میهردا گەرمیان دەبێتەوە. من ئیش بۆ تۆ دەکەم، ڕۆژێک تۆ لە گیادا خەوتوویت و بیر لە بێئیشییەکی جاویدان دەکەیتەوە. ئاه، تۆ کە سینەت لە خۆشەویستیدا ژاندەکات، لە بری تۆ خۆشەویستییەکانت هەڵدەگرم. تۆ**

**کە پەنجەت لە خۆی بێزار بووە، لە بری تۆ پەنجە دەنێم بە تفەنگدا، لە بری تۆ میل لە نائومێدی دەهێنمەوە.**

**تۆ کە دەمریت بۆنەوەیە نەمریت. کە لە ژێر ئەم درەختەدا ستایشی بێدەنگی جەنگەڵ دەکەیت بۆنەوەیە هاواربکەیت. کە سەیری ئەم ئاوەدەکەیت، دەتەوێت بێیتەوە سەر وشکایی. کە تەقە لە باز دەکەیت، تەقە لەفڕینی خۆت دەکەیت.**

**بەڵێ ، ئەی دۆست. لە بری تۆ دار دەهێنم و ئاگر بۆ خوانێکی ئەفسانەیی خۆشدەکەم، فوو لە پشکۆکان دەکەم، کە وەک مەرگی تۆ دەگەشێنەوە. نان بۆ مردن دروستدەکەم، من و تۆ تێشوویەکی زۆرمان پێویستە تا ئەستێرەمان بیرنەچێتەوە، ئاوێکی زۆرمان دەوێت، ئەوەتا خۆرئاوابوون تینوومان دەکات. من نێشدەکەم، قەدەر دەخولقێنم، چارەنوس دروستدەکەم. تۆش ئەستێرە لەخۆتدا دادەگیرسێنێت، نێچیر لە خۆتدا دەدۆزیتەوە.**

**کاتێک خوشکەکانت لەم چیا دوورانەدا بۆتدەگەڕێن، کاتێک پاشماوەی کاڵی ئەو باڵندانە دەبینن کە من و تۆ دەیانخۆین، ئەوکات ئێمە بە پێچەوانەی ڕووبارەوە بەرەو ئەوسەری کارەسات سەردەکەوین، مردن بانگماندەکات، ترس بە نەسیمدا نامەمان بۆدەهێنێت، کۆست لەگەڵ سروەی بەیاندا بێدارماندەکاتەوە. من و تۆ شوێنپێی ئەو شێرانە هەڵدەگرین کە بە دەم خەوەوە ڕووە و ڕوناکییەکی خەیاڵی، بەرەو ئەوسەری نەفەقێکی سەوز دەڕۆن. من و تۆ شوێنپێی جانەوەرەکان هەڵدەگرین کە دوودڵی لە هەنگاویاندایە، شوێنپێی ئەو ڕاوکەرانە هەڵدەگرین کە لەگەڵ نێچیرەکانیاندا دەمرن. شوێن پێی ڕۆحە خەمگینەکانی خۆمان هەڵدەگرین، کە بەر لە ئێمە لێرەوە ئاوابوون.**

# ١١

## دوو ئیشکەر... باغ دروستدەکەن

وەک لێکچوونی دوو هەرمێ کە پاییز بەیەکسانی لەگەڵ یەکدا بەشدەکەن، لەیەکدەچن.
وەک لێکچوونی دوو خۆر کە هەتاو لە یەک سەبەتە هەڵدەبژێرن. بەیەکەوە تەبان.
وەک دوو جەنگاوەر شەڕ لەگەڵ سێبەرە خەمگینەکانی جەنگەڵدا دەکەن. ڕۆحیشیان لە یەکدەچێت... ڕۆحیشیان کە وەک جەستەیان پڕە لە باغ، پڕە لە شەتڵی سەبر، پڕە لە ڕەنجی تازە، لە پلانی دیکە بۆ هەوا، لە شەوگاری فەریکتر لە شەونمی نوێ، لە باڵندەی مەعسومتر لە گوڵ. وەک یەک بە دوای ئیمانێکی دیکەدا پاچ لە زەوی دەدەن. تۆو دەکەن بە کێڵگەکانەوە تا بەروبومی دیکە بناسن، تا سەردەمی دیکە بڕوێنن، تا میوەی دیکە بخۆن. پاچ دەدەن لە هەوا، تا دەگەنە سەر خەزنەی وەهمەکانیان، سەر سندوقی شاردراوەی خەیاڵ لە ناو بادا، سەر گەنجینەی گومڕایی، کە پڕە لە شێوەی نەدۆزراوە بۆ گوڵ، لە ڕەگی تر بۆ شکۆفە، لە قانونی تر بۆ خونچە.

وەک یەک، چڵی شکۆفەنەکردووی کات لە برینی خۆیان موتوربەدەکەن، لە درەختی زەمان دەچن، تامی میوەی ئێوارە غەمبارەکان دەدەن.

هەردووکیان بۆنی زەوی هەڵدەمژن، بۆنی ئەو باغانەی لە عەدەمەوە بانگیاندەکەن. ئاه... ئاه، ئێوە ئەی گەرداو... ئێوە ئەی بای بەروبوومی زۆر، مێرگوزاری ڕواو لە تریقەی ڕەشدا، لە جوێبارەکاندا ماسی کۆن دەربهێنن، شەربەتێکی تر بڕێژنە پیاڵەوە، کاتێک هەوا ئاهەنگ دەکات، ئاواز ئاواز دەخوێنێت، مۆسیقار مۆسیقا دەڕوێنێت، سەماچی سەما دەکاتە شەتڵ.

گەرداوەکانی دەوری یەکتریان خۆشدەوێت، گێژەنی دەوری قامەتی یەکتر دەپەرستن.

دووانن ڕەشەبای تریان پێیە، شەپۆل کە سەرابی شەپۆلی ترە، دەریایان بینیوە لە ئاو دروست نەبووە، کەشتییان بینیوە بەبێ هەوادا دەڕوات. تۆوی ئاوەدانیان پێیە بۆ شارێک بە سپێتی دروستبووە. بە دوو خودەی سپییەوە دێن، لەسەر ئەم لمە زەردانە نەخشەی باغە سیحراویەکانی خۆیان دەکەنەوە، شەو ڕۆژ ناژمێرن، گزنگ دەژمێرن، قەترەی ئاورنگ. داستانەکانی خۆیان کە بە داس، بە چەکوش، بە قوڵنگی فەرهادانە دەینوسن. دەڵێن ئێمە دەبین بە خزمەتکاری ئەو دەرگایەی شکۆفەی لێوەدێت، دەبین بە ئیشکەری ئەو فریشتەیەی گوڵ لە خوداوە دەهێنێت.

شورا دروستدەکەن لە نێوان ئەوەی جاویدانە و دەمرێت، لەگەڵ ئەوەی دەمرێت و جاویدانە.
دیوار دروستدەکەن لە نێوان ئەوەی ڕاستییە و دەبێتە خەیاڵ، لەگەڵ ئەوەی خەیاڵەو دەبێتە ڕاست.
لەسەر یەک دێراو سۆزدەکەن، زیکری خۆیان دەکەن بە خاکەوە، هەلهەلەی خۆیان دەدەن بە با، ئیشراقی خۆیان دەدەن بە دێبەر. پاچ

لە ڕوناکی دەدەن. لەیەکدەچن وەک لێکچوونی دوو پیاو کە شەوێک لە شەقامەکانی شارێکدا پێکەوە لە خیانەت هەڵدێن، لە فەسادی ئاو، لە قاقای بێحەیای هەزاران گەڵای زەرد. خۆڵەمێشی ئەم باڵندە سووتاوانە دەیانبات، کە دەمەو بەیان وەک جەنگاوەر پەلاماردەدەن. ئەوان وەک دوو درەخت ڕەنگی خۆیان دەدەنە بەر خۆر، خۆڵەمێشی گەرمی زەمان دەیانبات، ئێشدەکەن و بەرهەمی خۆیان لە کەشتییەکاندا باردەکەن، بەرەو زەوی ئاوەدان، مرۆڤی پڕ، شاری کامڵ، بازاڕی جەنجاڵ.

## ١٢

# مەهێڵە گوڵ پێبکەنێت

چ ترسناکە، بەیانیان کە گوڵ پێدەکەنێت.
چ ترسناکە دەنگی بولبول کاتێک من و تۆ ئێشدەکەین.
مەهێڵە منداڵان پێبکەنن، ترسناکە ئەم قاقایە کاتێک من و تۆ لێومان نییە بە قاقا وەڵامیبدەینەوە.
کاتێک من و تۆ دەبێت تا مردن ڕەنجبدەین، مەهێڵە... مەهێڵە گوڵ پێبکەنێت
کاتێک لە تەپوتۆزی کێڵگەکاندا دەمرین، بە گوڵ پەشیمان نابینەوە.
کاتێک بەدەردی جودایی دەمرین، بە خونچە ئاشتنابینەوە؟
سەیرکە دیدەمان هەمووی زامی تیشکە ژەهراوییەکانی شەوە. گوڵ بۆ پێدەکەنێت، کە دەزانێت دەستمان هەمووی خوێنی دڕکە ژەهراوییەکانی ئەوە؟

**کە تۆ لە ئەزەلەوە غەمگین بوویت، پێکەنین غەمبارترت دەکات.**
**کە تۆ لە ئەزەلەوە تەنهابوویت، پێکەنین تەنهاترت دەکات**

**ئەوەی وەک من بە دەردێکی قووڵەوە هاتبێتە سەر زەوی، بە خەندە بەختەوەر نابێت**
**مەهێڵە... مەهێڵە گوڵ پێبکەنێت.**
**مەهێڵە ئەم چەقۆیەی ناو گەروم فەرامۆشکەم، مەهێڵە ئەم گوللەیەی ناوچاوانم بیربچێتەوە. مەهێڵە بڕۆم و وادیاربم بۆ زام لەم ئاوە هاتوومەدەر، کە گوڵ پێدەکەنێت،**
**ئەو خوێنەم لەیاددەچێتەوە کە لە یادەوەریم دەتکێت.**

**مەهێڵە... مەهێڵە گوڵ پێبکەنێت.**
**کاتێک گوڵ پێدەکەنێت**
**دڵڕەقی خودامان لێدەبێتە ڕەحمەت**
**زریانمان لێدەبێتە هەتاو.**
**گەر بەیانی ئەهریمەنمان بینی لێماندەبێتە پەری**
**گەر شەو بە ئاگردا ڕۆیشتین لێماندەبێتە ئاو.**

# ١٣

## بێ ئیش لە فیردەوسدا

لە ڕۆژێکدا ڕوناکی لە خودا خۆیەوە دەهات، زەمانێک تیشک و جەستە، زوڵمەت و ڕوناکی نەبوو. باڵندەکان بە هیچ وەرزێکەوە، ئینسان بە هیچ خاکێکەوە نە بەسترابوو. سەفەرنەبوو تا بیر لە دەریابکەینەوە. مەوداکان، دوورییەکان، کۆتاو ناکۆتا هەمووی لە ڕۆحدابوو. شارەکان هەموو لە یەک باغدا، باغەکان هەموو لەیەک گوڵەباغدا خەوتبوون. زەمان هەمووی یەک چرکە بوو، سێو لە نێوان دوو کەسدا لەت نەدەکرا، خودا لە نێوان دوو دیندا دابەش نەبوو. عەشق تەنها ئاهێک، ژیان خۆی یەک هەناسە بوو.

نە ئاو ئاوی هەبوو، نە با دابەش دەبوو.

با لە دایک نەبووبوو تا جەنگەڵ لەدایک بێت. ئاسمان بڵندنەبوو تا مەل باڵی ببێت. شەو نەبوو، تا مانگ هەستێت، بخەوێت، ماڵی ببێت.
ئەوسا دڵمان دەرگای نەبوو، تا جوانی کوشندە بێت
شەونمی بەیان وایکرد گوڵ بیر لە مردن بکاتەوە
سروەی سوبح وایکرد ڕۆح لە لەش تووڕە بێت.
عەشقی ژێر تریڤە وایکرد
گوناه ڕاپەڕێت، گومان پێبگات، حەقیقەت وەرگەڕێت.

# ١٤

# ئیشکردن لەسەر بورجێکی نادیار

دوو بورج لە ناوەڕاستی دوو نومێدان، ئێمە نایانبینین، چونکە یەک نائومێدی بەیەکیانەوە دەبەستێت. لە ناوەڕاستی دوو جەنگەڵدان، ئێمە نایانبینین، چونکە تەنیا گەڵایەکی وێڵگەرد بەیەکیانەوە دەبەستێت، لە نێوان دوو خەوندان کە تەنیا بۆنی یەک گوڵەباغ بەیەکیانەوە دەبەستێت، دوو بورج ئێمە هەرگیز نایاندۆزینەوە، چونکە لە نێوان دوو ئاسماندان... دوو ئاسمان کە تەنیا هاواری ئەستێرەیەک بەیەکیانەوە دەبەستێت.

من و تۆ بەرد دەهێنین بۆ بورجێک کە نایبینین
بەرد دەهێنین و دەیخەینە سەر دیوارێک کە نایبینین
سەنعەتی خۆمان لە دەرگایەکدا بەهەدەردەدەین کە نایبینین

زەخرەفەی خۆمان لە تاقێکدا، نەخشی خۆمان لە پایەیەکدا خەساردەکەین
کەوتۆتە نێوان دوو کێڵگەوە لە خەیاڵ
لێزانی خۆمان لە ڕیواقێکدا سەرفدەکەین بەشێکە لە عەرشێک لە غوبار.

من جووتیاری ئەو درەختەم کە لەسەرابدا سەوزدەبێت، لەسەر سفرەیەک سێو بۆ ئەو ڕۆحانە دادەنێم لەم بورجەدا دەگەڕێن، ئەو ڕۆحانەی لە

ئێسکەکانیان جیانابنەوە، لە ناو گیاکاندا، لە بەر ڕەشەبای شەودا، لە سەنگەری شکاوی سەر قووللە تاریکەکانەوە، کاتێک مەنجەنیق لە ئەستێرە دوورەکانەوە ئێمە ئاگر باراندەکات، باغ هەمووی تەپوتۆزی جەنگە، گەلا بۆ خۆڵەمێشی خۆی دەگەڕێت، باڵندەکان دەفڕن و سەیری پەڕی سووتاوی خۆیان دەکەن لە هەوادا، با بۆکڕوزی لاشەی دوژمنەکانمان دەهێنێت، لەوێ من دەستی ئەو مردووە کوێرانە دەگرم کە لە ژێر درەختەکاندا بۆ ژیانی خۆیان دەگەڕێن، وەک چۆن منداڵێک بۆ یارییەکی ونبوو دەگەڕێت، دەستی ئەو ڕۆحانە دەگرم کە لە ناو بەحری ئێسکەکاندا بۆ لاشەی خۆیان دەگەڕێن. زەنگەکان لێدەدەن و من هێشتا نەخەوتووم، کۆتایی بە خۆڵەمێش و تەپوتۆز و هێمنی خۆیەوە دێت و من کۆتاییم نەهاتووە، شەو دێت ئەم بورجە بشوات و لای من هەمیشە ڕۆژە، با دێت مردووەکان بەرێت و من خۆم بە درەختەکانەوە دەنوسێنم، هێمنی دێت ئاسەواری ئەم نەعرەتەیە بشوات، من خۆم بە هاوارەوە دەنوسێنم.

بورجێک ئێمە لە باغەکانیدا نابینایین، دەسوڕێینەوە و میوەکانی نابینین
لە نێوان دیوارەکاندا دیلین و دیوارەکانیش نابینین.
وەک تەیرێک هێلانەی لەسەر درەختێکی نەبینراو کردبێت
وەک بیرێک ئاوێکی نەبینراوی تیابێت
باغێک پڕبێت لە فوارەی نەبینراو.

ئێمە لەم بورجەدا نیشدەکەین، نەکەس چاوەڕوانی گوڵە، نە کەس چاوەڕوانی خارە. دەستی ئەو مردوانە دەگرین کە لەم پەنجەرەوە دەچنە بەر ئەو پەنجەرەی دی، ئەو مردوانەی نە دەریای ئەو دیو پەنجەرە، نە ئاسمانی ئەو دیو پەنجەرە، نە پەنجەرەشیان لێ دیارە.

# ١٥

# نیشکردن لەسەر بەرد

ئەی بەرد ئەی لایەق بە شوێنی مردنی من، گوێم لە دەنگی تۆیە کاتێک با لەدەرگای هەردووکمان دەدات. ئەی بەرد چاوەڕێی تۆم بێیت و سەکۆیەکم بۆ دروستبکەیت لەوێوە هەموو ئاو ببینم، هەموو مەرگ بە هەموو تەمە مۆرەکانی سەر نیگایەوە. ئەی بەرد... ئەی لایەق بە چاوەڕوانی بولبول، ئەی لایەق بە نیشتەجێی پادشاکانی بەیان، ئەی لایەق بە بەدبەختێکی وەک من کە تف لە گەردون دەکات.
ئەی تاوێری مەزن، ئەی جوانتر لە ئاسمان، ئەی ئەوەی خوداکان پێت بەسەردا دەنێن و ئێمە ئاشتتدەکەینەوە، خوداکان فڕێتدەدەن و ئێمە هەڵتدەگرین. خوداکان لەسەرت مەی دەنۆشن و ئێمە لەسەرت دەمرین.
ئەی درەوشاوەتر لە زمڕوت، ئەی لایەق بەخشڵی فریشتەکان، ئەی زێڕی زەڕەنگەرێک بازرگانی بە موعجیزەوە دەکات، یاقووتی بازرگانێک لەو دیو مردنەوە کاڵامان بۆ دەنێرێت، ئەوەتا دەتبینم، تۆ دوڕڕی پیاوێکیت لەگەڵ جەهەنەمدا بازرگانی دەکات.
کە لە هەوا ڕادەکەم. تۆ پەنجەرەم بۆبکەرەوە. من ماچتدەکەم، لەبەرئەوەی لە تۆ زیاتر هیچی دی نییە ماچیبکەم، ماچتدەکەم لەبەرئەوەی زەریا ماچناکرێت، ناتوانین دەمبخەینە دەمی ئاگرەوە، دەم بخەینە دەمی هەواوە.
ئەی بەرد.

ئەی لایەق بە دەریاوانێک تف لە زەوی دەکات.
ئەی شایستەی پاشایەک بازدەدات و لە هەوادا مردنی خۆی ماچدەکات بازدەدات و تاجەکەی بۆ بۆشایی جێدەهێڵێت، بۆ با، کە لەگەڵ خۆیدا بەرەو ناو گەرداو دەیبات.
من لەگەڵتدا بەرەو دۆزەخ تلدەبمەوە، بەرەو خەرەند، بەرەو شوێنێک هیچ دەستێک نەمانگرێتەوە. لەوێ تامی بەربوونەوەی بێدەربەست دەکەین ، هەرەسێکی مەزن بەرەو بۆشایی سەوز، بەرەو ناو ڕۆحی شەو، بەرەو باوەشی بەیان.

# ١٦

# دوو نیشکەر

لەسەر دەریا ستایشی یەکدی دەکەن

یەکێک لەودا دەدرەوشێتەوە، یەکێک لەو ساتەوەی دەستی بە قیامەتەوە گرتووە، دێت و لەگەڵیدا سەیری قیامەت دەکات و دەدرەوشێتەوە، ئەو لە کەشتییەکی دوور دابەزیوە و کۆترە خەمگینەکانی سەر دەریا بانگدەکات، وەک ئەو بێ هاوڕێیە و بێ نیشتیمان، وەک ئەو ڕوناکییەکە بێ ساحێب، وەک ئەو بلیمەتێکە بێ دۆست.
ئەو برینەکانی خۆی نیشاندەدات و دەڵێت: ئەمە نەفرەتی منە لە ژیان.
ئەو ژیانی خۆی نیشاندەدات و دەڵێت: ئەمە نەفرەتی ژیانە لە من.

ئەو دەستدەبات خوێنێکی مەیو لە گەروی دەردەهێنێت و دەڵێت: ئەمە

**گۆرانی مردووی منە بۆ ئێواریّ. ئەو دەستدەبات خەنجەرێک لە دڵ دەردەهێنێت و دەڵێت: ئەمە خۆشەویستی منە بۆ دەریا.**

**پێکەوە تەماشای ئاو دەکەن، ئەم بەشەرمەوە قسە لە جەنگەکانی ئەو دەکات، قسە لەو بزمارانە دەکات کە لەسەر دەستی دادەکوترێن، قسە لە خاچێک دەکات ئەو بەرزیدەکاتەوە، شەڕێک لەسەر ئەسپە سپییەکانی دەکوژرێت و هاوار لە مانگ دەکات، کە خودەی خوێناوی خۆی لادەبات دەبێت بە ڕەشەبا، باس لە زەمانێک دەکات ئاڵاکان بە فەرمانی ئەو دەشەکێنەوە، ئاو بە فەرمانی ئەو لەدەریادا دەجوڵێت، تیشک بە شمشێری ئەو لە ئاسماندا دەوەستێت، هەتاو بە هاواری ئەو پاشەوپاش دەگەڕێتەوە. ئەم دەڵێت: جەبەروتی تۆیە وادەکات، گیا لەزەوی بێتە دەرێ، کەشتییەکان لە ئاودا بوەستن، شیر ناکۆتابێت و شەونم نەبڕێتەوە.**

**تۆ ژیان هەلاهەلادەکەیت تا لە هەر درزێکەوە ئاورنگ بێتە ژووریّ.**
**تۆ برینەکان پڕدەکەیت لە هەنگوین، مردن دەکەیت بە شەراب.**
**پێکەوە سەیری ئاو دەکەن، ئەم بە شەرمەوە ستایشیدەکات، بە شەرمەوە قسە لە چاوانی دەکات کە پڕە لە ڕەشەبای ورد، پڕە لە مرواری شکاو لە ژێر فشاری خۆشەویستیدا، دەڵێت : شارەکان بە بینینی تۆ دەکەونە گێژەنی تیشکەوە، ڕوناکیت وەک با گەلەک ڕۆژی ناشوفتە دەبات، تۆ ئیشدەکەیت و نازانیت تۆفان بە هەناسەی تۆوە نووساوە، دەستی تۆیە زمروت بەئاگادێنێت، زێڕ لە بێهۆشی بێداردەکاتەوە. تۆ دەبیتە زەویناسی چکۆلانەی ئەم عەردە، تۆ بە تەنیا لە کانزاکان تێدەگەیت، لە هێزی ئاو کاتێک خەمگین دەبێت، لە هێزی مەعدەنە بێشوناسەکان، هێزی نەورەسە مردووەکان کاتێک ڕۆحیان تێکەڵاوی هەوا دەکەن. تۆیت دەزانێت چەند دەریا خۆشەویستی لە دەنکە لمێکدا هەیە**

چەند ئاسمان لە ژێر زەویدا خەوتووە. چەند خۆر لە تاریکیدا هەیە و هێشتا نادرەوشێنەوە.
سەیری دەریا دەکەن، ئەو دەستدەخاتە سەر دەستی و بەشەرمەوە باس لە مردنی دەکات، لە جەنگی ئازادکردنی بەیانی لە تۆفانە ساردەکانی خۆی، جەنگی ڕزگارکردنی کێڵگە لە سونبولی وەهم. هەکتار هەکتار پاکردنەوەی خاک لە گوڵی شێت، خونچەی هار، شکۆفەی دێوانە. مردن لە جەنگی ڕزگارکردنی دێبەرەکان لە گیای بەربەری، لە شەڕێکدا لەگەڵ دڕکی نائومێدیدا. کاتێک سروشت چاوەڕوانی ئەوە دەستکاری قانونەکانی خۆی بکات. گوڵ بە نوری ئەوەوە بەنێو پایزدا دەڕوات و نامرێت، فریشتە بە ناوی ئەوەوە بە ئەهریمەندا دێت و ئاژاکێت، مۆم بە دەستی ئەوەوە دێتە ناو تۆفان و ناکوژێتەوە.
ئەم دەڵێت چاوانی تۆیە ئەورەسە وەستاوەکانی ئاسمان دەجوڵێنێت، تۆیت کە سەیردەکەیت ڕۆحی شاردراوەی ئاو لە خەو هەڵدەستێت، دەستبەرە بۆ ئەم خەراباتەی کەنار، بادەریا بتبینێت کە تۆ خۆتی دەریا. با زەوی بتبینێت، کە تۆ خۆتی زەوی.

پێکەوەڕا تەماشای دەریا دەکەن و ستایشی یەکدەکەن
دوو باڵندەن، تا ئاکۆتا ئیشیان ستایشی یەکە.

وەک دوو بادە ساقی تێکەڵیانکات، دەبن بەیەک شەراب.
وەک دوو جۆگە سارا بیانکات بەیەک، دەبن بەیەک سەراب.
وەک دوو دەرد حەکیم لەیەکیانبات، دەبن بە یەک ئازار.
وەک دوو عەشق خودا تێکەڵیانکات، دەبن بەیەک هاوار.

# ١٧

# نوێنەرێکی خەمگین

**من ئیشدەکەم، هەرکاتێک دەریا خەوت من لەجێی ئەو دەبم بە دەریا، من جێگری مانگم لەسەر زەوی، جێگری زریانم لە ڕۆژی سایەقەدا، جێگری ئاسوودەیم لە هەفتەکانی تۆفاندا. وەکیلی خۆرم کاتێک دەترسێت بێتە کوچەکەمانەوە، وەکیلی تریفەم کاتێک ڕۆحی سەرگەردانی تۆی لێوندەبێت، وەکیلی نەیزەکم کە دەترسێت کۆترێک هەموو ڕوناکی ئەو بخواتەوە، نوێنەری گوڵم کاتێک گوڵ یادیدەکات نوێنەری لەم خەراباتەدا هەبێت، نوێنەری هوشیاریم، کاتێک هۆش یادیدەکات نوێنەری لەم گەمژەئابادەدا هەبێت. من بەناوی دەردەدارەکانەوە قسەدەکەم، کاتێک بێدەنگی خۆی گەورەترین دەردە. بە ناوی باڵدارەکانەوە قسەدەکەم کاتێک فڕین خۆی هەناسەیەکی مەرگە.**

**لەبری هەموو زاناکان دەچم بۆ نەفامستان**
**بامن گەورەترین نەفام بم، گەورەترین نەفامی ئوستان.**

**گەر منتان کوشت لەسەر شەریعەتی گوڵ بمکوژن**
**گەر ئازادیشتان کردم بەڕەنگی شەپۆلەکانی دەریا ئازادمبکەن.**

**ئەگەرچی دۆستی خوداوەندەکانم بەڵام دەچم بۆ جەهەنەم، من وەکیلی بەدبەختەکانم لەوێ، وەکیلی ئەو درەختانەم کە لەبنی سەقەردا**

سەوزدەبنەوە، وەکیلی ئەو بولبولانەم خۆیان لە دۆزەخ دەسووتێن و دەنگیان لە بەهەشت گۆرانی دەڵێت. من لە مێژە بەرگریم لە عەشقی نێوان فریشتە و شەیتان کردووە. لە مێژە بەرگری لەو حەرامزادانە دەکەم کە نوتفەی ڕژاوی باغەوان لەسەر گوڵ دروستیاندەکات.

بەرگری لە ئاورنگی ڕەش دەکەم، پرشنگی بەد، شەونمی تاڵ.

لەگەڵ بێبڕواکاندا سوژدەدەبەم بۆ درەخت و پەپوولە و مانگ

بەرگری لە حەلاڵکردنی نوێژدەکەم بە مەستی

زەفەربردن لە ئیمام لە دوای بەربانگ. حەلاڵکردنی کوشتن لە سوجدەدا

حەلاڵکردنی عەشق لە رکوعدا... حەلاڵکردنی ماچ لەسەر بەرماڵ.

من وەکیلی مۆمم لەم گوزەری زوڵوماتە بەدەدا.

من وەزیری نورم لەم کۆڵانە داخراوە ڕەشەدا.

لەشەوی لەدایکبوونی گوڵدا، نوێنەری تریفە... منم.

لە پرسەی درەخت و بادا، من وەکیلی شەونمم.

## ١٨

# وەتەن و نیشی مۆسیقارێکی ماندوو

سەردەمێک من تاسەر دڵ نوقمی خۆکوشتنی گوڵ بووم. پەژمووردەگی دایکی ڕاستەقینەی من بوو، مەمکی خەزانەکانم دەمژی، شیری زەردم دەخوارد. گاگۆڵکێم ڕووەو پاییزبوو. ئاە، ئەی وەتەنی بێوەفایان، بۆ قولاپی خەزانم بۆ هەڵدەیت، من خۆم لەم تۆڕە زەردەدام.

ڕاوی ماسییەک مەکە، لە مێژە خودا ڕاویکردووە،
کۆترێکی سپی مەکوژە، لە مێژە لە خەزاندا مردووە.

ئەی هاوڕێی نۆتەکانی سوبح، ئەی دیلی ئەم کەمانە سەرسامەی لە بادا مەبهورە، من دڵم پڕبووە لە کۆتری زەرد، فلوت بۆ یەکێک دروستدەکەم خنکاوە لە عەشقدا، پیانۆ بۆ یەکێک چاکدەکەم کوژراوە لەجەنگەڵدا، هاواردەکەم: وەتەن ئەم دەفژەنەی خنکاند، وەتەن ناهێڵێت ئەم چەلۆ شکاوەی بەر زریان چاکبکەمەوە. ناهێڵێت تەنبوری فڕێدراوی ئەم خۆشەویستییە هەڵگرمەوە، وەتەنی لە زوڵوماتدا خنکاو، حەزناکات سازی خنکاوەکان لە ڕوبار دەربهێنم و بیژەنم، حەزناکات لە ڕەشەبادا بە شمشاڵەکەمەوە بەرەو خەرەندی خۆم بڕۆم. وەتەنی بەد ناهێڵێت، من لەسەر ئەم سەحنە تاریکە، لەبەردەم سەرۆکە پێشەرەفەکانیدا خۆم بکوژم، وەتەنی لە پیسیدا خنکاو، بەردەوام ئامێری شکاوی مۆسیقارە پیسەکانی خۆیم بۆ دەهێنێت و دەڵێت: بەر لە تۆفان دەنگی بولبولمان بۆ بژەنە، بەر لە قیامەت عەندەلیبمان بۆبکە بە سروود. من هاواردەکەم : وەتەن ئەم نەیژەنەی خنکاند، وەتەنی خاڵی لە نور، وەتەنی ڕزیو لە بۆنی سوڵتانەکانیدا، وەتەنی سپی وەک گەچی پەیکەری دیکتاتۆرەکان، وەتەنی ڕەش وەک بڕۆی سیحربازەکان، ئەو ناهێڵێت بۆ خەزنەی فیتنەکانی ئەو بگەڕێم، ببم بە مایستڕۆی پاییزێک بە نۆتەی زەرد گوڵلەبارانمان دەکات. وەتەنی بێنەزاکەت ناهێڵێت، بە دەسڕێژی ئەم مۆسیقایە، لەبەردەم ئەم خونچەیەدا خۆم بکوژم.

ئەی نیشتیمانی خائینان
کە من بە سەیری گوڵ دەمرم، بۆ بە بروسکە دەمکوژیت؟

وەتەن ئەو قوتووە شکاوەی پڕە لە باران و ژەنگ، وەتەن ئەو کاسە خاڵییەی پڕە لە پاشماوەی ژەهر. من هاواردەکەم: وەتەن ئەم سەنتورەی شکاند و سۆناتا ترساوەکانی کوشت. من پیانۆی گوڵم لێدەدا، میلۆدی گیام لە پێدەشتەکاندا چاکدەکرد، بەیانیانی بەهار بە کێڵگەی گەنمدا دەڕۆیشتم و سونبولە خەوتووەکانم بۆ عەشق ئامادەدەکرد، وەتەن منی لەگەڵ خونچەکاندا دەرکرد. من کە ئیقاعی بام لەگەڵ ڕۆحدا، دەنگی گەردەلولم لەگەڵ لێدانی دڵدا ڕێکدەخست.

ئەی وەتەن مەفتونی تۆم، بەڵام نامەوێت شێوەتم بیربکەوێتەوە.
وەقتی غەریبی و غوربەت، وام بە کۆتی خۆتەوە
کە خۆت پێڵاوی دوژمنان ماچدەکەی،
کێ وەکو سەگ پەتکەم و بیخەمە ژێر پێتەوە؟
غەمبارم کە دەتبینم دوژمنم وەک سەگ پەتتدەکات و دەتخاتە ژێرپێیەوە.

ئەی نیشتیمانی بێشەرەفان
کە من بە گۆرانی دەمرم، بۆ بە خەنجەر دەمکوژیت؟

# ١٩

## دزیی بولبول

هاواری تۆ ڕەنگی من دەگۆڕێت. من ڕۆژگاری خۆم لەسەر باڵی تۆ دروستدەکەم، ڕۆژی من ئەو کات دەست پێدەکات کە تۆ لەسەر گوڵ دەنیشیتەوە، کە تۆ دەڕۆیت شتێک لەگەڵ خۆتدا دەبەیت ڕوناکی نییە، بەڵکو تۆوی هەر ڕۆشناییەکە کە لەگەڵ ڕۆحدا دەڕوێت، تۆوی ئەو تیشکانەیە کە لەگەڵ خوێندا دێنەدەرێ.

تۆ خوێندت بۆیە دەستمان لە کار هەڵگرت و ڕۆیشتین بەرەو سەیرکردنی دڵی خۆمان.

چەقۆمان هەڵگرت و ڕۆیشتین بەرەو جێگایەک خۆکوشتن لە ڕۆحماندا بکوژین، پەتمان هەڵگرت و ڕۆیشتین بەرەو دارستانێک مردن بخنکێنین، بەڵام لە بری خۆکوشتن سەیرکە خۆمان کوشت، لە بری مردن، سەیرکە خۆمان بە درەختەکاندا هەڵواسی.

تێپەڕە بە سرووده قاچاغەکانتەوە، تا دەگەیتە ئەوسەری ئەم دەریایە. کە ناهێڵن باغ بخەینە گیرفانمانەوە و بە بولبولەوە بیدزین. بەحر بدزین و دڵمان ببێت بە گۆڕستانی مرواری. بێستان بدزین و ببین بە میوە فرۆشێکی شێتی سەر مەرزەکان. سرودەکانمان وەک ئەسپ ببەستینەوە و باریانکەین بە بای قاچاغ، لە شەوێکدا ناهێڵن خودا بە شەرەفەوە بدزین. تۆ گووتت ئەی بولبول: با ئێمە لێرەبین و غەریزەمان بەردەین تا بە هەشت. خوێندنی تۆ جنسی منی گۆڕی. نوتفەی پڕکردم لە منداڵی حەرام. ئێمە هاتین تۆ بدزین ئەی بولبول، تۆ ئێمەت دزی.

ئێمەت لە ڕەنجی خۆت بارکرد، ئێمەت فڕاند تا سەر لێواری مەحشەر.
فڕینی تۆ ڕۆیشتنی منی لەسەر زەمین تێکدا
باڵی تۆ منی ڕاگوێزا تا عەدەم
ئەوەتەی تۆم دیوە بە بازاڕەکاندا دەڕۆم و وەک جاران جوانیم بۆ فەرامۆشناکرێت. لە شارێکدا ناهێڵن ئاگر بدزم و بەریدەم لە مانگە کوژاوەکانی ناو سەرم، ناهێڵن بەحر بدزم تۆفانی ناو خۆم بدۆزمەوە. ئەوەتەی تۆ ئێشدەکەیت، من بە شەقامەکاندا دەڕۆم و ئەستێرە لە ناوچاوانمدا دەتەقێتەوە، دەڕۆم و ڕەنگی ڕەنجی ڕژاوی تۆ لەسەر ئەم درەختانە دەبینم کە وەک ڕەنجی ڕژاوی من لەسەر کتێبەکان بێحاسڵە. ڕەنجێک کە زایەیە وەک ڕەنجی حەکیمانی بەهار، ڕەنجی تۆ کە وەک شەپۆلی ڕەش دەچێتە دەماری منەوە، خوێندنی تۆ کە وەک مار بە کوچەی سەهۆڵاوی شەوێکدا بخلیسکێت، بەسەر دڵمدا دێتەخوار.

من سەیری ئێشی تۆدەکەم، کەوەک ڕوبارێک بە ژێر زەویدا بڕوات کەس نایبینێت. من کە سووک و سادە لە گەڵایەک دەچم لە تۆفاندا، کەس نازانێت کوڕی چ درەختێکم، پێمدەڵێن شازۆڵی ڕۆژگاری زێڕینی حەیا. منی دز، کە دزیم لە زمان و سروشت و بولبولەکان کردووە، برینم لە درەخت دزی، گوللەی ناو سەری کوژراوەکانم نایەوە بەسەری خۆمەوە، تیری سەر دڵی ئاسکەکانم گرتەوە دڵی خۆم. ڕوناکیم دزی، ڕوناکییەکی شل، کە بەبەلەمێک لە ئاڵتوون بەرەو خودا پیادەڕۆم. ئەوەتەی تۆم دیوە، بە شاردا دەڕۆم و وەک جاران غەمم بۆ فەرامۆشناکرێت. عاقڵ دەوەستم و وەک جاران شێتی خۆم بۆ فەرامۆشناکرێت. دەمەوێت تەنیا کەسێک بم لەڕەنجی تۆ تێدەگات، دێم شتێک لە تۆ فێربم و بمرم. یەکجار پێکەوە بخوێنین و دواتر من نۆتەکانی خۆم ئاشکراکەم، تۆ حەکەمی من بە ئەی بولبول، تۆ من بدە بە درەختەکان بمکوژن، یا

گیایەک بمخنکێنێ، کە لە ڕەنجی ئێمە تێگەیشتووە، یا ئاوێک بمکوژێت، کە دەزانێت چ غەدرە بمرم.

من تەنیا مسۆدەی ڕەنجی تۆ سپیدەکەمەوە.

کێ دەزانێت من و تۆ چەندە ماندووین، کاتێک عارەقی ئێمە وەک تیشکی خودایەک لە ناو کافراندا مردبێت کەس نایبینێت. تۆ دەتوانیت وەک ئیمپراتۆرێک بێئیش بژیت، بەڵام من وەک خزمەتکار ناهێڵن پشوویدەم، تۆ ماندوونابیت، بەڵام من شەلاڵم لە ڕەنجی بێهودە، عومرم زەحمەتێکی بێحاسڵە، کتێبەکانم هاوارن لە کتێبخانەیەکدا عەقڵ تیا مردووە. من وەک تۆ نیم بەباغدا بفڕم، من یەکێکم قیامەت لەیادیکردووە. بایەکم تەنیا لەسەری خۆمدا هەڵدەکەم. پیاوێکم ناکۆتا، دونیا فەرامۆشیکردووە.

## ٢٠

# ئیشی من

ئیشی من ئەوەیە دەریا تاسەر لێوی تۆ بهێنم، وابکەم لە تەمدا جوانتر ببینیت، نەهێڵم گوڵی حەوشەکەتان پیربێت، نەهێڵم باغەکەتان بگری، نەهێڵم خوا لێت زویربێت.

ئیشی من ئەوەیە نور تاسەر ڕۆحی تۆ بهێنم، وابکەم گوڵ فەرامۆشت نەکات، نەهێڵم خۆر لەماڵتدا ئاوابێت، نەهێڵم خامۆشی بگاتە میهرت، وابکەم خوا تۆی لە بیربێت.

ئیشی من ئەوەیە درندەکانی ناو رۆحت پەتکەم، فریشتە تا بەردەرگات بهێنم، نەهێڵم شەیتان بگاتە ژوورەکەت، نەهێڵم پاکیت هەڵوەرێت، وابکەم دەستت لە ئەستێرە گیربێت.

ئیشی من ئەوەیە پاسەوانی حەوشەی پڕ کۆترت بم، گوڵت بۆبکەم بەدەرمان، نەهێڵم بوکەشەشەکەت بگری، وابکەم مانگ لەلات ژیربێت.

ئیشی من ئەوەیە ئاورنگت بۆ هەڵبژێرم، ڕوناکیت بۆبکەم بە شەراب، لە شەونم شەربەتت بۆ بگرمەوە، نەهێڵم ڕق لە باڵندەت کەوێت، وابکەم خوا لات ئەسیربێت.

## ٢١

# چیرۆکی ئیشی فریشتەیەک

لە خوداکان جگە لە پاشماوەی ڕەحم چی وەردەگرێت؟
لە ئەستێرەکان جگە لە پاشماوەی نور چی دەچنێتەوە؟
ئیشی ئەو جودا نییە لە ئیشی من. دوو ئیشکەر هەردووکمان وەکو یەک لە کۆترەوە دوورین، وەکو یەک دەستی با دەگرین و دەیکەین بەرۆحماندا، ئەویش وەک من مەحکومە بەوەی سەر بدات بە قەدەردا و ناوچاوانی خۆی بریندار بکات، مەحکومە بەوەی باڵی خۆی بسوتێنێت و لە بەرزترین نهۆمی مەلەکوتەوە خۆی هەڵدات. خزمەتکاری خودا بین یان مرۆڤ. خزمەتکاری ئاسمان بین یان زەوی. هەردووک لە

**خزمەتی نورێکداین ڕۆحی ئێمە ڕۆشنناکاتەوە. هەردووکمان ڕەحمەت دەگوێزینەوە بێنەوەی ڕەحمەتمان**
**بەرکەوێت، وەک ئەوانەی باغ دەگوێزینەوە بێنەوەی هەناریان بەرکەوێت.**
**ئەو دەیتوانی لە مەلەکوتەوە بێت بۆ زەوی، من نەمدەتوانی لە زەوییەوە بڕۆم بۆ مەلەکوت.**

**ڕۆژێک ئەگەڕایەوە بۆ ئاسمان، کراسێکی لەبەرکردو ڕۆیشت بەرەو خانوویەکی دوور لە دارستانێکدا، لەوێ مۆمی زەمانێکی تری داگیرسان، دەستیکرد بە ئیشکردن لە پرۆژەی دروستکردنی ژیانێکی دیکەدا، دروستکردنی باڵێک بە فەرمانی خوداکان نەفڕێت، دروستکردنی لەشێک تەنیا بە هەوای زەوی هەناسەبدات، نیگای خۆی فێرکرد سەیری ئاسمان نەکات، دەستی خۆی فێرکرد نە پارێتەوە لە یەزدان، بە ژێر باراندا دەرۆیشت و ڕۆحی پڕدەکرد لە هەوری نەناسراو لە مەلەکوت، ئاو بۆ ئەو گرنگتربوو لە ئیمان، پرشنگ گرنگتر بوو لە هەر کتێبێکی موبارەک، لە خۆڵدا یاقووتێکی دەبینی کە چاوی مەلەکوت نشینەکان نایبینێت، ئەلف بایەکی دەنوسی کە تەنیا حەکیمە کۆنەکانی جەنگەڵ دەیانخوێندەوە. ئاشنابوو بە ڕۆحی ئەو تەیرانەی تارماییەکانیان هەمیشە بە ناو تارمایی ئەودا دەڕۆی. ئاشنابوو بە هەناسەی ئەو داربڕە خەمگینانەی مردبوون و بە تەورەکانیانەوە غوباریان لە نزیک ئەو لەتدەکرد. بەدوای زێڕدا نەگەڕا کە جوانی خوداکانی بەیادا بهێنێتەوە، جارێکی دی سەیری هیچ ئەستێرەیەکی نەکرد، هەمیشە لە ناو تەپوتۆزی درەختەکاندا زەوی بۆ گوڵێک دەگەڕا پەیوەندی بە ئاسمانەوە نەبێت، پڕبوو لە بێباکی دەرهەق بە نیشتیمانە دوورەکانی خۆی. باکی بە هیچ نامەیەک نەبوو کە لەگەڵ تیشکدا بۆی دەهات، ئەو حەرفانەی نەدەخوێندەوە کە خودا لە سەر سرووەی بەیان دەینوسی. ئەو گوڵانەی بۆن نەدەکرد کە**

لە ئاسمانەوە بە پۆستێکی سپی دەهات. درەختەکان هەمیشە وەک میوان سەیریاندەکرد، بەڵام ئیشی ئەوەبوو وابکات ئاسمانمان بیربچێتەوە، ئیشی ئەوەبوو گومان لە باران و تریقە بکەین، ئیشی ئەوەبوو نەهێڵێت مرۆڤ لەوێوە بفڕێت. ئێمەی لە دەریاکانیش دەپاراست کە بە ئاسمانەوە نوساون، دوور لە ئاسۆ، دوور لە فڕین، دوور لە هەر فیردەوسێک لە سەرەوەڕا بێت فێری ڕۆیشتنی کردین بە زەویدا.

ئەو ئەستێرانەی لا گرنگ نەبوو کە بانگهێشتی سەر سفرەی ڕۆشناییان دەکرد. دەستی ئەوانەی نەبینی کە لە ئاسمانەوە گوڵیان بۆ شۆڕدەکردەوە. نەکەوتە ئەو تۆڕانەوە کە لە مەلەکوتەوە بۆیان هەڵدەدا. نەکەوتە ئەو بۆسانەوە کە خودا لە ناو کێڵگەکاندا بۆی دادەنا.

لە زەویدا، لە ناو ئاورنگی ژەهراوی درەختە ڕەشەکاندا، لە ناو وێرانەکانی ئیمپراتۆریەتێکدا لە گوڵی ڕوخاو، بە بۆکڕوزی شکۆفەوە لە بناغەی شارەکاندا، بە بۆسۆی خونچەوە لە هەر بەردێکدا کە کرێکاران دایاندەنا، شارێکی دروستکرد دوور لە باران. شارێک مانگ بەسەریدا نەدەڕۆیشت، خۆرمان لێوە نەبینی، کەشتی سەندەبادەکانی ئاسمان لەوێوە تێنەدەپەڕین. لە بری ئاسمان هاوارێکی دوورمان دەبیست، دەیگووت : ئەی ئەوەی دەتەوێت ئازادبێت، دەست لە جوانی بەردە.

لە تاریکی ئازادییدا، ڕۆژمان لە ناو ئاورنگی ڕەشدا بەسەربرد. ئیشی ئەو ئەوەبوو لە زوڵوماتدا ئارەزووی یاریکردن بەرنەدەین، فێری ئەوەی کردین لە شەودا چۆن تیر بهاوین و نێچیریش لە دەست نەدەین، فێری گەڕانی کردین بەبێ چرا بە دوای هەڵاڵەدا، فێری دۆزینەوەی حەقیقەتی کردین بەبێ چاو، فێری پەڕینەوەی کردین لە بەحری تاریکی بەبێ سڵاو لە ئاو.

بەڵام چ شارێک هەیە بێ ڕوناکی بژی؟
چ زەوییەک هەیە، بتوانیت خاڵیکەیتەوە لە خودا؟
چ نورێک هەیە، بتوانیت تا ئەبەد دەریکەیت لە زەوی؟

هەندێک شەو ترس وەک پیاوێکی خەمگین دەهات بۆ لای، هەندێک شەو سێبەرەکانی خۆی وندەکرد، هەندێک شەو پیرێتی خۆی لە پێچاوپێچەکانی باغدا ڕاودەنا. ئیشی ئەوەبوو ئاوەدانییەک دروستبکات... ئازاد، بەڵام گوڵەکان بوون بە کۆیلەی ئەو، کە شەوێک سندوقی جەواهیرەکانی کردەوە، سەری خەزنەی ئومێدەکانی لادا، ڕەحمەتی تیانەبوو. پێیگووتین : من ناتوانم جوانیتان لە یادبەرمەوە، ناتوانم وابکەم وەک خودا، خەم فەرامۆشکەن، سەدە لە دوای سەدە دیلبن و بەختیاربن، قەڕن لە دوای قەڕن کۆیلەبن و شادبن.

ڕۆژگارێک هات هەمووشتێ ڕوخا. کوچەی شارەکانی ئەو پڕبوو لە باڵندەی سەیر، نەسلێک لە مەخلوقات کە دڵیان هەبوو لە تریفە. نەسلێک لە باڵندە دەنوکیان لە زێڕی هەتاو، نەسلێک لە پەپوولە ڕۆحیان لە گەردی هەور، باڵیان لە نوری ئاو. لە شارەکانی ئەودا جوگرافیایەکی تر نوسرا، نەخشەیەکی دی هات، پڕبوو لە ئاسمان و دەریا. ڕۆژێک هات بە باڵە پیرەکانی فڕی، بۆ شوێنێک لە نێوان خاک و هەوادا، چووە کوچەیەکەوە لە نابەین هێمنی و زریاندا . چووە شەقامێکەوە لە نێوان سایەقەو باراندا.

تێپەڕینی ئەو سەفەربوو تا عەردی بێ دونیا
بۆ خاکێ فریشتەی تیا ناگات بە خودا.

دوای ئەو شەوێک یەزدان گووتی:
من دەرمانم نییە، بەڵام پاداشتی نیشی ئێوە، سەیرکردنی تاڤگە سیحراوییەکانە. پاداشتی ماندووبوونتان سەیرکردنی تەیرێکە کە جارجار درەختتان وەیادادەهێنێتەوە، من دەرمانم نییە، بەڵام دەتوانم وابکەم لە خەمدا دێوانە نەبن. دەرمانم نییە بەڵام قومێک زیندەگیم هەیە، قومێک سەبوریم پێیە، دڵۆپێک دڵنیایی بیکەنە شەرابەکانتانەوە، من وەهمم پێیە باشتر لە حەقیقەت، ئاسمانی خەیاڵی باشتر لە زەوی، مردنی سەوز فووڵتر لە سپێتی زیندەگی. من خودام، بەڵام خوداش مەحکومە بە ئیش لە دارستانەکانی فیردەوسدا، خوداش مەحکومە بە خودایی، خوداش ناچارە بەسەبر، خوداش مەحکومە بە عەشق، خوداش مەحکومە بە تەنهایی.

## ٢٢

# یادی شەقامێکی منداڵی

شۆستە زێرینەکانی تۆ ، ڕۆژێک جوانترین ماڵی ئێمەبوون
دیواری بەر کۆشکەکانی تۆ، شوێنی سپی یادگارکانمان بوو
هەر کاتێک بمانویستبایە یار بگرین
بە زەردەخەنەی عەشقەوە دەهاتینە سەر ڕێگا ساردەکانی تۆ
هەر کاتێک بمانویستبایە شەڕبکەین
بە چەقۆوە دەهاتینە ژێر چرا خەمگینەکانی تۆ
بەدەستکێشەوە لە نابەینی دوکانەکانی تۆدا، پەپوولەی خوداییمان دەگرت

بە ئاهەوە لەسەر کوچەکانی تۆدا، دەستمان بۆ ئەستێرە دەبرد.

کە تۆ دەبوویت بە سەهۆڵی سپی، ئێمە ئاگرمان دەهێنا.
کە تۆ دەبوویت بە بەهار، ئێمە دەبووینە دێوانە
لەسەر ئەو شۆستە ڕەقانە لالەمان سەوزدەکرد، ئەسرینمان دەڕواند، هێرۆمان دەچێنا.
ئەی شەقامی منداڵی من، تۆ لە کوێیت؟
بۆ وەکو ئیمانێکی کۆن کە لە گۆڕی جەنگاوەرانەوە هەستێ زیندوونابیتەوە
ئێشی تۆ ئەوەیە، لەسەر پێخەفی مردن کۆمەک بە ڕۆحمان بکەیت
بۆ وەکو مردویەک میهرمان پێبکەیت، لەم وێنەیەوە هەڵناسیت
بۆ نایەیتەدەر لە خەیاڵ، بۆ نایەیتەدەر لە وەهم، بۆ هەڵنایەیت لە یادگار
تاکەی لە ویژدانماندا وەک شەقامی پڕ خەون و ئەفسانە بۆ دوور دەڕۆیت.
تاکەی دەڕۆی بۆ دەریا و ئێمە نابەیت
بۆ بە سەراب دەگەیت و بە من ناگەیت؟

ئێشی تۆ ئەوەیە باڵدارە خەیاڵییەکانی خۆت بەردەی
ئێشی تۆ ئەوەیە سەرکەویت بە پیریماندا، نائومێدیمان لاببەیت، غەریبیمان لێدەرکەی
ئەی شۆستە زێرینە دوورەکان
شەوێک جوانترین لانکەی ئێمە بوویت. ئێستا وەک یەکێ بە پەتێکی باریکدا، بەزاری بورکاندا سەرکەوێت. ئێستا وەک یەکێ لەدوا هەناسەی دوا نمایشدا، دوا ڕستە بڵێت، دوا دیمەن دەرکەوێت. بە کوچەی پیریدا سەردەکەوین و بەیانی لێرەنین. ئێشی تۆ ئەوەیە، باڵندە ببەخشی،

گەڵامان پێبدەیت تا هەبین. دەمرین و بە یادی شادیتدا ناگەین، بەڵام دەزانین، بەبێ تۆ هیچ نین، بەبێ تۆ نارۆین، بەبێ تۆ ناگەین.

## ٢٣

# ئیشی پیاوێک

**کە بە خوێن دونیا دەنوسێت**

تۆ ئەی دۆست، وەک من لەم تەمە ساردانەدا خودا شمشێرێکی نەداوە لە سینەت لەودیوەوە ڕوناکی بێتەدەرێ، خودا نەشتەرێکی نەداوە لە دڵت لەودیوەوە خەم بێتەدەرێ. وەک من لە ژێربارانـدا ڕوناکیت لە پیاڵەی ڕەشدا نەخواردۆتەوە، شەرابت تێکەڵی پشکۆی دڵ نەکردووە و هەڵێدەیت، وەک من نەترساوی، وەک من بروسکە نەیداوە بە ڕۆحتاو لەودیوەوە هاوار بێتەدەرێ.

بە خوێنەوە بە شەقامێکی دووردا دەڕۆم، خوێنی من ئیمزای منە لەسەر ئەم درەختانە کە دەگەڕێن یەکێک میوەکانیان بخوات، وەک کچێک بگەڕێت یەکێک لە تاریکیدا میوەکانی بخوات. خوێنی من کە مەرەکەبی منە بۆ نوسینەوەی ڕۆحی خۆم لەسەر دەریا، نوسینەوەی ئارامی خۆم بەر لە مردن ، نوسینەوەی دەرمانی خۆم بەر لە دەرد.

من بە خوێن تینوێتی ئەوانە دەنوسم کە گەڕویان لەوسەری هاوارەوە هاتۆتەوە. وەک مەلێک لەوسەری ڕەشەباوە هاتبێت، من لەوسەری

**خەلیقەتەوە دێم و خوێن لەهاوارم دێتەخوارێ. من هیچ نیم جگە لە دەفتەردارێک کە بە خوێنی خۆی ژیان دەنوسێتەوە. بە خوێنی خۆی باغچە دەدۆزێتەوە، بەخوێنی خۆی تۆ دەخوێنێتەوە.**

**ئەی ئەوەی بەدەرختەکانەوە بەستراوی و تاقیامەت ئیش لە خونچەدا دەکەیت، ئەی ئەوەی ئیش باریوە بەسەر دەستتدا، ئێمە سەرەنجام پارچە شوشەین لە مەخلوقێکی شکاو. من بە خوێن ڕێگای ئەو مەخلوقە دەنوسم، بە خوێن کۆیدەکەمەوە، بە خوێن دەیکەمەوە بەیەک.**

**تۆ وەک من خودا تیری تێنەگرتوویت، لەودیوەوە خەزان لە برینت وەک تۆفان بێتەدەر.**
**تۆ وەک من خودا ئەستێرەی تێنەگرتوویت، لەودیوەوە تاریکی لە ڕۆحتا وەکو ئاو بێتەدەر.**

**من ئیشدەکەم**
**کاتێک ژیان سەرکەوتنە بەسەر پەیژەیەکدا لە غوبار، بەرزبوونەوەیە بۆ بورجێک بەپلیکانەیەکدا لە تۆز. من کە بە خوێن خۆشەویستیدەکەم، خودا پەیامێکم تێدەگرێت، لەودیوەوە عەشق وەک لافاو دێتەدەر، خودا دەردێکم تێدەگرێت، لەودیوەوە هاوار وەک خوێناو دێتەدەر.**

**٢٠٠٢**

سەرەنج:

١. ئـەم دیوانــە لــە پــاڵ کـۆی بەرهـەمـە شـیعرییەکاندا کـە بەرهـەمـی ساڵانی ١٩٨٣ تا ١٩٩٨ی لە خۆگرتبوو هـەر یەک لـە دیوانی بۆهیمی و ئەسـتێرەکان و ئیشـکردن لـە دارسـتانەکانی فیردەوسـدای لـە خـۆ گرتـووە. ئەگـەر ئـەو چاپـە قاچاخانـەی بـۆ ئـەم بەرهـەمانـە کـراون فەرامۆشـبکەین و نەیانخەینـە حیسـابەوە ، ئـەوا ئـەم بەرهـەمـە چاپـی دووەمـی ئـەو بەرهـەمانـەی سـەرەوەیە.

٢. لـە قەسـیدەی «شـار»دا هـەردوو دێـڕی: «لـە قەیفـەی بەیانییەکـی زیوینـی تـۆ، برینەکانـی سـەر دڵـم ببەسـتم/ لـە شـیفۆنی دەریایەکـی شینی تۆ، قوماشـی کراسێکی نوێ ببڕم» دەسـتکاری و دارشـتنەوەی دێـڕە شـیعرێکی (مایکۆفسـکی)ن.

٣. لـە قەسـیدەی «ئـای لـەو ڕۆژگارە خۆشـانە»دا دوو دێـڕی «تـا ئـەم زۆنگاوە ڕۆژهەڵاتیانـە جێبهێڵـم» پێچەوانەکردنـەوەی دێڕێکـی (ڕامبۆ) یـە دەربـارەی هەڵهاتن لـە زۆنگاوەکانـی خۆرئـاوا

٤. لـە «ئـای لـەو ڕۆژگارە خۆشـانە»دا دێڕی «نیگام پڕبوو لـە شـاری نـەدۆزراوە» دێڕە شـیعرێکی (شـێرکۆ بێکەس)ـە، بەمجـۆرە، «بێشـەی چڕی ڕوانینـی مـن، شـاری نـەدۆزراوەی تیایـە».

## کتێبە چاپکراوەکانی ئەندێشە

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|
| ١. بنەڕەتەکانی فەلسەفە | د. حەمید عەزیز | |
| ٢. کورد لەدیدی ڕۆژهەڵاتناسەکانەوە | د. فەرهاد پیربال | |
| ٣. ڕێبازە ئەدەبییەکان | د. فەرهاد پیربال | |
| ٤. نەتەوەی زێرابەکان | جەبار جەمال غەریب | |
| ٥. ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی | د. جەعفەر عەلی | |
| ٦. سۆفیزم و کاریگەری لەسەر بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی... | د. جەعفەر عەلی | |
| ٧. مەحوی لەنێوان زاهیرییەت و باتینییەت و ... | د. ئەحمەدی مەلا | |
| ٨. نهێنییەکانی ژیان | ئۆشۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٩. کورتیلەیەک لە مێژووی کات | ستیڤن هۆوکینگ | حوسەین حوسەینی |
| | لیۆنارد ملۆدیتۆ | د. هیوا عومەر |
| ١٠. کۆشک | فرانتس کافکا | عەتا نەهایی |
| ١١. فەصلول مەقال | ئیبن ڕوشد | مەریوان عەبدول |
| ١٢. شۆڕشی ئەیلوول لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئەمریکادا | وریا ڕەحمانی | |

١٣. دەسەڵات و جیاوازی    مەریوان وریا قانیع
١٤. لە چ ئێستایەکدا دەژین    مەریوان وریا قانیع
١٥. شوناس و ئاڵۆزی    مەریوان وریا قانیع
١٦. دین و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٧. سیاسەت و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٨. کتێب و دونیا    مەریوان وریا قانیع
١٩. دواهەمین هەناری دونیا    بەختیار عەلی
٢٠. ئێوارەی پەروانە    بەختیار عەلی
٢١. جەمشید خانی مامم    بەختیار عەلی
٢٢. مەرگی تاقانەی دووەم    بەختیار عەلی
٢٣. کەشتی فریشتەکان (١)    بەختیار عەلی
٢٤. کەشتی فریشتەکان (٢)    بەختیار عەلی
٢٥.شاری موسیقارە سپییەکان    بەختیار عەلی
٢٦. سێوی سێهەم    بەختیار عەلی
٢٧. لە دیارەوە بۆ نادیار    بەختیار عەلی
٢٨. وەک باڵندەی ناو
جەنگەڵە ترسناکەکان    بەختیار عەلی
٢٩. چێژی مەرگدۆستی    بەختیار عەلی
٣٠. ئەی بەندەری دۆست،
ئەی کەشتی دوژمن    بەختیار عەلی
٣١. مەعریفە و ئیمان    بەختیار عەلی
هێمن قەرەداخی
٣٢. دۆزی کورد لە بازنەی
پەیوەندییەکانی ئەمریکاو...    گۆران ئیبراهیم صاڵح
٣٣. سەمەرقەند (چ٢)    ئەمین مەعلوف    د. ئەحمەدی مەلا

| | | |
|---|---|---|
| ٣٤. ویستگەیەک لە گەشتێکی فەلسەفی | فاروق ڕەفیق | |
| ٣٥. ئەخلاقناسی | تەحسین حەمە غریب | |
| ٣٦. گەشەسەندنی ڕامیاری... | د. ک. پێسچانی | د. ئارام عەلی |
| ٣٧. مێژووی کۆنی کورد (چ٢) | د. جەمال ڕەشید | |
| | د. فەوزیە ڕەشید | ملکۆ کەلاری |
| ٣٨. منداڵانی گەڕەک | هیوا قادر | |
| ٣٩. مرۆڤی یاخی | ئەلبێر کامۆ | ئازاد بەرزنجی |
| ٤٠. پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێم و دەوڵەتانی... | هێرش جەوهەر مەجید | |
| ٤١. مێژووی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی... (چ٢) | فریشتە نورائی | هەورامان فەریق کەریم |
| ٤٢. سلێمانی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٥٨) | توانا ڕەشید کەریم | |
| ٤٣. شاری سلێمانی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨-١٧ی تەموزی ١٩٦٨) | هەوراز جەوهەر مەجید | |
| ٤٤. کتێبی پەراوێزنووسان | عەتا محەمەد | |
| ٤٥. فیکر و دونیا (بەرگی ١) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٦. فیکر و دونیا (بەرگی ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٧. دین و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٨. کتێب و دونیا (چ٢) | مەریوان وریا قانیع | |
| ٤٩. کۆمەڵگەی ڕەش | د. عادل باخەوان | |
| ٥٠. زستانێکی درێژ | کولم تویبێن | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥١. فرانسیسکۆس قەدیسی من | نیکۆس کازانتزاکیس | دلاوەر قەرەداغی |
| ٥٢. ئاهەنگی تەگەکە | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەلیل کاکەوەیس |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٣. شەوی لیشبۆنە | ئێریش ماریا ڕیمارک | کەریم پەڕەنگ |
| ٥٤. من و ئەو | ئەلبێرتۆ مۆرافیا | کارزان عەلی |
| ٥٥. میرنامە | جان دۆست | سەباح ئیسماعیل |
| ٥٦. ڕوخسارە بەندکراوەکەم | لەتیفە | ڕووناک شوانی |
| ٥٧. قەپێلک | مستەفا خەلیفە | هەورامان وریا قانع |
| ٥٨. خەونی پیاوە ئێرانییەکان کەوتنی بۆرە قەلا | ماردین ئیبراهیم | |
| ٥٩. گرگن | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٠. ١٩٨٤ | جۆرج ئۆروێل | حەکیم کاکەوەیس |
| ٦١. سوور و ڕەش | ستاندالْ | سیامەند شاسواری |
| ٦٢. دەستنووسە دۆزراوەکەی ئەکرا | پاولۆکۆیلۆ | سیروان مەحمود |
| ٦٣. جادەی مێخەک (١) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٤. جادەی مێخەک (٢) | دلاوەر قەرەداغی | |
| ٦٥. ئێوارستان | پێر لاگەرکڤیست | خەبات عارف |
| ٦٦. دارستانی نەرویجی | هاروکی موراکامی | تارا شێخ عوسمان |
| ٦٧. ئێوارەی پەروانە (چ٦) | بەختیار عەلی | |
| ٦٨. شاری مۆسیقارە سپییەکان (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٦٩. مەرگی تاقانەی دووەم (چ ٥) | بەختیار عەلی | |
| ٧٠. کۆشکی باڵندە غەمگینەکان (چ٢) | بەختیار عەلی | |
| ٧١. تا ماتەمی گوڵ... تا خوێنی فریشتە (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٢. سێوی سێهەم (چ٣) | بەختیار عەلی | |
| ٧٣. ئاورەکەی ئۆرفیۆس | بەختیار عەلی | |
| ٧٤. غەزەلنوس و باغەکانی خەیاڵ (چ٢) | بەختیار عەلی | |

